10

مەوسووعەی بەرەو باشتر پێگەیشتن و تێگەیشتن

عەلی باپیر



# چوار بابەتی سیاسی گرنگ و هەستیار لە بەر تیشکی وەحی و عەقڵ دا





2021-1442



**چوار بابەتی سیاسیی گرنگ و هەستیار لەبەر تیشکی وەحیی و عەقڵ دا**

**نووسین: عەلی باپیر**




چاپی یەکەم ١٤٤٢ك - ٢٠٢١ز



**نوسینگەی تەفسیر**

بۆ بڵاوکردنەوە

هەولێر- شەقامی 30 مەتری تەنیشت منارەی چۆلی

+964 750 818 08 66

www.al-tafseer.com

tafseeroffice@yahoo.com

/TafseerOffice

ئامادەکردنی پێڕست - نوسینگەی تەفسیر

عـــەلی بـــاپیر (نووسەر)

چوار بابەتی سیایی گرنگ و هەستیار لەبەر تیشکی وەحیی و عەقڵ دا

٣٣٣ لاپـــەڕە

١٤ * ٢١ سـم

بابـەت : ئایینی

ISBN : 978-99-22-632-11-7

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان - هەرێمی کوردستان

ژمارە سپاردنی (٢١٩) ی ساڵی ٢٠٢٠ پێدراوە


"بیروبۆچونی ئەم کتێبە، مەرج نیە هەمان بیرو بۆچونی نوسینگەی تەفسیر بێ"


**خـەتی بـەرگ :** نـــەوزاد کۆیــی

**دیزاینی ناوەوە :** زەردەشت کاوانی

مەوسووعەی

# بەرەو باشتر تێگەیشتن و پێگەیشتن

- کتێبی ١٠ -

# چوار بابەتی سیاسی گرنگ و هەستیار لە بەرتیشکی وەحیی و عەقڵدا

نووسینی

عەلی باپیر

www.alibapir.com

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسۡتَقِيمٗا فَٱتَّبِعُوهُۖ وَلَا تَتَّبِعُواْ
ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمۡ عَن سَبِيلِهِۦۚ ذَٰلِكُمۡ وَصَّىٰكُم
بِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ﴾ الأنعام.

## پێشکەش بێ

بەهەموو ئەوانەی دڵسۆزانە و هۆشیارانە و بوێرانە کاردەکەن، لە پێناوی بەختەوەرکردنی کۆمەڵگایەکەیان لە دنیاو، سەرفرازکردنی لە ڕۆژی دوایی دا، بەهۆی چاکتر لێتێگەیشتن و باشتر پێوەپابەند بوونی شەریعەتی بێ هەڵە و پەڵەی خوای کارزان و، زیاتر پێکەوە ئاوێتە بوونی دین و ژینیانەوە.

# پێشـەکی و ڕێخۆشکردن

إنَّ الْحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ، وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا، وَمِنْ سَيئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَن يَهْده اللهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَن لاَ إِلَهَ إِلاّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ١٠٢ ﴾آل عمران.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ١ ﴾النساء.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ٧١ ﴾الأحزاب.

أَمَّـــا بَعْـــدُ:

فَإِنَّ أَصْدَقَ الحَدِيثِ كَلاَمُ الله، وَخَيْرَ الْهَدِي هَدْيُ مُحَمَّد صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَشَرَّ الأُمُورِ مُحْدَثاتُها، وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَة، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلاَلَةٌ، وَكُلَّ ضَلاَلَةٍ فِي النَّار.

خوێنەرانی بەڕێز!

ئەم کتێبەی بەردەستتان کە بریتیە لە کتێبی دەیەم (١٠)ی مەوسووعەی: [بەرەو باشتر تێگەیشتن و پێگەیشتن] چوار بابەتی سیاسی گرنگ و هەستیاری تێدا توێژراونەوە، کە هەر کامێکیان دەکەینە بەشێکی سەربەخۆ، بەم ناوونیشانانە:

١- هاوپەیمانێتیی.

٢- بەشدارییکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەمان دا.

٣- بەشدارییکردن لە حکوومەت دا.

٤- گرنگی ڕەوشت لە سیاسەت دا.

ئاشکراشە کە هەرکام لەو چوار بابەتە سیاسییە - هەرکامیان بەرێژەیەکی تایبەت - ڕاجیایی و مشت و مڕیان لەسەر هەیە، بەتایبەت دووەم و سێیەمیان کە دوو بابەتی هاوچەرخن و، پێشتر بەو شێوەو فۆڕمەی ئێستامان بوونیان نەبووە.

شایانی باسیشە کە بابەتی یەکەمیان: [هاوپەیمانێتی (تحالف)] نووسینێکی تازەیە.

بەڵام هەرکام لە بابەتی: [بەشدارییکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەمان دا] و، [بەشدارییکردن لە حکوومەت دا] بریتین لە دوو ئاڵقە (چاوپێکەوتن) لە کەناڵی ئاسمانیی پەیام، بەناوونیشانی: (سەرنج)، واتە: هەردووك بابەتەکە، کۆی چوار ئاڵقە چاوپێکەوتنن، کە کاتی خۆیشی لە کتێبی: [چەند بابەتێکی سیاسیی هاوچەرخ لەبەر ڕۆشنایی عەقڵ و وەحیی دا] بڵاوکرانەوە.

بابەتی چوارەمیشیان [گرنگیی ڕەوشت لە سیاسەت دا] کۆی دوو وتارە کە لە خولێك دا پێشکەش کراون و، بەجیاش سێ جاران چاپ و بڵاوکراوەتەوە، بەڵام بەپێویستمان زانی بیکەینە بەشی چوارەمی ئەم کتێبەش.

پێویستە ئەوەش بڵێین: کە ئامانج و سوڕگەی گشتی ئەم کتێبە، بەهەر چوار بابەت و بەشەکەیەوە، بریتیە لە تیشك خستنە سەر: [مامەڵەی ڕاست و دروستی سیاسییانە، لەگەڵ کۆمەڵگاو واقیعی سیاسیی دا].

ئنجا هەرچەندە هەوڵم داوە، کە هەرکام لەو بابەتانە لە مەحەکی عەقڵ وشەرع بدەم و، بەپوختیی و گوشراویی، ئەوەی بەرێك و ڕاست و بێ گرێ و گۆڵی دەزانم، لەبارەیەوە بیلێم، بەڵام بێگومان ناڵێم: هەرچی پێویست بووە بگوترێ، لەبارەی هەرکامیانەوە، توانیومە بیخەمە دوو توێی ئەم کتێبەوە، چونکە هەرکام لەو بابەتانە، هەڵدەگرێ کتێب و لێکۆڵینەوەی سەربەخۆو تایبەتیی لەبارەوە بنووسرێ، بەڵام وەك گوتراوە: (مالایدرك کُلُّهُ لایترك بَعْضُهُ) ئەوەی هەموویشی جێبەجێ ناکرێ، واز لەهەندێکیشی ناهێنرێ.

هیواداریشم ئەم برە توێژینەوە پوخت و گوشراوە، بەتەواویی نیشانەی خۆی بپێکێ و، بەرچاوی تەماویی، گەلێك کەس ڕۆشن بکاتەوە، سەبارەت بەهەڵوێستی ڕاست و ڕێك و شەرعییانەو ژیرانە، لەبەرانبەر هەرکام لەو چوار بابەتە هەستیارو گرنگەدا، کە وەك پێشتر ئاماژەم پێدا، لەم ڕۆژگارەدا چ لە کۆمەڵگای خۆمان و، چ لە سەرجەم کۆمەڵگایەکانی دیکەی مسوڵمانانیدا، قسەو باس و بگرەو بەردەیزۆریان، لەبارەوە دەکرێ و، گەلێك جاران بەو هۆیەشەوە، مسوڵمانان و تەوژمی ئیسلامیی، دووچاری کێشە و گرفت و دووبەرەکیی بوون!

هەڵبەتە کێشمەکێش کردن و شەڕەقسە و بگرە و بەردەی مسوڵمانانیش، لەوبابەت و مەسەلانەدا، کە وەحیی نوختەی تێدا نەخستوونە سەرپێت و، جێگای ئیجتهاد و ڕاجیاییان تێدایە، بە تایبەت لەبواری حوکم و سیاسەتدا، کەبابەتێکی هەرەگرنگ و زیندووی بواری هەڵس و کەوت و عادەتەکان (المعاملات والعادات)ە، کە بناغە تێیاندا ڕەوایی (إباحة) ودەستکراوەییە، شتێکی ئاسایی و چاوەڕوانکراوە، بەڵام ئەوەی کە نائاسایی و نەگونجاوە و، لە مسوڵمانان ناوەشێتەوە، ئەوەیە کە کێشە و تێکگیران و مشت ومڕەکانیان، نەگێڕنەوە بۆتەرازووی شەریعەت، کە لە عەقڵی سەلیم و وەحیی ڕاستدا، خۆی دەنوێنێ، لە حاڵێکدا کە خوای زانا شارەزا بەوە فەرمانی پێکردوون، وەك فەرموویەتی:

﴿ وَمَا ٱخۡتَلَفۡتُمۡ فِيهِ مِن شَيۡءٖ فَحُكۡمُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبِّي عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُ وَإِلَيۡهِ أُنِيبُ ١٠ ﴾ الشورى

واتە: لە هەرشتێکدا کەوتنە ڕاجیاییەوە، دادوەریی تێداکردنی بۆلای خوایە، ئائەو خوایەتان پەروەردگارمە، پشت هەر بەو دەبەستم و، تەنیا بۆلای ویش دەگەڕێمەوە.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿ ... فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلًا ٥٩ ﴾النساء

واتە: ... هەرکات لەشتێکدا کەوتنە ناکۆکییەوە، بیگێڕنەوە لای خواو پێغەمبەر، ئەگەر بڕواتان بەخواو ڕۆژی دوایی هێناوە، ئەوە باشترە و سەرەنجامیشی چاکترە.

خواش بەبەزەیی و کەرەمی بێ سنووری خۆی یارمەتیی و هیدایەتی هەمووڵایەکمان بدات، کە بەبێ بەرچاوڕوونیی هەنگاو نەنێین و، هەرکات کەوتینە ڕاجیایی و کێشە و مشت و مڕیشەوە، گەڕانەوەمان بۆلای قورئان و سوننەت و، کێشان و هەڵسەنگاندنی ڕاجیاییەکانمان بەتەرازووی شەریعەت، لەسەرشان سووك و ئاسان بێ و، پاشان دەست هەڵگرتنیشمان لەو قەناعەت و بیروڕایانەی، کە بۆمان دەردەکەوێ هەڵەن، پێ وەك ئاو خواردنەوە وابێ، چونکە بێگومان دان بەهەڵەی خۆدا هێنان، چاکەیە (الإعتراف بالخطأ فضيلة)و دان بەهەڵەدا هێنان و، زوو دەستبەردار بوونی، باج و مەسرەفی یەکجار کەمە!

دیارە هەرچی لەم کتێبەو سەرجەم کتێب و بەرهەمەکانی دیکەشمدا گوتوومە و دەیڵێم، جگە لەو شتانەی کە ڕاستە مانای ئایەت و فەرموودەکانی پێغەمبەرن (صلى الله عليه وسلم)، بریتیە لە بۆچوون و تێگەیشتنی بەندە و، ئێستا بەڕاست و دروستیان دەزانم، یان بەڕاستتریان دەزانم و، سوپاسی هەر بەڕێزێك دەکەم کە بەبەڵگە بۆم بسەلمێنێ: بەهەڵەدا چووم، خوا پشتیوان بێ بەسینگ فراوانیی و ئاسانییەوە، لێی وەردەگرم و عەقڵ و، زانیاریی خۆمیان پێ دەوڵەمەندو بەهرەمەند دەکەم.

سبحانك اللهم وبحمدك، أشهدأن لاالله إلاّ أنت، أستغفرك وأتوب اليك

**٢١ / ڕەجەب /١٤٤١ك**

**٢٠٢٠/٣/١٦ ز**

# دەستپێك

بەڕێـــزان!

بابەتی هاوپەیمانێتی بەستن - كە لە بنەڕەتدا شتێكی ڕەواو ڕێ پێدراوە - بابەتێكی یەكجار گرنگ و هەستیارە و دەگونجێ دەرهاویشتەو دەرەنجامی جۆراوجۆری لێ بكەونەوە، بە هەردووك باری چاك و خراپداو، بەگوێرەی تێدا پێكان و نەپێكان، بۆیە پێویستە سەركردەو مشوورخۆران، زۆر بەوریایی و هۆشیارییەوە، هەنگاوی تێدا هەڵێنن و، هەتا دەتوانن ڕاوێژی تێدا بكەن و، ئەوپەڕی وردبینیی و دووربینیی تێدا بەكاربێنن، ئەوە لەلایەك و، لەلایەكی دیكەشەوە: لەسۆنگەی ئەوەوە كە ئەو بابەتە ئاستێكی بەرزی هۆشیاریی سیاسیی و، ئاسۆیەكی فراوانی فیكریی پێویستە، ئەگەر بێت و سەركردەو مشوورخۆرەكان، زەمینە سازییەكی باشی فیكریی و پەروەردەیی، لەنێو ئەندام و دۆست و لایەنگراندا، بۆ نەكەن، ڕەنگە ڕووبەڕووی گلەیی و گازندەو ڕەخنەی زۆر ببنەوەو، بگرە سەریش بكێشێ بۆ لێك ترازان و پەرتەوازەییش! دیارە هەركام لە ڕێككەوتن (صلح)ی حودەیبییەی[1] سەردەمی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، و ڕێككەوتنی دوای شەڕی (صفِّين)ی[2] ڕۆژگاری عەلی كوڕی ئەبوو طالیب خوا لێی ڕازی بێ، كە شۆرەتی (تحكيم)ی وەرگرتوە، چاكترین بەڵگەو نموونەن لەوبارەوە!

---

(١) بڕوانە: (السيرة النبوية لابن هشام)، ج٣، ص(١٦٢-١٧٦).

(٢) بڕوانە: (سيرة أمير المؤمنين: علي بن أبي طالب)، ص(٤٦٠-٤٨٧)، الدكتور علي محمد الصلابي.

چونكە لەئاكامی هەركام لەو دوو ڕێككەوتن و پێكهاتنەدا، لە هی یەكەمیاندا، زۆربەی خەڵكەكەو، لەهی دووەمیاندا ژمارەیەك نارازیی بوون و ڕەخنەیان گرت و، ئەو پێكهاتن و پەیمانبەستنەیان، لەگەڵ لایەنی بەرانبەردا پێ قبووڵ نەكرا، بەڵام لەسوڵحی حودەیبییەدا، بە حیكمەت و لێزانیی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەلایەك و، گوێڕایەڵیی و متمانەی خەڵكەكە بەرانبەر بە پێغەمبەر، لەلایەكی دیكەوە، كێشەو گرفتی بەرەی ڕەخنەگرو نارازیی (جبهة المعارضة) بەبێ سەرئێشەو دەرهاویشتەیەكی خراپ، چارەسەر بوو.

كەچیی لە صوڵحی تەحكیمدا، ئەو كێشەو گرفتە چارەسەر نەكراو، سەرەنجامیش دەرهاویشتەی یەكجار خراپی لێكەوتنەوە، كە خراپترینیان لێك ترازانی ڕیزەكانی سوپای خەلیفەی چوارەمی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) عەلی كوڕی ئەبوو طالیب و، پاشان شەهیدكرانی خۆیشی بوو، بەدەستی یەكێك لەو ڕەخنەگرو نارازییە كەللە ئێشك و ناحاڵییانە، كە (عبدالرحمن بن ملجم) بوو!

خوای بەبەزەیی و بەخشەر بەلوتف و كەرەمی بێ سنووری خۆی، هیدایەتی زیاتری هەموو لایەكمان بدات، بەجۆرێك كە هەرچییەك خێرو بەرژەوەندیی خەڵك و كۆمەڵگامانی تێدایە، لەهەر قۆناغ و هەل و مەرجێكدا، بتوانین لێزانانەو بوێرانەو وردبینانەو دووربینانە، بڕیاری لەسەر بدەین و هەنگاوی بۆ بنێین و، هێندەش ڕاوێژ پێكردنی خەڵكەكەمان و، بەرچاو ڕوونكرنەوەو ئیقناع كردنیان، ڕەچاو بكەین، كە ڕێ نەدەین هیچكەسمان لێ بڕەنجێ، یان بەجێ بمێنێ.

## پێشەکی

بەڕێـــزان!

ئەم بابەتەی بەردەستتان کە بەشی یەکەمی ئەم کتێبەیە، لێکۆڵینەوەیەکی کورت و گوشراوە، لەبارەی پرسێکی زۆر هەستیارو گرنگەوە کە پرسی: هاوپەیمانێتیی (تحالف) و ڕێککەوتن (إتفاقیة)ە، لەنێوان لایەنێك یان زیاتری مسوڵمان یان ئیسلامیی، لەگەڵ لایەنێك یان زیاتری نامسوڵمان یان نا ئیسلامیی دا، چ لە حاڵەتی دەستڕۆیشتوویی و هەبوونی قەوارەی سیاسیی دا، چ لە حاڵەتی نەبوونی قەوارەی سیاسیی دا.

کۆی بابەتەکەش، لەسێ باسی سەرەکیی پێکهاتوە:

19

**باسی یەکەم:** پێناسەی هاوپەیمانێتیی (التحالف).

**باسی دووەم:** حوکمی هاوپەیمانێتیی لەنێوان مسوڵمانان و غەیری خۆیان دا.

**باسی سێیەم:** وەڵامی چەند پرسیارو ئیشکالێك، لەبارەی ڕەوایی هاوپەیمانێتییەوە.

هیواداریشم ئەم کورتە لێکۆڵینەوەیە، بایی بەرچاو ڕوونکردنەوەی خوێنەرانی بەڕێز بکات، لەبارەی بابەتی گرنگ و هەستیاری: هاوپەیمانێتیی (تحالف) و ڕێککەوتن (إتفاق)ەوە، دڵنیاکردنیان لەو ڕاستییە: کە ئەو پرسەش وەك سەرجەم- یان لانی کەم زۆربەی- پرسەکانی بواری: عادەت و هەڵس و کەوتەکان، بناغە تێیدا، ڕەوایی و دەستکراوەیی و ڕێپێدرانەوە، دواتریش لەکاتی جێبەجێکران و چوونە نێو وردەکارییەکانەوە، حوکمی جیاجیاو جۆراو جۆر ڕووی تێدەکەن، بەگوێرەی چۆنیەتیی و نێوەڕۆك و ئامانجەکەی.

## باسی یەکەم

## پێناسەی هاوپەیمانێتی (التحالف)

لە زمانی کوردیی دا چەند وشەیەك بەكاردێن لەبەرانبەر (حِلْف، تحالف، عهد، معاهدة، إتفاق، عَقْد)دا، واتایان لەیەك نیزیكە، وەك: [پەیمان، هاوپەیمانێتیی، ڕێككەوتن، پێكهاتن، گرێبەست].

ئنجا لەسۆنگەی ئەوەوە كە ئێمە دەمانەوێ لەڕوانگەی شەریعەتەوە، لەبابەتی هاوپەیمانێتیی (تحالف) بكۆڵینەوەو زمانی عەرەبییش، زمانی ئەسڵیی دەقەكانی شەریعەتە، بە ئایەتەكانی قورئان و دەقەكانی سوننەتیشەوە، با سەرنجێكی چەمك و واتای ئەو وشانە بدەین، سەرەتا لەزمانی عەرەبیی دا، دواتریش: لەلای زانایان و شەرعزانان و لە زاراوەی شەرع دا:



### یەكەم: لەڕووی زمانەوانییەوە:

لە ڕووی زمانەوانییەوە، چەند وشەیەك هەن چەمك و واتایان لەیەك نزیكە، وەك:

(حِلْف، عهد، عقد، تحالف، معاهدة).

بۆ وێنـــە: ١- (حِـلْــف):

[الحِلْف: العهد بين القوم على التعاون والتناصر، وجمعه: أَحْلاف وحُلَفاء يقال: حالَفَ فلانٌ فلاناً: عاهَدَهُ وعاقَدَهُ، فهو حَليفُهُ][١].

---

(١) القاموس المحيط، ج٣ ص ١٣٣، لسان العرب، ج٩ ص٥٤، المعجم الوسيط ص١٩٢.

واتە: (حِلْف) پەیماندان لەنێوان کۆمەڵێك دا لەسەر هاوکاریی و پشتی یەکدی گرتن، کۆیەکەی: (أحلاف و حلفاءِ)ە، دەگوترێ: (حالف فلان فلاناً) یانی: پەیمانی پێداو هاوپەیمانیی لەگەڵ کردو ئەو هاوپەیمانیەتی.

٢) (عـهــــد):

[العَهْد: أصلُهُ من الإحتفاظ بالشيء. ويُطلق على مَعانٍ عِدَّة تَرجِعُ جميعاً إلى هذا الأصل، فيطلق على: الأمان، والذمة، والمَوْثق، ورعاية الحرمة، واليمين، والوصية وغير ذلك، وسُميت (عَهْداً) لأنَّها جميعاً مما ينبغي الإحتفاظ به.][1].

شایانی باسە:

وشەی (معاهَدة) ناو (اسم)ە، لە (عاهد يعاهد فهو معاهِدٌ أومُعاهَدٌ) هەروەها وشەی (إتفاق) و (ميثاق)یشیان هەر بەو واتایە بەکارهێناون، کە بە کوردیی: (معاهدة) هاوپەیمانێتیی و (إتفاقية) رێککەوتن یان پێکهاتن، دەگرنەوەو، (ميثاق)یش پەیمانێکی پتەو و مەحکەم.

هەروەها وشەی: (عَقْد)یش کە بە (عقود) کۆ دەبێتەوەو بە کوردیی: (گرێبەست)ی بۆ بەکاردێ، هەمان واتای وشەکانی پێشوو دەگەیەنێ.

-------------------------

(١)مقاييس اللغة، لابن فارس، ج٤ ص ١٦٧، مادة عهد، تقسيم المعمورة في الفقه الإسلامي وأثره في الواقع. عبدالله بن يوسف الجديع، ص٧٠، (مُعْجَم ألفاظ ومصطلحاً العلاقات الدولية في الفقه الإسلامي). د.حسن عبدالغني أبوغدة، ج٢ ص ٢٠٦ .

دووەم: لە ڕووی زاراوەییەوە:

ئەو وشانە: [حِلْف، عهد، عقد، ميثاق، معاهدة، تحالف] لە بەرکاهێنانی شەرعزانان و لەزاراوەی شەرعیش دا، هەر هەمان چەمك و واتا زمانەوانییەکانیان هەیە، بۆ نموونە:

١- (ابن حجر العسقلاني)، (حِلْف)ی بە: (العهد على التعاون والتناصر)[١]، لێکداوەتەوە، یانی: پەیمان بەیەکدی دان، لەسەر هاوکاریی و پشتی یەکدی گرتن.

٢- (المُناوي)، (حِلْف)ی بە: [العهد بين القوم على أن يكون أمرهُم واحداً][٢]. یانی: کۆمەڵێك بەڵێن بەیەکدی بدەن کە کارو هەڵوێستیان یەك بێ.

٣- (إبن الأثير)یش وشەی ناوبراوی بە: [المعاقدة والمعاهدة على التعاضد والتّساعُد والإتفاق][٣]. لێکداوەتەوە، یانی: پەیمان پێکەوەبەستن و بەڵێن بەیەکدی دان، لەسەر دەستبار پێکەوە گرتن و هاوکاریی و ڕێککەوتن.

٤- (الماوردي)یش هەمان وشەی بە: [أن تتحالف القبيلتان عند استطالة أعدائها، على التناصر والتضافر ويكونوا يداً على مَن سواهم].[٤]

یانی: (مُعاقدة) بریتیە لە یەکدی گرتن و پەیمان پێکەوە بەستنی دوو هۆز لەکاتی دەستدرێژیی دوژمنەکانیان دا، لەسەر پشتگیریی یەکدی و هاوکاریی، کە لەبەرانبەر غەیری خۆیان دا یەکدەست بن.

---

(١) فتح الباري، ج٤ ص ٤٧٣.

(٢) التوفيق، ص٢٩٣.

(٣) النهاية في غريب الحديث والأثر، ج١ ص ٤٢٣.

(٤) الحاوي الكبير، ج١٢ ص ٣٦٥.

بەڕێـــزان!

ئێستا ڕوونبۆوە کە چەمك و واتای وشەکانی:

[١-حِلْف ٢-عهد ٣-عقد ٤-إتفاق ٥-ميثاق ٦-تحالف ٧-تعاقد ٨-تعاهد] چ لەڕووی زمانەوانییەوە. چ لە ڕووی زاراوەییەوە، جەوهەرو نێوەڕۆکەکەی بریتیە لە: پێکهاتن و ڕێککەوتن و پەیمان بەیەکدی دان و، گرێبەست پێکەوە کردنی، دوولایەن یان زیاتر، لەسەر پێکەوە هاوکارو پشتیوان بوون و، دەستبار بۆ یەکدی گرتن، بۆ بەرگریی لەخۆکردن، یان پاراستنی چەند ئامانج و بەرژەوەندییەکی هاوبەش.

شایانی باسە:



لە زمانی کوردییش دا وشەکانی:

[١- هاوپەیمانێتی، ٢- بەڵێن بەیەکدی دان، ٣- پەیمان پێکەوەبەستن، ٤- ڕێککەوتن، ٥- پێکهاتن]

بۆ هەمان مەبەست بەکاردێنین.

بەڵام ئێمە زیاتر وشەی: (هاوپەیمانێتی) لەم بابەتەماندا بەکاردێنین، چونکە لە زمانی کوردیی دا - لەم ڕۆژگارەمان دا - باوترە.

ئێستاش کە هەتا ڕاددەیەك لە چەمك و واتای وشەی: (هاوپەیمانێتیی) گەیشتین، دەگوازینەوە بۆ باسی دووەمی ئەم بابەتە، کە چ لە ڕووی نێوەڕۆك و چ لە ڕووی پانتایی (مِساحة) بۆ تەرخانکراوەوە، گرنگترین باسی ئەم بابەتەیە.

## باسی دووەم

## حوكمی هاوپەیمانێتیی لەنێوان مسوڵمانان و غەیری خۆیان دا

بەرێـــزان!

کاتێك سەرنجی ئایەتەکانی قورئان بەرزو بەپێزو، فەرمایشتەکانی پێغەمبەری پێشەواو بەرێز (محمد) (صلی الله علیه وسلم) و سیرەو ژیانی و هەڵوێستە سیاسییەکانی دەدەین: وەك ڕۆژی ڕووناك دیارە: کە هاوپەیمانێتیی بەستنی مسوڵمانان - بەگشتیی، یان کۆمەڵێك یان چەند کۆمەڵێکیان- لەگەڵ غەیری خۆیان دا [چ لە دەرەوەی بازنەی ئیسلام دا، خۆیان حیساب بکەن، چ لە، بازنەی ئیسلام دا] ، شتێکی ڕەوایە، وەك ئەسڵ، بەڵام دوایی بەگوێرەی: چۆنیەتییەکەی و، نێوەرۆکی و، هەل و مەرجی تێدا بەسترانی و، ئامانجی بۆ بەسترانی، حوکمەکەی جۆراو جۆر دەبێ.

ئێستاش با سەرنج بدەین، داخۆ بەڵگەکەکانی: لە بناغەدا ڕەواو شەرعیی بوونی هاوپەیمانێتیی (تحالف) بەستنی مسوڵمانان لەگەڵ غەیری خۆیان دا، چی و چیین؟

بەڵگەی یەکەم: بناغە لە هەڵس و کەوت و عادەتەکان دا ڕەواییە، مەگەر بە بەڵگەیەکی شەرعیی، شتێک قەدەغە کرابێ:

بەڕێــزان!

ئایین و بەرنامەی ئیسلام، بەگشتی دوو بەشی سەرەکییە:

١- خواپەرستییەکان (العبادات).

٢- هەڵس و کەوتەکان (المعاملات)

أ- مەبەست لە خواپەرستییەکان (العبادات) هەموو ئەو بوارانەن کە مرۆڤەکان مامەڵەیان تێدا لەگەڵ خوادا دەکەن، چ پەیوەست بن بەلایەنی فیکرییەوە، چ بەلایەنی کردەییەوە، مەبەستیش لەلایەنی فیکریی و دەروونیی (الجانب النظري والباطني) هەر کام لە:

١- (بووناسیی) و ٢- (ئیمان و عەقیدە) و ٣- (تێڕوانینەکان) و ٤- (بەهایەکان) و ٥- (پێوەرەکان)ن[1].

هەروەها مەبەست لە لایەنی کردەویی (الجانب العملي) هەموو ئەو شتانەیە، کە لەشێوەی کردەوەدا بەرجەستە دەبن، وەك:

١- دروشمەکانی پەرستش (شعائر التعبُّد).

٢- باریی کەسێتیی (الأحوال الشخصية).

٣- ڕەوشت و ئاکارەکان.

---

(١) لە کتێبی چوارەمی [مەسووعەی: بیرکردنەوەی ئیسلامیی..]دا، بەناوونیشانی: (پایەکانی بیرکردنەوەی ئیسلامیی) بەدرێژیی باسی ئەو پێنجانە کراوە، کە لە ئەسڵدا لە مەوسووعەی: (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله) وەرگیراون.

ب- هەروەها مەبەست لە: [هەڵس و كەوت و عادەتەكان] (المعاملات والعادات)، هەموو ئەو بوارانەن، كە مرۆڤەكان مامەڵەیان تێدا لەنێو خۆیان و لەگەڵ دەوروبەریان دا دەكەن، وەك:

١- كۆمەڵایەتیی

٢- سیاسیی

٣- ئابووریی

٤- جەنگ و ئاشتیی

٥- پەیوەندییەكان

٦- بەڕێوەبردن (الإدارة)

٧- هەڵس و كەوتی ڕۆژانەی ئاسایی.

ئنجا سەرجەم زاناو شارەزایانی ئۆممەتی ئیسلام، لەسەر ئەوە یەكدەنگن كە:

١- بەشی یەكەم: [خواپەرستییەكان] بناغەو ئەسڵ تێیان دا: وەستان و پابەندیبە بە وەحییەوە، یان: قەدەغەبوون ڕێ لێگیرانە.

واتە: هیچ كەسێك بۆی نیە لەو بوارەدا، بەبێ ڕێپێدان و مۆڵەتی وەحیی، هیچ هەنگاوێك بنێ، چونكە مامەڵە لەگەڵ خوادا، بەهەردووك جۆری فیكریی و دەروونیی و، كردەییەوە، تەنیا خوا (عزوجل) دەزانێ دەبێ چۆن بێ و چۆن نەبێ!

بەڵام:

٢- بەشی دووەم: [مامەڵەو عادەتەکان] بناغەو ئەسڵ تێیان دا: ڕەوایی و ڕێپێدران و دەستکراوەییە.

واتە: مرۆڤەکان لەو بوارەدا ئازادو دەستکراوەن، چۆن دەکەن و، چی دەکەن؟ هیچ شتێکیان لێ قەدەغە نیە، مەگەر دەقێکی شەرعیی ڕوون و بێ چەندو چوون، قەدەغەی کردبێ.

حیکمەتی ئەوەش ئاشکرایە، چونکە: مرۆڤەکان، مامەڵەی نێوان خۆیان و لەگەڵ دنیاو دەوروبەردا، تاڕادەیەکی زۆر، لەمەودای عەقڵ و هۆش و ئەزموونیان دایەو، سەریان لێی دەردەچێ.

ئنجا با لەو بارەوە ئاماژە بە قسەی دووان لە زاناو پێشەوایان بکەین:



١- (إبن تيمية) لە کتێبی: (القواعد النورانية الفقهية)دا دەربارەی ئەو بنچینە شەرعییە نووسیویەتی[1]:

(الأصل في العبادات التوقيف، فهو لا يُشْرَع منها إلا ما شرعه الله، وإلاّ دخلنا في قوله تعالى: ﴿ أَمْ لَهُمْ شُرَكَٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنۢ بِهِ ٱللَّهُ ﴿٢١﴾ ﴾ الشورى، والعادات الأصل فيها العفو فلا يُحْظَر منها إلا ما حرّمه الله تعالى وإلاّ دخلنا في معنى قوله: ﴿ قُلْ أَرَءَيْتُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ لَكُم مِّن رِّزْقٍ فَجَعَلْتُم مِّنْهُ حَرَامًا وَحَلَٰلًا ﴿٥٩﴾ ﴾ يونس،

واتە: بناغە لە خواپەرستییەکاندا بریتیە لە وەستێنران، (بەندە دەبێ بوەستێ) هیچ عیبادەتێك بە شەرعیی دانانرێ، مەگەر ئەوە کە خوا بە شەرعیی دانابێ و بەڵگەی لەسەر ناردبێ، چونکە هەر عیبادەتێك زیاد بکرێ، ئەوە دەچینە نێو مانای ئەو ئایەتە کە دەفەرموێ:

---

(١) ص:١١٢.

﴿ أَمْ لَهُمْ شُرَكَـٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم .. ﴿٢١﴾ ﴾ الشورى.

واتە: ئایا چەند هاوبەشێکیان هەن: شتێکیان لە دین بۆ داناون، کە خوا ئیزنی لەسەر نیە؟!، [کەواتە: هەر عیبادەتێك زیاد بکرێ مانای وایە شتێك زیاد کراوە، کە خوا فەرمانی پێ نەداوە، چونکە عیبادەت بریتیە لەوە کە خوا یان فەرزی کردوە، یاخود پەسەندی کردوە، عیبادەت تەنیا دوای فەرمانی خوا، دەیزانی کە ئەوە عیبادەتە یان نا؟، کەواتە: هەر شتێك خوا فەرمانی پێ نەکردبێ، بە پێویست کردن، یاخود فەرمانی پێ نەکردبێ، بە بە پەسەند دانان، مانای وایە عیبادەت نیە، بۆیە: هەر شتێك زیاد بکرێ، لە لایەن ئینسانەکانەوە لە بواری عیبادەتدا، ئەوە قەدەغەیەو، بریتیە لەوە کە شەریك بۆ خوا بڕیار درابێ] ئنجا دەڵێ:بەڵام عادەتەکان بناغە تێیاندا بریتیە لە عەفوو، [واتە: لێگەڕان و وازلێهێنران و، مرۆڤەکان دەستیان بەرهەڵدا کراوە، لە بواری مامەڵەو هەڵسوکەوت و عادەتەکاندا] و هیچ کام لە عادەتەکان، لێ قەدەغە ناکرێن، جگە لەوەی خوای بەرز قەدەغەی کردوون، چونکە هەر شتێك لە هەڵسوکەوت و عادەتەکان قەدەغە بکەین، کە شەرع قەدەغەی نەکردبێ، مانای وایە: پێچەوانەی فەرمانی خوا جووڵاوینەوە، کە دەفەرموێ:

﴿ قُلْ أَرَءَيْتُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ لَكُم مِّن رِّزْقٍ فَجَعَلْتُم مِّنْهُ حَرَامًا وَحَلَـٰلًا قُلْ ءَآللَّهُ أَذِنَ لَكُمْ أَمْ عَلَى ٱللَّهِ تَفْتَرُونَ ﴿٥٩﴾ ﴾ یونس.

واتە: ئەی موحەممەد! (صلی الله علیه وسلم) بڵێ: ئەو ڕزقە دەبینن کە خوا بۆی ناردوونە خوار، هەندێکیتان لە خۆتانەوە قەدەغەو، هەندێکیشتان حەڵاڵ کردوە، ئنجا ئایا خوا مۆڵەتی داون و فەرمانی

پێکردوون وابکەن، یاخود بە ناوی خواوە بوختان و درۆ دەکەن؟! کەواتە: هەر شتێك لە بواری هەڵسوکەوتەکاندا، قەدەغە بکرێ بە بێ دەقێکی شەرعیی، مانای وایە: شتێك کراوە، پێچەوانەی فەرمانی خوا، چونکە خوا دەفەرموێ: لەخۆوە شت قەدەغە مەکەن، وەك خوای پەروەردگار لە سووڕەتی(المائدة)دا دەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُحَرِّمُواْ طَيِّبَٰتِ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكُمۡ ﴿٨٧﴾ ﴾ المائدة.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ئەو شتە خۆش و بەتام و سوودبەخش و چاکانەی خوا بۆی حەڵاڵ کردوون، قەدەغەیان مەکەن.

٢- ئنجا با بچین بۆ لای زانایەکی دیکە، داخۆ ئەو چۆن تەعبیر لەم بنچینە شەرعییە دەکات؟ (عبدالرحمن بن ناصر السّعدي) لە کتێبێکیدا بە ناوی (رسالة لطيفة جامعة في أصول الفقه المهمة)[1]، واتە: (نامیلکەیەکی بچووکی کۆکەرەوە دەربارەی بنچینە گرنگەکانی فیقه،) دەڵێ: (الأصل في العبادات: الحظر، إلاّ ما ورد عن الشارع تشريعه، والأصل في العادات الإباحة، إلاّ ما ورد عن الشارع تحريمه)، واتە: بناغە لە عیبادەتەکاندا بریتیە لە قەدەغەکران، جگە لەوەی شەرعدانەر بە ڕەوای دانابێ و بڕیاری لەسەر دابێ، بەڵام بناغە لە عادەتەکاندا، بریتیە لە ڕەوایی، جگە لەوەی کە شەرعدانەر (کە خوایە سبحانه وتعالى) قەدەغەی کردوە،

ئنجا بۆ زیاتر سەلماندنی ڕاستیی ئەم ڕایە، دەڵێین: پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ: {من أحدث في أمرنا هذا ما ليس

(١)- ص ١٠٥،١٠٦.

منه فهو رد]، أخرجه البخاري: ٢٦٩٧، ومسلم: ١٧١٨، واتە: هەر كەسێك لەم دینەی ئێمەدا، شتێك پەیدا بكات كە لەو نەبێ، ئەوە ڕەتكراوەیە.

كە لێرەدا مەبەستی بواری ئیمان و عیبادەتە، چونكە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە بواری هەڵسوكەوت و عادەتەكاندا فەرموویەتی: ئێوە لە كاروباری دنیاتان شارەزاترن، وەك لە ڕووداوی مووتوربە كردنی دارخورمایاندا هاتوە، كە بە لای كۆمەڵێكدا تێپەڕی، دارخورمایان موتوربە دەكردو فەرمووی: ئەگەر واش نەكەن زەرەری نیە، ئەوانیش وازیان لە موتوربەكردنیان هێناو، سەرەنجام دارخورمایەكان بەریان نەگرت، دوایی چوونە لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) گوتیان، ئەی پێغەمبەری خوا! دار خورمایەكان بەریان نەگرت! فەرمووی: بۆچی؟ گوتیان: تۆ فەرمووت: ئەگەر واش نەكەن زەرەری نیە، ئەویش فەرمووی: ئەگەر شتێكم پێگوتن و گوتم كە ئەوە خوا فەرموویەتی، لێم وەربگرن، بەڵام ئەگەر شتێكم دەربارەی كاروباری دنیا گوت، وەك بۆچوونی خۆم: (أنتم أعْلمُ بأمور دنياكم[1]، ئەوە ئێوە بە كاروباری دنیاتان شارەزاترن، كەواتە:ئیمان و عیبادەت و ئەوشتانە كە لە وەحییەوە نەبێ نازانرێن، ئەوە (توقيفي)ین و، دەبێ تێیاندا لەو شوێنە بوەستین كە دیاریی كراوە،

بەڵام لە بواری هەڵسوكەوت و عادەتەكاندا، دەستمان كراوەیە، چونكە خوای بەبەزەیی لە چەندان ئایەتدا، ڕایگەیاندوە كە هەموو شتێكی بۆ بەندەكانی خولقاندوەو دەستی ئاوەڵا كردوون، بۆ وێنە:

١- لە سوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ لَكُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا ﴿٢٩﴾ ﴾ البقرة،

---

(١) - رواه مسلم، بەژمارە: ٢٣٦١،٢٣٦٢،٢٣٦٣.

واتە: خوا ئەو کەسەیە کە هەرچی لەسەر زەوییە بۆ هەمووتانی خوڵقاندوە، یان هەرچی لەسەر زەوییە بۆ ئێوەی خوڵقاندوە.

٢- لە سوورەتی (الجاثية)دا دەفەرموێ: ﴿ وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ ﴿١٣﴾ ﴾ الجاثية.

واتە: هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوییدایە هەمووی بۆ ئێوەی خوڵقاندوە، لە لایەن خۆیەوە، کەواتە: هەموو شتەکان و، هەموو هەڵسوکەوتەکان لەئەسڵدا ڕەوان، چونکە خوا ئەم ژیان و نیعمەت و بوونەی بۆ ئینسان ڕەخساندوە، مەگەر ئەوەی بە دەقێکی ڕۆشن قەدەغەی کردبێ،ئەگەرنا هیچ شتێك و هیچ جۆرە مامەڵەو هەڵسوکەوتێك، قەدەغە نیە.



شتێکی ڕوونیشە:





کە هاپەیمانێتیی (تحالف)ی مسوڵمانان بەگشتی، یان بەشێکیان لەگەڵ لایەنێکی، یان زیاتری غەیری خۆیان دا، بابەتێکی دنیایی بواری عادەت و هەڵس و کەوتەکانە، بۆیە مسوڵمانان تێیدا ئازادو دەستکراوەن و، چۆن بەرژەوەندیی تێدا بەدی بکەن، بۆیان هەیە وابکەن.

هەڵبەتە هیچ ئایەتێکی قورئان و دەقێکی سوننەتیش نیە، کە بگوترێ: بەشێوەی تایبەت ئەم مەسەلەی هاوپەیمانێتیی کردنەی، قەدەغە کردوەو، لە حاڵەتە گشتییەکەی عادەت و هەڵس و کەوتەکان هەڵیواردوەو جیای کردۆتەوە، کەواتە: هەر لەسەر حاڵەتە ئەسڵییەکەی خۆی، کە ڕەوایی و ڕێپێدان (الإباحة والعفو)ە، ماوەتەوە.

بەڵگەی دووەم: ئایەتەكانی قورئان فەرمان دەكەن بە وەفاداریی و پایەندیی بە بەڵێن و پەیمانەوە، لەگەڵ هەر جۆرە هاوپەیمانێك دا:

خوای دادگەرو كاربەجێ لەزۆر ئایەتی قورئانی بەرزو بەپێزدا، فەرمانی بە مسوڵمانان كردوە كە: بەڵێن و پەیمانەكانیان لەگەڵ هاوپەیمانەكانیان دا بپارێزن و، بەهیچ ڕەنگێك توخنی پەیمانشكێنیی و بێ بەڵێنیی نەكەون، كە ئەمەش بەڵگەیەكی بەهێزو یەكلاییكەرەوەیە لەسەر: لە ئەسڵ دا ڕەوا بوونی: پەیمان بەستنی مسوڵمانان لەگەڵ غەیری خۆیان دا، ئەمەش چەند نموونەیەك لەو ئایەتانە:

١- ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَوْفُوا بِالْعُقُودِ ... ﴾



واتە: ئەی بڕوادارینە! پەیمان و گرێبەستەكان جێ بەجێ بكەن و بیانپارێزن.

٢- ﴿ وَأَوْفُوا بِعَهْدِ اللَّهِ إِذَا عَاهَدْتُمْ وَلَا تَنْقُضُوا الْأَيْمَانَ بَعْدَ تَوْكِيدِهَا ... ﴾ النحل: ٩١.

واتە: هەر كات پەیمانتان دا (هاوپەیمانییتان كرد) پەیمان جێ بەجێ بكەن و، پەیمانە بەسوێند جەخت لەسەركراوەكان، مەشكێنن!

٣- ﴿ إِلَّا الَّذِينَ عَاهَدْتُمْ مِنَ الْمُشْرِكِينَ ثُمَّ لَمْ يَنْقُصُوكُمْ شَيْئًا وَلَمْ يُظَاهِرُوا عَلَيْكُمْ أَحَدًا فَأَتِمُّوا إِلَيْهِمْ عَهْدَهُمْ إِلَى مُدَّتِهِمْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَّقِينَ ﴿٤﴾ ﴾ التوبة: ٤.

واتە: [خواو پێغەمبەرەکەی لە هەموو هاوبەشدانەرە هاوپەیمانەکان، کە پەیمانەکانیان شکاندوە، بەریین] جگە لەو هاوبەشدانەرانەی پەیمانتان لەگەڵیان بەستوەو، هیچ کەم و کوڕییان لەگەڵتاندا نەبووەو، هاوکاریی هیچکەسیشیان لەدژتان نەکردوە، ئائەوانە: هەتا کاتی دیارییکراویان پەیمانەکەیان، لەگەڵ بەرنەسەر، بەدڵنیایی خوا پارێزکارانی خۆشدەوێن.

٤- ﴿ وَإِمَّا تَخَافَنَّ مِن قَوْمٍ خِيَانَةً فَٱنۢبِذْ إِلَيْهِمْ عَلَىٰ سَوَآءٍ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْخَآئِنِينَ ﴿٥٨﴾ ﴾ الأنفال: ٥٨.

واتە: هەر کات مەترسیی پەیمانشکێنییت لە کۆمەڵێك هەبوو، بەئاشکرا کە لەلای هەردووکتان یەکسان بێ، پەیمانەکەیان بدەوە — ئاگاداریان بکەوە کە پەیمانتان لەنێوان دا نەماوە- بەدڵنیایی خوا، خائینان (پەیمانشکێنان)ی خۆشناوێن.

ئەم ئایەتە بەپێزانەش، زۆر ڕوون و ئاشکران، لەسەر ڕەوایی هاوپەیمانێتیی لەنێوان مسوڵمانان و غەیری خۆیان دا، بەهەموو جۆرو شێوەکانیانەوە، هەروەها بەڵگەی ڕوون و ڕەوانن، لەسەر فەرزبوونی پابەندیی بە بەڵێن و پەیمانەوە، لەگەڵ نامسوڵمانان دا.

بەڵگەی سێیەم: فەرمایشتەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمان بە وەفاداریی بە بەڵێن و پەیمان دەکەن و، هەڕەشەی قورس لە پەیمان شکێنان دەکەن:

**ئەمەش چەند نموونەیەکی فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خوا، لەو بارەوە:**

١- (من كان بينه وبين قومٍ عَهدٌ، فلا يَشُدُّ عُقْدةً ولا يَحِلُّها، حتى يَنْقَضي أَمَدُها، أو يَنْبُذْ إليهم على سواء) أخرجه أبو داود: ٢٧٥٩، والترمذي: ١٥٨٠. والنسائي في الكبرى: ٨٦٧٩. وقال الترمذي. حديث حسن صحيح.

واتە: هەرکەسێك لەگەڵ کۆمەڵێك دا پەیمانی هەبوو، با هیچ گرێیەك توند نەکات و نەیکاتەوە، تاکو ماوەکەی بەسەردەچێ، یان بە ئاشکرا ئاگاداریان دەکاتەوە: کە پەیمانیان لە بەین دا نەماوە.

٢- (أربعٌ من كُنَّ فيه كان مُنافقاً خالصاً، ومن كانت فيه خصلة منهن كانت فيه خصلة من النفاق حتى يَدعَها: إذا أوتُمِنَ خان، وإذا حدَّث كذب، وإذا عاهد غَدَرَ، وإذا خاصَم فجر) رواه البخاري: ٣٠٠٧، ومسلم: ٥٨.

واتە: چوار خەسڵەت لەهەر کەسێك دا هەبن مونافیقێکی تەواوە، هەر کەس یەك خەسڵەتی لەوانە تێدابێ، خەسڵەتێکی نیفاقی تێدایە تاکو دەستبەرداری دەبێ: هەرکات سپاردەی پێدرا ناپاکیی بکات و، هەرکات قسەی کرد درۆ بکات و، هەرکات پەیمانی دا بیشکێنێ و، هەرکات ناکۆکیی بوو خراپەکاریی بکات.

٣- (إذا جمع الله الأولين والآخرين يوم القيامة: يُرَفَعُ لكل غادرٍ لِواءٌ، فقيل: هذه غَدْرَةُ فلانِ بن فلانٍ) رواه البخاري: ٦٦٩٤، ومسلم ١٧٣٥.

واتە: هەرکات لە ڕۆژی هەڵسانەوەدا خوا: سەرەتاکان و دواینەکانی خەڵکی کۆکردنەوە، هەر پەیمان شکێنێك ئاڵایەکی بۆ هەڵدەدرێ و دەگوترێ: ئەمە پەیمانشکێنیی فڵانکەسی کوڕی فڵانکەسە!

٤- (لادينَ لمن لا عَهْدَ لَهُ) رواه أحمد: ٢٤٠٦، وابن حبان ١٩٤ والبيهقي في السنن الكبرى.

واتە: هەرکەس بەڵێن و پەیمانی نەبێ، ئایینی نیە.

به‌ڵگه‌ی چواره‌م: له‌سیره‌و ژیانی پێغه‌مبه‌ری خوادا (صلى الله عليه وسلم): پێش دامه‌زراندنی قه‌واره‌ی سیاسیی و، له‌كاتی دامه‌زراندنی دا و، دوای دامه‌زراندنیشی، په‌یمان به‌ستن هه‌بووه:

**یه‌كه‌م: پێش بنیاتنانی قه‌واره‌ی سیاسیی:**

أ- سه‌رنه‌گرتنی چه‌ند هه‌وڵێكی داواكاریی بۆ هاوپه‌یمانیی:

(المقريزي) گوتوویه‌تی:

[ثُمَّ عرض (صلى الله عليه وسلم) نَفْسَه عن القبائل أيّام الموسم، ودعاهم إلى الإسلام، وهم: ١- بنو عامر، ٢- وغَسّان، ٣- وبنو نزارة، ٤- وبنو مُرّة، ٥- وبنو حنيفة، ٦- وبنو سليم، ٧- وبنو عَبْس، ٨- وبنو نصر، ٩- وثعلبة بن عُكابة، ١٠- وكندة، ١١- وكلب، ١٢- وبنو الحارث بن كعب، ١٣- وبنو غدرة، ١٤- وقيس بن الخطيم، ١٥- وأبو اليُسْر أنس بن أبي رافع... وجعل يقول: من رجُلٌ يَحْمِلُني إلى قومه، فَيَمْنَعُني حتى أُبَلِّغ رسالة رَبِّي، فإنَّ قريشاً قد منعوني أن أُبلِّغ رسالة ربِّي؟!][١]

واته: ئنجا پێغه‌مبه‌ر (صلى الله عليه وسلم) له‌ ڕۆژانی حه‌ج دا خۆی له‌سه‌ر هۆزه‌كان ڕاده‌نواندو بانگی ده‌كردن بۆ ئیسلام، ئه‌و هۆزانه‌ش ئه‌مانه‌ بوون: ١- بنو عامر، ٢- وغَسَّان، ٣- وبنو نزارة، ٤- وبنو مُرّة، ٥- وبنو حنيفة، ٦- وبنو سليم، ٧- وبنو عَبْس، ٨- وبنو نصر، ٩- وثعلبة بن عُكابة، ١٠- وكندة، ١١- وكلب، ١٢- وبنو الحارث بن كعب، ١٣- وبنو

---

(١) إمتاع الأسماع، للمقريزي، ج١ ص ٣٠، ٣١.

غدرة، ١٤- وقيس بن الخطيم، ١٥- وأبو اليُسْر أنس بن أبي رافع. [واتە: سەرجەم پازدە سەردان و هەوڵی پەیمان وەرگرتنی ئەنجام داون!] .

دەیفەرموو:

[چ پیاوێك ئامادەیە بمباتە لای خەڵکەکەی و، بەرگرییم لێ بکات، تاکو پەیامی پەروەردگارم بگەیەنم، چونکە هۆزی قورەیش ڕێگرییم لێ دەکەن، کە پەیامی پەروەردگارم بگەیەنم؟!].

ب- پەیمان بەستن لەگەڵ (مُطْعِم بن عِدي) بۆ گەڕانەوەی بۆ شاری مەککە:

دوای ئەوەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پاش دە (١٠) ڕۆژ مانەوەی لەلای خەڵکی (طائف)، زۆر بەناڕەحەتیی و بە بەردبارانکراویی گەڕایەوە[(١)]، بۆی نەکرا بەبێ پەیمان وەرگرتن کە بەرگریی لێبکرێ، بگەڕێتەوە نێوشار، بۆیە سەرەتا پیاوێکی ناردە لای: (الأخنس بن شريق) پاشان لای: (سُهَيل بن عمرو) کە بچێتە بن سێبەر (جِوار)یانەوە، بەڵام پۆزشیان بۆ هێنایەوە، کە بۆیان نالوێ ئەو کارە بکەن!

پاشان بۆ جاری سێیەم ناردیە لای: (المُطْعِم بن عِدي) ئنجا با گوێ لە (ابن سعد) بگرین چی دەڵێ؟

[فَبَعثَ إلى المُطْعم بن عدي: أَأَدخُلُ في جوارِك؟ قال: نعم، ثم تَسَلَّحَ، وَدعا بَنِيه وقَوْمَهُ فقالَ: البَسوا السِّلاح. وكونوا عند أركان البيت، فإني قد أَجَرْتُ محمداً، ثم بعث إلى رسول الله (صلى الله عليه وسلم) ، أن ادخلْ،

---

(١) البداية والنهاية، لابن كثير، ج٣ ص١٥٠.

فدَخَل، ومعه زيدُ بن حارثة حتى انتهى إلى المسجد الحرام، فقام المطعم بن عدي على راحِلَتِهِ فنادى: يا معشر قريش! إني قد أَجَرْتُ محمداً فلا يُهَيِّجْهُ أحدٌ منكم...][1]

واتە: ناردیە لای (المطعم بن عدي): ئایا بێمە ژێر پەنادانی تۆوە؟ گوتی: بەڵێ. دوایی (مطعم) چەکی هەڵگرت و بەکوڕەکانی و خزمەکانی گوت: چەك هەڵگرن و لەلای گۆشەکانی کابە بوەستن، چونکە موحەممەدم پەناداوە، ئنجا ناردیە لای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) : کە وەرە نێو شار، ئەویش هاتە نێو شارو (زید بن حارثة)شی لە خزمەت دابوو، هەتا هاتە لای مزگەوتی حەڕام، (مطعم بن عدي)یش بەسواری حوشترەکەی بانگی کرد: هۆ هۆزی قوڕەیش! من موحەممەدم پەناداوە، با هیچکەس بێزاری نەکات!



**دووەم: لەمیانی بنیاتنانی قەوارەی سیاسیی دا:**

وەك لە سەرچاوەکانی سیرەو ژیاننامەی پێغەمبەری خوا (محمد(صلی الله علیه وسلم))دا هاتوە، بەتایبەت (السیرة النبویة لابن هشام)[2]، پێغەمبەری خوا بەسێ قۆناغ و هەر قۆناغەی لە ساڵێك دا، - ساڵەکانی: ١١ و ١٢ و ١٣ی پێش کۆچکردن بۆ مەدینە- توانی بەماوەیەکی کەم بەر لە ڕاگەیاندنی دەوڵەت و قەوارەی سیاسیی لەشاری (یثرب)، دوو ڕێککەوتننامەو هاوپەیمانێتیی گەورەو گرنگ، لەگەڵ نوێنەرانی خەڵکی (یثرب)دا ببەستێ، کە دواتر ناوی شارەکە

---

(١) الطبقات الكبرى، لابن سعد، ج١ ص١٤٢، التحالف السياسي في الإسلام، منير محمد غضبان، ص ٤٢،٤٣، گ٢/ ١٩٨٨، دار السلام

(٢) السيرة النبوية لابن هشام. ج٢ ص٢٢١-٢٣٥ ، دار ابن الهيثم/ ٢٠٠٦ م.

گۆڕا بۆ (المدینة) یان (مدینة الرسول)، ئەوانیش هەردووك پەیمانی یەکەم و دووەمی عەقەبە بوون لە ساڵەکانی: [دوزادە (١٢) سێزدە (١٢)] ی پێغەمبەرایەتیی دا.

شایانی باسیشە: پەیمانی یەکەمی عەقەبە (بیعة العقبة الأولی) زیاتر پەیمان و گرێبەستێکی کۆمەڵایەتیی (عهد و عقد اجتماعي) بوو و، بەندەکانی شێوەی بڕگەکانی ئایەتی ژمارە (١٢)ی (الممتحنة) بوون، کە بریتین لە: دووریی لە:

١- شیرك

٢- دزیی

٣- زینا

٤- کوشتنی منداڵ

٥- بوختانکردن

٦- سەرپێچیی کردن لە چاکەو پەسند دا.

بۆیەش ناوی لێنرا: پەیمانی ئافرەتان: (بیعة النساء).

بەڵام پەیمانی دووەمی عەقەبە (بیعة العقبة الثانیة) پەیمانێکی سیاسیی گشتگیر بوو، و لە پێنج بڕگەی هەستیارو گرنگ پێکهاتبوو، وەك لەم دەقەوە دیارە:

[عن جابر بن عبدالله: فقلنا: یارسول الله! علی ما نبایعك؟

قال:

علی السمع والطاعة في النشاط والكَسَل.

وعلی النفقة في العُسْر والیُسْر.

وعلى الأمر بالمعروف و النهي عن المنكر.

وعلى أن تقولوا في الله لا تأخذكم في الله لَوْمَة لائم.

وعلى أن تنصروني إذا قدِمْتُ إليكم، وتمنعوني مِمَّا تمنعون منه أنفسكم وأزواجكم وأبناءكم.

ولكم الجنة] رواه أحمد: ١٤٦٩٤ وقال شعيب الأرنؤوط: حديث صحيح.

واتە: (جابر بن عبدالله) خوا لێی ڕازی بێ - کە لە بەشداربووانی هەردووك پەیمانەکە بوو- دەڵێ:

گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا! لەسەرچی پەیمانت لەگەڵ بدەین؟

فەرمووی: پەیمانم پێبدەن لەسەر:

١- گوێگرتن و بەقسەکردن لە حاڵەتی پێخۆشبوون و پێناخۆشبوون دا.

٢- بەخشین لە سەغڵەتیی و فەرحانیی دا.

٣- فەرمان بە پەسندکردن و ڕێ لەناپەسند گرتن.

٤- لەپێناوی خوادا هەقبێژبن و، لەسەرکۆنەی لۆمەکاران بێباك بن.

٥- هەر کاتێکیش هاتمە لاتان بەرگرییم لێ بکەن، لەهەر شتێك کە خۆتان و هاوسەرانتان و منداڵەکانتانی لێ دەپارێزن.

لەبەرانبەریش دا بەهەشتتان هەبێ.

**سێیەم: دوای بنیاتنانی قەوارەی سیاسیی:**

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پاش دامەزراندنی قەوارە سیاسییەکەی مەدینەش، کۆمەڵێك هاوپەیمانیی و ڕێککەوتنی ئەنجام داون، کە ئێمە دووانیان بە نمونە دێنینەوە:

**١- نووسینی ڕێککەوتننامە لەنێوان پێکهاتەکانی مەدینە دا، بە تایبەت جوولەکەکان:**

(إبن هشام) لە کتێبە ناودارەکەی خۆیدا نووسیویەتی[1]:

[الرسولُ يُوادِعُ اليهودَ:

قال ابن إسحاق: وكتب رسولُ الله (صلى الله عليه وسلم) كتاباً بين المهاجرين و الأنصار، وادع فيه يهود وعاهدهم، وأقرّهم على دينهم وأموالهم، وشرط لهم، واشترط عليهم..].

واتە: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پەیمان لەگەڵ جوولەکەدا دەبەستێ:







(إبن اسحاق) گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ڕێککەوتننامەیەکی لەنێوان کۆچکەران و پشتیوانان دا نووسی، کە تێیدا پەیمانی لەگەڵ جوولەکەدا بەست و، دانی بۆ پێداهێنان کە لەسەر ئایینی خۆیان بمێننەوە، ماڵ و سامانی خۆیان هی خۆیان بێ و، مەرجی بۆ دانان و، مەرجیشی لەسەردانان...

شایانی باسە ئەو ڕێککەوتننامەیەش لە چل و حەوت (٤٧) یان پەنجاو دوو (٥٢) مادده پێکهاتوە، وردەکاریی زۆری گرتۆتە خۆی، لەبارەی چۆنیەتی ئیدارەدانی ئەو قەوارە سیاسییەی مەدینەوە، لەسەرچاوە مێژووییەکانیش دا، نووسراوی ناوبراو، هەرکام لەم وشانەی بۆ بەکار هاتوون، کە واتایان لە یەك نیزیکە:

١- کتاب

---

(١) السيرة النبوية لابن هشام، ج٢ ص ٢٦٢-٢٦٤.

٢- صحيفة.

٣- وثيقة.

قسەكردنيش لەبارەی ئەو نووسراوەوە كە لە جێی ياسای بنەڕەتيی (القانون الأساسي) يان دەستووری ئەم ڕۆژگارەمان بووە، زۆری دەوێ و لە قەرەی ئێرەدا نيە.[١]

## ٢- ڕێككەوتنی حودەيبيە (صلح الحديبية):

ئەم پەيمان و ڕێككەوتنەش لە ساڵی شەشەمی كۆچيی دا، لەنێوان مسوڵمانان بە قيادەی پێغەمبەری خوا (صلی الله عليه وسلم) و، هۆزی قوڕەيش دا بەستراو، چەند بڕيارێكی گەورەو گرنگی تێدا دران، كە ڕەنگە گرنگترينيان بريتی بووبێ لە ڕاگرتنی شەڕو چالاكيی سەربازيی لەدژی يەكدی، هەتا ماوەی دە (١٠) ساڵان.[٢]





---

(١) لەبەرگی دووەمی مەوسووعەی: [ئيسلام و دەوڵەتداريی] دا بەناوونيشانی: [بنەمايەكانی سيستمی حوكمڕانيی ئيسلاميی] بەدرێژيی قسەمان لەسەر كردووەو دەقەكەيشمان هێناوە.

(٢) بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام، ج٣ ص ١٦٣-١٧٦.

بەڵگەی پێنجەم: ستایشکردنی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بۆ هەردووک پەیمانی (حِلْف المُطَيَّبين) و (حِلْف الفضول) لەسەردەمی نەفامیی دا:

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) مەدحی دوو هاوپەیمانێتیی (تحالف)ی سەردەمی پێش پێغەمبەرایەتیی خۆی کردوەو، بە شتی زۆر چاك و پەسندی داناون:

١- (حِلْف المُطيَّبِين) پەیمانی بۆنخۆشکراوان:

(شَهِدتُ حِلْفَ المُطَيَّبين، وما أُحِبُّ أن أَنكُثَهُ وأن لي به حُمْرَ النَّعم) رواه أحمد في مسنده (١/١٩٠ ، ١٩٣).



واتە: ئامادەی پەیمانی بۆنخۆشکراوان بووم و، حەزناکەم لەبەرانبەری دا حوشتری سوورم بدرێتێ.

یانی: بەماڵ و سامانی زۆر بە نرخی ناگۆڕمەوە.

شایانی باسیشە: پەیمانی ناوبراو ئامانجەکەی بەرگریی کردن لە ستەمدیدان و، ڕاوەستان لەبەرانبەر ستەمکاران دا بووە.[١]

٢- (حِلْفُ الفضول) پەیمانی جوامێران:

(لقد شَهِدتُ في دار عبدالله بن جِدْعان حِلْفاً، ما أُحِبُّ أنَّ لي به حُمْرَ النَّعم، ولو أُدْعى به في الإسلام، لأجَبْتُ) رواه ابن إسحاق في سيرته[٢]، و ابن

---

(١) هەمان سەرچاوە، ج١ ص ٧١-٧٢.

(٢)السيره النبويه، لابن هشام، ج١ ص ٧٢.

كثير في (البداية والنهاية)[1]، وفي سيرته[2]، وابن خلدون في تأ ريخه[3].

واتە: ئامادەی پەیمانێك بووم لە ماڵی (عبدالله)ی كوڕی (جِدْعان) حەزناكەم بە حوشتری سووری بگۆڕمەوەو، ئەگەر لە ئیسلامیش دا بۆی بانگ بكرێم، وەڵام دەدەمەوە.

شایانی باسە:

ئەم پەیمانەش ئامانجەكەی لەسەركردنەوەی ستەملێكراوان و بەرگریی لێكردنیان بووە وەك، (إبن هشام) گوتوویەتی:

[تداعت قبائل من قريشٍ إلى حِلْفٍ، فاجتمعوا في دار عبدالله بن جِدعان... فتعاقدوا وتعاهدوا على: أن لا يَجِدوا بمكة مظلوماً من أهلها ومن غير أهلها فمن دخلها من سائر الناس، إلاّ قاموا معه، وكانوا على مَنْ ظَلَمَهُ حتى تُرَدَّ عليه مَظْلَمَتُهُ، فَسَمَّتْ قريش: ذلِكَ الحلف: حِلْف الفضول][4].

واتە: چەند هۆزێك لە قورەیش بۆ پەیمانێك كۆبوونەوە، لەماڵی عەبدوڵڵای كوڕی جیدعان... ئیدی گرێبەستیان كردو پەیمانیان بەست كە: لەشاری مەككەدا، هیچ كەسێكی ستەملێكراو نەبینن، چ خەڵكی ئەوێ بێ، چ هی دەرەوەی، لەو خەڵكەی دیكە كە بۆی دێن، مەگەر لەدژی ئەوكەسەی ستەمی لێكردوە، پشتی بگرن، هەتا

---

(١) سەرچاوەی پێشوو: ج٢ ص ٢٩٣.

(٢) سەرچاوەی پێشەوو: ج١ ص ٢٥٩.

(٣)تأريخ ابن خلدون، ج٢ ص٤٠٤.

(٤) السيره النبويه لابن هشام، ج١، ص ٧٢.

ستەمەکەی لەسەر لادەچێ، ئیدی قورەیش ناویان لەو پەیمانە نا: پەیمانی جوامێران.

گومانیشی تێدا نیە کە خۆزگە پێخواستنی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەو پەیمانەو مەدحکردنی، باشترین بەڵگەیە لەسەر ڕەوایی هەرجۆرە بەڵێن و پەیمان و ڕێککەوتنێك لەنێوان مسوڵمانان و خەڵکی دیکەدا، مادام ئامانج و مەبەست لێی چەسپاندنی چاکەو دادگەریی و، لابردنی ستەم و خراپە بێ.

بەڕێزان!

پێم وایە دوای خستنەڕووی ئەو پێنج بەڵگەیەی ڕابردن، ڕەوایی و بێ گرێی و گۆڵیی، هاوپەیمانێتی (تحالف، مُعاهدة) وەك مانگ لە شەوی پازدەی دا درەوشاوەتەوەو، هیچ تەم و مژی بەسەرەوە نەماوە، بۆیە کاتی ئەوە هاتوە بگوازینەوە بۆ باسی سێیەم و کۆتایی ئەم بابەتە.

## باسی سێیەم

## وەڵامی دوو پرسیار و ئیشکال

**ئیشکالی یەکەم: هاوپەیمانێتیی (تحالف) یەکانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە قۆناغی دەوڵەتداریی دابوون، نەك پێشتر!**

لە وەڵام دەڵێین:

١) ئەوە ڕاست نیە، چونکە وەك لە بەڵگەی چوارەم - لە باسی دووەم - دا ڕوونمان کردەوە، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەهەرسێ حاڵەتی:

١- پێش بنیاتنانی دەوڵەت.

٢- میانی بنیاتنانی دەوڵەت.

٣- پاش بنیاتنانی دەوڵەت،دا.

هاوپەیمانێتی کردوە، نکووڵیی لێکردنی ئەو ڕاستییە نکوولێکردنە لە واقیعێکی مێژوویی چەسپاو.

٢- مادام لە ئەسڵ دا هاوپەیمانێتیی لەبواری عادەت و هەڵس و کەوتە ڕێ پێدراو و ڕەوایەکان دایەو، هیچ بەڵگەیەکیش نیە هەڵیواردبێ و جیای کردبێتەوە، کەواتە: هەر لەسەر ئەسڵی خۆی ماوەتەوە، کە ڕەواییە.

٣) وەك پێشتر باسمان کرد: پێغەمبەری خوا مەدحی هەرکام لە پەیمانی (مُطَیِّبین) و پەیمانی (فضول)ی کردوە فەرموویەتی: ئەگەر

لە ئیسلامیش دا، بۆ پەیمانێکی وا بانگهێشت بکرێم، بەدەمیەوە دەچم (وَلَو أُدعى به في الإسلام لَأَجَبْتُ).

کەواتە: ڕەوایەتیی ئەو جۆرە پەیمان و ڕێککەوتنانە، هەر بەردەوامەو، ئاشکراشە ئەو پەیمانانە لەلایەن دەوڵەت و قەوارەی سیاسییەوە، نەبەستراون و لەلایەن نوێنەرانی چەند هۆزێکەوە بوون!

٤) هەروەها پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەبارەی ئەو جۆرە پەیمانانەوە، کە نیوەڕۆك و ئامانجێکی باشیان هەیەو، لەسەردەمی پێش ئیسلام (ڕۆژگاری نەفامیی)دا بەستراون، فەرموویەتی:

(لا حِلْفَ في الإسلام وأَيُّما حِلْفٍ كان في الجاهلية، لم يَزِدهُ الإسلام إلاّ شِدَّةً) رواه مسلم: ٢٥٣، وأحمد: ٦٩١٧ وأبو داود : ٢٩٤٥.



واتە: پەیمان بەستن لە ئیسلام دانیەو،[1] هەر پەیمانێك لە ڕۆژگاری نەفامیی دا بووبێ، ئیسلام هەرپتەوتری دەکات.

**ئیشکالی دووەم: هەبووانی چەند فەرموودەیەك، کە هاوپەیمانێتیی قەدەغە دەکەن:**

پێش وەڵامدانەوەی ئەم ئیشکالە بە چاکی دەزانم دووان لەو جۆرە فەرموودانە بێنین:

١- (لا حِلْفَ في الإسلام، وأَيُّما حِلْفٍ كان في الجاهلية لم يَزِدْهُ الإسلام إلاّ شدَّةً) رواه مسلم: ٢٥٣.

---

(١) دوایی باسی دەکەین:مەبەست پەیمان بەستنی ناڕەوایە، وەك هی سەردەمی نەفامیی کە بۆ ئامانجی ناڕەواو ستەمکارانە دەبەسترا.

٢- (أوفوا بِحِلْف الجاهلية فإِنَّ الإسلام لم يَزِدْهُ إلاّ شِدَّةً، ولا تُحْدِثوا حِلْفاً في الإسلام) أخرجه أحمد: ٦١٣٣، والترمذي: ١٥٨٥ وابن جرير: ٩٢٩٥، وقال الترمذي: حديث حسن صحيح.

واتە: پەیمانی سەردەمی نەفامیی جێ بەجێ بکەن، چونکە ئیسلام هەر پتەوتری کردوە، بەڵام لە ئیسلام دا هیچ پەیمانێك پەیدا مەکەن.

لە وەڵام دا دەڵێین:

هەرچەندە ڕواڵەتی ئەم دوو فەرموودەیە، ئەوە دەگەیەنێ کە هەر جۆرە پەیمان بەستنێك و، هەموو جۆرە هاوپەیمانێتیی (تحالف) یێك لە ئیسلامدا، قەدەغە بێ! بەڵام بێگومان ئەو جۆرە تێگەیشتنە ڕواڵەتییە، لەم دوو فەرموودەیەو هاوشێوەکانیان، هەڵەیە، چونکە چەندان ئایەتی خوا -سبحانه وتعالى- و فەرمایشتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، زۆر بە ڕوون و ڕاوشکاویی، باسی ڕەوایی پەیمان پێکەوە بەستن (تعاقد)و، هاوپەیمانێتیی (تحالف)یان کردوەو، فەرمانیشیان کردوە بە: وەفاداریی بە بەڵێن و پەیمان و جێبەجێکردنی و، هەڕەشەشیان کردوە، لە کەسێك، یان لایەنێك کە پەیمان دەشکێنێ و نایگەیەنێتە سەر!

ئنجا وێڕای ئەوەش: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) — وەك پێشتر باسمان کرد- چەندان جۆرە هاوپەیمانێتیی لەگەڵ چەندان جۆرە لایەندا بەستوون و، هەتا کۆتاییش پێیانەوە پابەند بووە، مەگەر بەرانبەرەکانی شکاندبیان و غەدریان کردبێ.

ئەمەش چەند ئایەت و فەرموودەیەك، لەبارەی ڕەوایی پەیمان بەستن و، گرنگیی و پێویستیی پێوە پابەند بوونییەوە:

١- ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَوۡفُواْ بِٱلۡعُقُودِۚ ...﴿١﴾﴾ المائدة.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! پەیمانەکان جێبەجێ بکەن.

وشەی (عقود) کۆی (عَقْد)ە، ئەمیش بەمانای (عَهْد)ە هەردووکیشیان لەزمانی کوردییدا، بە مانای (پەیمان) یان (بەڵێن) دێن، (ابن کثیر) لە تەفسیری (أوفوا بالعقود)دا دەڵێ[(١)]: (قال ابن عباس ومجاهد وغير واحد: يعني بالعقود: العهود، وحكى ابن جرير الإجماع على ذلك، قال : والعهود ما كانوا يتعاهدون عليه من الحِلْف وغيره).



٤٩



واتە: (ابن عباس)و (مجاهد)و غەیری وانیش گوتوویانە: مەبەست لە (عقود)، (عهود)ە، (ابن جرير الطبري) یەکدەنگیی زانایانی لەو بارەوە گێڕاوەتەوە، (عهود)یش بریتین لەو پەیمانانەی کە لەنێو خۆیاندا دەیانبەستن، لە هاوپەیمانێتیی و غەیری ئەوەش.

٢- ﴿وَأَوۡفُواْ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ إِذَا عَٰهَدتُّمۡ وَلَا تَنقُضُواْ ٱلۡأَيۡمَٰنَ بَعۡدَ تَوۡكِيدِهَا ... ﴿٩١﴾﴾ النحل.

واتە: ئەو سوێندانەی کە بۆ تەئکید کردنەوەی پەیمان، خواردووتانن، هەڵیانمەوەشێننەوە.

٣- ﴿وَٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهۡدَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ مِيثَٰقِهِۦ وَيَقۡطَعُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيُفۡسِدُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱللَّعۡنَةُ وَلَهُمۡ سُوٓءُ ٱلدَّارِ ﴿٢٥﴾﴾، الرعد.

---

(١)) بڕوانە (المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير)، ص ٣٤٩.

واتە: ئەوانەی کە پەیمانی خوا، پاش پتەوکردنی، هەڵدەوەشێننەوەو، ئەوەی کە خوا فەرمانی پێکردوە بگەیەنرێ، دەیپچڕێنن و، خراپەکاریی لە زەویدا دەکەن، ئەوانە نەفرینی خوایان لێیەو، خراپترین مەنزڵگایان جێیە.

٤- هەروەها پێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم) لەوبارەوە فەرمایشتی زۆرن، بۆ نموونە: لە یەکێك لە فەرموودەکانی دا بێ بەڵێنیی و پەیمان شکێنیی، بە یەکێك لە نیشانەو خەسڵەتەکانی بابای مونافیق دادەنێ، وەك فەرموویەتی: ((آية المنافق ثلاثٌ: إذا حدَّث كَذَب، وإذا وَعَدَ أخْلَفَ، واذا أتُمِنَ خان[1]، وفي رواية: وإذا عاهَدَ غَدَرَ، وإذا خاصم فجر))[2]، واتە: نیشانەکانی مونافیق سێن: ئەگەر قسەی کرد درۆ دەکات و، ئەگەر بەڵێنیدا دەیشکێنێ و، ئەگەر سپاردەی پێ سپێردرا، ناپاکیی تێدا دەکات.



لە ڕیوایەتێکی دیکەدا هاتوە: (ئەگەر پەیمانی بەست دەیشکێنێ و، ئەگەر ناکۆکیی هەبوو (لەگەڵ کەسێکدا) تاوان دەکات).

کەواتە:

مادام ئەو هەموو ئایەت و فەرموودانە لەسەر گرنگیی پەیماندان و هاوپەیمانێتیی و، خراپیی و دزێویی پەیمانشکێنیی و بێ بەڵێنیی هەن و، پێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم) بە کردەوە، ئەو هەموو جۆرە هاوپەیمانێتیی و ڕێککەوتنانەی (التحالفات و

---

(١) رواه البخاري: ٣٣.

(٢)رواه البخاري: ٣٤، ومسلم: ٥٨.

الإتفاقيات)ی لەگەڵ چەندان جۆرە لایەندا کردوون، بەهیچ ڕەنگێك ناگونجێ ئەو ماناو چەمکە ڕواڵەتییەی، لەو دوو فەرموودەیە - کە پێشتر هێنامانن - وەردەگیرێ، مەبەستی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بووبێ، چونکە ناگونجێ پێغەمبەری خوا، پێچەوانەی قورئان و پێچەوانەی کردەوەی خۆیشی قسە بکات!

کەواتە:

باسەرنجی قسەو هەڵوێستی زانایانی ئیسلام بدەین: داخۆ لەبارەی ئەو دوو فەرموودەیە و هاووێنەکانیانەوە، چییان گوتوە، ئەو دژیەکیی (تناقض)یە ڕواڵەتییەی ئاماژەمان پێکرد - کە لەنێوان ئەو فەرموودانە و ئایەتەکانی خواو هەڵوێستی کردەیی پێغەمبەردا هەیە - چۆنیان چارەسەر کردوە؟



سەرەتا باقسەو هەڵوێستی یەکێك لە هاوەڵان کە (أَنس بن مالك)ە، خوا لێی ڕازی بێ، لەوبارەوە بخەینە ڕوو:

((عن عاصم الأَحول قال: قلت لأَنس بن مالك: أَبَلَغَك أَنَّ النبـيَّ (صلى الله عليه وسلم) قال: ((لاحِلْفَ في الإِسلام))؟ فقال: قد حالَفَ النبـيُّ (صلى الله عليه وسلم) بين قريشٍ والأنصار في داري)) رواه البخاري، برقم: ٢١٧٢.

واتە: (عاصم الأَحول) دەڵێ: بەئەنەسی کوڕی مالیکم گوت: پێت گەیشتوە کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: ((پەیمان بەستن لە ئیسلامدا نیە))؟! گوتی: پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە ماڵەکەی مندا پەیمانی لەنێوان قورەیش و پشتیوانانیدا بەست!

ئاشکراشە مەبەستی ئەنەس خوالێی ڕازی بێ، لەو پەیمانە، برایەتیی و پەیمانی نێوان کۆچکەران و پشتیوانان (المهاجرون والأنصار)ە، کە کۆچکەران زۆربەی هەرەزۆریان لەهۆزی قورەیش بوون.

مەبەستی ئەنەسیش لەو وەڵامە ئەوەیە، کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هەموو جۆرە پەیمان بەستن و هاوپەیمانێتییەکی قەدەغە نەکردوە، بە بەڵگەی ئەوە، کە خۆی لەنێوان کۆچکەرانی مەککە و پشتیوانانی مەدینەدا، پەیمانی بەستوە! ئنجائێمە بەر لەوەی قسە و شیکردنەوەی زانایان لەوبارەوە بەدرێژیی بخەینەڕوو، پوختەکەی دەخەینەڕوو و دەڵێین:

زانایان گوتوویانە:

چۆنیەتی پێکەوە کۆکردنەوەو گونجاندنی ئەو ئایەت و فەرمایشتانە ئەوەیە، کە:

مەبەست لە هاوپەیمانێتیی و پەیمان بەستنی قەدەغەکراو، ئەو جۆرەیە کەلەسەر ناهەق بێ و، پێچەوانەی شەریعەت بێ و، مەبەست لەهاوپەیمانێتیی و پەیمان بەستنی ڕەواش، ئەوەیە کە لەبازنەی شەریعەت دەرنەچێت، وەك چەسپاندنی دادگەریی و یارمەتییدانی ستەملێکراو و، هێنانەدی بەرژەوەندییەکی ڕاست و ڕەوا.

ئنجا باسەرنجی قسەو شیکردنەوەی، سێ لەزاناو پێشەوایانی ناودارمان بدەین، لەوبارەوە:

یەك: (النووي) خوا لێی خۆشبێ لەوبارەوە گوتوویەتی[1]:

---

(١) شرح صحيح مسلم، ج١٦، ص(٨١-٨٢).

(قال القاضي: قال الطبري: لايجوز الحلف اليوم، فإن المذكور في الحديث، والموارثة به وبالمؤاخاة، كُلّه منسوخ، لقوله تعالى: ﴿... وَأُوْلُواْ ٱلْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَىٰ بِبَعْضٍ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِ ...﴿٦﴾ الأحزاب﴾، وقال الحسن: كان التوارث بالحلف، فَنُسِخَ بآيةِ المواريث، قلت: أمّا مايتعلَّقُ بالإرثِ، فَيُسَتَحبُّ فيه المخالفة عند جماهير العلماء، وأما المؤاخاة في الإسلام والمُحالَفَةَ على طاعة الله تعالى، والتناصر في الدين، والتعاون على البرِّ والتَّقوى، وإقامة الحق، فهذا باقٍ لم يُنْسَخْ، وهذا معنى قوله في هذه الأحاديث: ((وأَيُّـما حلفٍ كان في الجاهلية لم يَزِدْهُ الإسلام إلاّشِدَّةً))، وأما قوله: ((لاحِلْفَ في الإسلام)) فالمراد به: حِلْفُ التوارثِ، والحِلْفُ على مامنع الشرع منه، والله أعلم).



واتە: قازیی گوتوویەتی: (طبري) دەڵێ: لەم ڕۆژگارەدا هاوپەیمانێتیی دروست نیە، چونکە ئەوەی کە لە فەرموودەکەدا باسکراوەو، میرات پێگرتنی و، میرات گرتن بەبرایەتیی، هەمووی نەسخ کراوەتەوە، چونکە خوای بەرز فەرموویەتی: [خزمان لە کتێبی خوادا بۆ یەکدی، لە خەڵکی دیکە لە پێشترن] (حەسەن[1])یش گوتوویەتی: میرات گرتن کاتی خۆی بەهاوپەیمانێتیی بوو، بەڵام بەئایەتی میراتەکان، لابرا، منیش دەڵێم: ئەوەی کە پەیوەستە بە میراتەوە، لەلای جەماوەری زانایان واپەسندە سەرپێچیی پەیمانە پێشووەکەی، تێدا بکرێ، بەڵام برایەتیی ئیسلامیی و هاوپەیمانێتیی، لەسەر فەرمانبەرییکردنی خوای بەرزو، پشتی یەکدی گرتن لە دینداریيدا و، هاوکاریی لەسەر چاکەو پارێزکاریی و، بەرپاکردنی هەق، ئەوە بەردەوامە و لانەبراوە، ئەمەش مەبەستە بۆ قسەکەی لەم فەرموودانەدا: [هەر پەیمانێك لە سەردەمی نەفامێتییدا بووبێ، ئیسلام

---

(١) مەبەست حەسەنی بەصرِاییە، خوا لێی ڕازی بێ.

هەر پتەوتری کردوە]، بەڵام ئەوە کە دەڵێ: [هاوپەیمانێتیی لە ئیسلامدا نیە] ئەوە مەبەست پێی پەیمانی میراتگرتن و، پەیمانە لەسەر هەرشتێك کە شەریعەت، ڕێی لێگرتوە، خواش زاناترە)).

دوو: (إبن حجر العسقلاني)یش خوا لێی خۆشبێ لەوبارەوە گوتوویەتی[1]:

(وتَضَمَّن جوابُ أَنسٍ: إِنكارَ صَدْرِ الحديث، لأن فيه نفي الحِلْفِ، وفيما قالَهُ هو إِثباتُهُ، ويمكن الجمعُ بأن المنفيَّ: ماكانوا يعتبرونه في الجاهلية من نصر الحليفِ ولوكان ظالِماً، ومن أَخْذِ الثأر من القبيلة، بسبب قتل واحِدٍ منها، ومن التوارث ونحو ذلك، والمُثْبَتُ هو ماعدا ذلك، من نصر المظلوم والقيام في أمرِ الدِّين ونحو ذلك، من المُسَتَحبّات الشرعيَّة، كالمصادقةِ والموادة وحفظ العهد).



واتە: وەڵامەکەی ئەنەس نکوولّییکردنی سەرەتای فەرموودەکەی گرتۆتەخۆی[2]، چونکە لەوێدا هاوپەیمانێتیی لابراوە، بەڵام ئەوەی ئەو (واتە: ئەنەس) گوتوویەتی: چەسپاندنی هاوپەیمانێتییە!

دەشگونجێ هەردووکیان کۆبکرێنەوە، بەوە کە بگوترێ: ئەوەی لابراوە، ئەوە بووە کەلەڕۆژگاری نەفامێتییدا باوبووە، وەك: سەرخستنی هاوپەیمان ئەگەر ستەمکاریش بێ و، وەك تۆڵە ستاندنەوە لەتیرەیەك بەهۆی ئەوەوە کە یەکێك لەتیرەکەی بەرانبەر کوژراوەو، وەك میرات لەیەکدی گرتن و وێنەی ئەوانە، بەڵام چەسپێنراو (لە هاوپەیمانێتیی)

---

(١) فتح الباري شرح صحيح البخاري، ج١٠، ص٥٢٠.

(٢) واتە: نکوولّییکردنی ئەنەس خوالێی ڕازی بێ، لەوە کە ئەو قسەیە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کردبێتی، نەك نکوولّیی لە ڕاستیی فەرمایشتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، کە دیارە ئەوە کوفرە!

غەیری ئەوانەیە، وەك: یارمەتییدانی ستەمدیدەو، بەڕێوەبردنی كاروباری ئایین و وێنەی ئەوانە، لەوشتانەی كە پەسندیدەی شەریعەتن، وەك برادەرایەتیی و دۆستایەتیی و وەفاداریی)).

سێ: (إبن الأثیر)یش خوا لێی خۆشبێ هەر لەوبارەوە گوتوویەتی[1]:

(أصل الحِلْفِ: المعاقدة والمعاهدة على التعاضُدِ والتساعُدِ والإتِّفاق، فما كان منه في الجاهلية، على الفتن والقتال بين القبائل والغاراتِ، فذلك الذي وردَ النَّهيُ عنه في الإسلام بقوله: ((لاحِلْف في الإسلام)) وماكان في الجاهلية من نصر المظلوم وصلة الأرحام-كحلف المُطَيَّبين وما جرى مجراه- فذلك الذي قال فيه ((وأيّما حلفٍ كان في الجاهلية لم يَزِدْهُ الإسلام إلاّشِدَّةً)) يريدُ من المعاقدة على الخير ونُصْرة الحق، وبذلك يَجتمِعُ الحديثان، وهذا الحلف الذي يقتضيه الإسلامُ، والممنوعُ منه، ما خالَفَ حكم الإسلام..).



واتە: [وشەی (حلف) لە بنەڕەتدا یانی: گرێبەست و پەیماندان لەسەر پشتگیریی و هاوكاریی و ڕێككەوتن، ئنجا ئەوەی كە لە ڕۆژگاری نەفامێتییدا لەسەر ئاژاوەو كوشتارو ڕاووڕووتی نێوان تیرەكان بووبێ، ئەوە ئەو جۆرەیە كە لە ئیسلامدا قەدەغەكراوە بە فەرموودەی: (هاوپەیمانێتیی لە ئیسلامدا نیە)، بەڵام ئەوەی كە لە ڕۆژگاری نەفامێتییدا، بۆ یارمەتییدانی ستەملێكراوو گەیاندنی پەیوەندیی خزمایەتیی بووبێ -وەك پەیمانی بۆنخۆشكراوان هاووێنەی وی- ئەوە ئەو جۆرەیە كە لەبارەیەوە فەرموویەتی: (هەر هاوپەیمانێتییەك لە نەفامێتییدا بووبێ، ئیسلام هەر پتەوتری كردوە) كەمەبەستی پەیمان بەستنە لەسەر چاكە و سەرخستنی هەق، بەمەش

---

(١) النهاية في غريب الحديث والأثر، ج١، ص(٤٢٤-٤٢٥).

هەردووك فەرمایشتەكە، كۆدەبنەوە (واتە: دژی یەك نابن، وەك بە ڕواڵەت وایە[1])، ئەم جۆرە هاوپەیمانێتییەشە، كە ئیسلام دەیخوازێ و، ئەوەش كە ڕێی لێگیراوە، بریتیە لەوە كە پێچەوانەی حوكمی ئیسلام بێ].

بەڕێزان! پێم وایە پاش ئەم برە توێژینەوەیەش، لەبارەی چەند فەرموودەیەكەوە كە ڕواڵەتەكەیان قەدەغەكردنی هاوپەیمانێتیی (تحالف) بەشێوەیەكی ڕەهاو بە گشتی دەگەیەنن، باش باش ڕوونبۆوە كە مەبەستی ڕاستەقینەی ئەو فەرموودانە، شتێكی دیكەیە، كە بریتیە لە: قەدەغەكردن و ڕێ لێگرتنی ئەو جۆرە هاوپەیمانێتیی و ڕێككەوتنانە، كەلەسەردەمی نەفامێتییدا، لەپێناو ئامانج و مەبەستی خراپ و ناشەرعییانەدا دەبەستران، ئەگەرنا پەیماندان و ڕێككەوتن بەمەبەستی هێنانەدی ئامانجی ڕاست و ڕەواو شەرعیی، نەك هەر هیچ ئیشكالێكی تێدا نیە، بەڵكو وەك هەر بابەتێكی دیكەی بواری عادەت و هەڵس و كەوتەكان (العادات والمعاملات) لە ئەسڵدا ڕەوا (مُباح)یەو، جاری واش هەیە حوكمەكەی دەگۆڕێ بۆ پەسندیی (إستحباب)و، بگرە پێویستیی (وجوب)یش، بەپێی بنچینەی شەرعیی: (ما لایتم الواجب الاّ به فهو واجب): هەرشتێك فەرزێك پەكی لەسەری كەوت فەرزە، بنچینەی: (للوسائل حكم المقاصد): ئامرازەكان حوكمی ئامانجەكانیان هەیە.



---

(١) ئەوەی نێوان دووكەوانەكە خۆم زیادم كردوە، بەمەبەستی ڕوونكردنەوەی واتا.

# بەشی دووەم

# بەشدارییکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا
# هەڵسەنگاندنێکی شـەرعییانەو ژیرانە

## پێشدەستیی

خوێنەری بەڕێز!

ئەم بابەتەی بەردەستت لێکۆڵینەوەیەکە، لەبارەی ڕەوایی و ناڕەوایی بەشدارییکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا (واتە: پەرلەمانێك کە دەگونجێ بڕیارو یاسای ناشەرعیی تێدا دەربکرێن) کاتی خۆی لە دوو ئاڵقەی بەرنامەی (سەرنج)ی کەناڵی ئاسمانیی (پەیام)دا پێشکەشکراون، لەسەر شێوەی وتووێژو پرسیارو وەڵام، لەنێوان بەڕێز کاك (عمر عبدالله گوڵپی)و بەندەداو، پاش هێنرانە سەر کاغەزیان و،[1] پێداچوونەوەو چاوپێداگێڕانەوەی خۆم، بەم شێوەیەی ئێستای لێهاتوە.



شایانی باسیشە: ناوو نیشانی باس و خواسەکانی ئەم بابەتە، بەم شێوەیەن:

باسی یەکەم: بەڵگەکانی ئەوانەی بەشداریی کردن لە هەڵبژاردن و پەرلەمان دا، بە ناڕەوا دەزانن و، بەرپەرچدانەوەیان.

دەستپێك

سێ ڕوونکردنەوەی پێویست.

١- بەڵگەکانی ڕەوایی هەڵبژاردن

٢- بەڵگەکانی ئەوانەی بەشدارییکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەمان دا بە ناڕەوا دەزانن.

---

(١) لەلایەن چەند برایەکی کەناڵی ئاسمانیی (پەیام)ەوە، خوا پاداشتیان بداتەوەو وێنەیان زۆر بکات.

٣- هەڵسەنگاندن و هەڵوەشاندنەوەی ئەو بەڵگانە بۆ ئیسپاتی ناڕەوایی بەشدارییکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەمان دا،دەهێنرێتەوە.

باسی دووەم: بەڵگەکانی ڕەوایی بەشدارییکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەمان

دەستپێك

پێنج جۆرە بەڵگە لەسەر ڕەوایی بەشدارییکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەمان دا.

هیواداریشم خوای بەزەیی بێ سنوور -سبحانە وتعالی- بیگێڕێ بەمایەی زیاتر بەرچاو ڕوونبوونەوەی خوشك و برایانی مسوڵمانمان و، لاچوونی هەرجۆرە تەم ومژو ئیشکالێك، کە لەوبارەوە هەیانبووبێ.

## دەستپێك

بەڕێزان!

لەم ئاڵقەیەی بەرنامەکەماندا باس لە ڕەوایی و ناڕەوایی بەشدارییکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا دەکەین، بە تایبەت کە لەم کاتانەدا قسە و باس لەسەر ڕەوایەتیی و ناڕەوایەتیی بەشدارییکردنی هەڵبژاردنەکان و پەرلەماندا، لەلایەن هەندێك لەو کەسانەوە دروست دەبێ، کە لە چوارچێوەی ئیسلامییەکاندا، بیروبۆچوونی جیاوازیان هەیە.



+ بەڕێز مامۆستا! وەك دیارە لەم کاتانەدا بیر وبۆچوونێك هەیە، کە لە چوارچێوەی پرسیار لەسەر ڕەوایەتیی هەڵبژاردن و بەشدارییکردن لە پەرلەماندا، خۆی دەبینێتەوە، لێرەدا دوو بۆچوونی سەرەکیی هەن:

أ- بۆچوونێك پێی وایە: بەشدارییکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا ناڕەوایە، خاوەنی ئەم بۆچوونەش هێندێك ئایەت و فەرموودە و قسەی زانایانیش بە بەڵگە دەهێنێتەوە.

ب- بۆچوونێکی دیکەش هەیە کە بە پێچەوانەوە، پێی وایە: بەشدارییکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا، نەك گرفتێك نیە، بەڵکو هێندێك جار بە واجیبشی دەزانن، بەڵگەشیان لە قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)و بۆچوونی زانایانی هاوچەرخ هەیە، ئێمە لەم وتووێژەدا پشت بە خوا، پرسیارەکانمان لەو چوارچێوەیەدا دەخولێنەوە.

جا بەڕێز مامۆستا! سوپاست دەکەین کە دەرفەتمان ئەدەی و ئەمجارە تەشریفت هێنا بۆ ستۆدیۆی بەرنامەی سەرنج.

- بسم الله الرحمن الرحيم، الحمد لله، وصلى الله تعالى وسلم وبارك على رسول الله محمد وآله وصحبه ومن اهتدى بهداه.

منيش خۆشحاڵم بە دیدارتان و لە خزمەتدام.

+ سەرەتا لە پێناسەی هەڵبژاردن و پەرلەمانەوە دەستپێدەکەین، پاشان دێینە سەر تەوەرەکان، بەڕێزت وەك بیریار و نووسەر و ڕۆشنبیرێکی ئیسلامیی، چۆن پێناسەی ئەم دوو چەمکە دەکەی، مەبەستم هەریەکە لە هەڵبژاردن و پەرلەمانە، بەشێوەیەکی گشتی؟

## سێ ڕوونکردنەوەی پێویست

- بەباشی دەزانم بەرلەوەی پێناسەی هەڵبژاردن و پەرلەمان بکەین، سێ ڕوونکردنەوەی کورت بخەمەڕوو، بۆ زیاتر بەرچاوڕوونیی هەموو لایەك:

١- زانایانی پێشین ڕەزا و ڕەحمەتی خوایان لێبێ، کەم و زۆر دەربارەی هەڵبژاردن، بەو فۆڕم و شێوەیەی کە ئێستا هەیەو، دەربارەی پەرلەمان قسەیان نەکردوە، چونکە واقیعێکی وەك ئەوەی ئەمڕۆ، ئەوکاتە لە ئارادا نەبووە، لەبەر ئەوە هەر کەسێك لە قسەی زانایانی پێشین بگەڕێ، بۆ ڕەوایی یان ناڕەوایی بەشدارییکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا، شتێکی ڕاستی نەکردوە.

٢- بەشدارییکردن لە پەرلەماندا، کە ئایا دروستە یان نا؟! مەبەستیان پێی پەرلەمانێکە کە زۆرینەی خەڵکەکەی نامسوڵمان بێ، یان خۆی پابەند نەکردبێ بە شەریعەتەوە، ئەگەرنا ئەنجوومەنێکی ڕاوێژ، یان پەرلەمان، یاخود ئەنجوومەنی نوێنەران، کە ئەمانە هەموویان ناون بۆ یەك نێوەڕۆك، واتە: ئەوانەی کە نوێنەری خەڵکن، هەموو زانایان و شەرعزانانی هاوچەرخ و هی پێشینیش، لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە مسوڵمانانی نێو هەر قەوارەیەکی ئیسلامیی، بەڵکو هەر کۆمەڵێکی ئیسلامیی، پێویستە نێوەندێکی بڕیاریان هەبێ و، نێوەندێکی یاسادانانیان هەبێ، کە پێکهاتبێ لە کەسانێك کە خەڵك هەڵیان دەبژێرێ، ئەویش وەك بەرجەستەکردنی ئایەتی خوای پەروەردگار کە دەفەرموێ:

﴿... وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ... ﴿٣٨﴾﴾ الشورى.

واتە: کاروباری مسوڵمانان لەنێو خۆیاندا بە ڕاوێژە.

ئنجا ئەو ڕاوێژە دەگونجێ ڕاوێژی ڕاستەوخۆ بێ و، هەموو خەڵك كۆبكرێتەوەو پرس و ڕاوێژیان پێبكرێ، وەك لە یۆنانی قەدیمدا هەبووە، دەشگونجێ ڕاوێژپێكردنی ناڕاستەوخۆ بێ، كە نوێنەرانیان كۆببنەوە لە ئەنجوومەنێكدا، كەواتە: پێویستە ئەوە بزانرێ ئەو مشتومڕەی هەیە لەنێو زانایانی هاوچەرخدا بۆ پەرلەمانێكە كە لە بڕیاردان و یاسا دەركردن دا پابەند نیە بە شەریعەتەوە.

٣- ڕوونكردنەوەیەكی دیكەشم ئەوەیە كە كاتی خۆی لە گەرمەی هەڵبژاردنەكانی ساڵی (١٩٩٢)ز دا، كە ئەوكاتیش ئێمە لە هەڵبژاردنەكان دا هەر بەشداربووین و، هیچ كام لەو هەل ومەرجانەی ئێستاش لە ئارادا نەبوون، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوە كە ئێمە قەناعەتمان بەوە بووە كە بەشداری ئەو پرۆسەیەببین، ئنجا من ئەو كاتە كتێبێكم نووسی بە ناوی: (چارەسەری كێشەی كورد لە نێوان ئیمان و پەرلەماندا)، كە ئێستا هەندێك كەس، هەندێك قسەی ئەو كتێبە، بە بەڵگە دێننەوە، لەسەر ئەوە كە ئێمە هەڵوێستی ئێستامان جیایە لە هی ئەوكاتە! هەڵبەتە ئینسان ئەگەر چاو بە هەندێ هەڵوێست و بیروبۆچوونی خۆیدا بگێڕێتەوە، هیچ خراپەیەكی تێدا نیە، بەڵكو ئازایەتیی ئەوەیە كە ئەگەر ئینسان هەڵەیەكی كردبێ، دانی پێدا بنێ و ڕاستی بكاتەوە، بەڵام بەڕاستیی ئەوەی كە لەوێدا گوتراوە، دەربارەی بەشدارییكردنمان لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا، لەگەڵ ئەوەی كە ئێستا دەیڵێین، جیاوازییەكی ڕیشەیی نیە، بەڵێ لە هێندێك تەعبیر و شێوازی دەربڕیندا، جیاوازیی هەیە، بەڵام جیاوازیی ڕیشەیی نیە، چونكە لەوێشدا گوتراوە: كە پەرلەمانێك یاسا دەربكات، یاسایەك كە پێچەوانەی شەریعەت بێ، واتە حەڵاڵێك حەرام بكات، حەرامێك

حەڵاڵ بکات، ئەوە بەتەئکید ئەوکارە بە شیرك و کوفر لەقەڵەم دەدرێ و، ئێستاش هەروا دەڵێین، بەڵام ئایا مسوڵمانانێك کە بەشدار دەبن لە پەرلەمانێکی وادا، بۆ ئەوەی ڕێگا بگرن لەو شیرك و کوفرەو، ڕێگا بگرن لەوەی حەڵاڵێکی خوا حەڕام بکرێ، یان حەڕامێکی خوا حەڵاڵ بکرێ، ئایا دروستە یان دروست نیە؟ دەڵێم: بێگومان نەك هەر دروستە، بەڵکو پێویستیشە، چونکە مەعقووڵ نیە لە نێوەندێکی بڕیاردا‌ندا بە ناوی میللەتێکی مسوڵمانەوە، حەڵاڵ و حەڕامی خوا دەستکاریی بکرێ و بگۆڕرێ، تۆش تەماشاچیی بی و، نەچی بەشداریی بکەی و، ڕێی لێبگری و، قسەی خۆت لەوێدا نەکەی!! وەك گوتم: لە ڕیشە و بنچینەی فیکرەکەدا، ئەوەی کە ئێستا دەیڵێین، ئەوکاتەش هەر وامانگوتوە[1]، بەڵام دیارە شێوازی تەعبیر لەگەڵ هی حەڤدە (١٧) ساڵ پێش ئێستا دەگۆڕێ.[2]



-----------------------

(١) لەکۆتایی لێکۆڵینەوەدا لەوبارەوە گوتوومە: {کەواتە: ئەو مسوڵمانەی کە دەچێتە پەرلەمانێکەوە، تاکو لەوێدا ئەرکی بانگەوازکردنی خەڵکی بۆلای خوا، یان ئەرکی فەرمان بەچاکەو ڕێگرتن لەخراپە، ئەنجام بدات، ئومێد وایە نەك هەر گوناهبار نەبێ، بەڵکو بەئەندازەی ئیخلاص و پەرێزی چاکیی، خێرو پاداشتیشی بۆ بنووسرێ...}.

بڕوانە: (چارەسەری کێشەی کورد لەنێوان ئیمان و پەرلەماندا) لاپەڕە: ٤٥، چاپی یەکەم: ١٩٩٢.

(٢) ئێستا: ٢٠٢٠/٣/١٦ ز، بیست و نۆ (٢٩) ساڵ بەسەر ئەوکاتەدا تێپەڕبووە.

## ١- بەڵگەکانی ڕەوایی هەڵبژاردن

بۆ سەلماندنی ڕەوایی هەڵبژاردن و بەشداریی لە پەرلەماندا، سەرەتا پێناسەی هەڵبژاردن دەکەین و، هاوکات وەك بەڵگەی یەکەمیش دەڵێین:

١) هەڵبژاردن (إنتخاب) چ بۆ ئەنجوومەنی نوێنەران بێ، لەسەر ئاستی وڵاتێك وەك عێراق، چ بۆ هەڵبژاردنی پەرلەمانێك یاخود ئەنجوومەنی نوێنەران بێ، لەسەر ئاستی هەرێمێك، چ بۆ ئەنجوومەنی پارێزگا بێ و، چ بۆ ڕێکخراوێکی پیشەیی بێ، وەك: قوتابیان، ئەندازیاران، پزیشکان، مامۆستایان، هەموو ئەو هەڵبژاردنانە، دەچنەوە نێو ئایەتی خوای پەروەردگارەوە کە دەفەرموێ:

﴿... وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ... ﴿٣٨﴾﴾ الشورى .

واتە: کاروباری مسوڵمانان بە ڕاوێژە.

واتە: بۆ خۆیان ڕاوێژ و مەشوەرەت دەکەن و، سەرەنجام دەگەنە ئەوەی کە هەندێك کەس بکەنە نوێنەری خۆیان، کەواتە: لەپێناسەی هەڵبژاردنەوە، بۆمان دەردەکەوێ: کە نەك هەر شتێکی ڕەوا، بگرە پێویستیشە، یانی: بەشداریی لە هەڵبژاردندا، بۆ دیارییکردنی نوێنەرو مشوورخۆران، ئەرکێکی شەرعییە، ئەوە بەڵگەی یەکەم.

٢) هەموو دواندنەکانی قورئان (خطابات القرآن)، بۆ کۆمەڵگای مسوڵمانی یەکەم، بە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ...﴾ دەستپێدەکەن لە قۆناغی مەدینەدا، واتە: لە قۆناغی مەدینەدا کە قۆناغی دروستبوونی

کیان و قەوارەیە، خوا (سبحانە وتعالی) بەگشتیی مسوڵمانانی بانگکردوە، کەواتە: مسوڵمانان بەگشتیی بەرپرسیارن بەرانبەر بە کۆمەڵگای خۆیان و، بەرانبەر بە دین و ژینی کۆمەڵگەکەیان و، پێویستە هەموویان لە خەمی ئیدارەکردن و بەڕێوەبردنی وڵات دا بن، ئنجا دیارە ناشکرێ هەموویان سەرۆك، یان وەزیر، یان نوێنەر بن، بۆیە بەناچاریی دەبێ پەنا بەرنە بەر هەڵبژاردن.

٣) ئەگەر تەماشای سیرەی پێغەمبەر (محمد (صلى الله عليه وسلم)) بکەین، دەبینین ئەویش هەر وایکردوە، بۆ وێنە:

أ- لە پەیمانی عەقەبەی دووەمدا کە حەفتا و پێنج (٧٥) کەس لە یەسریبییەکان بەشدار بوون، پەیمانیان بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)دا، کە وەك حوکمڕان و بەرپرسیان بچێ بۆ مەدینە، حەفتا و سێ پیاو و دوو ئافرەت بوون، ئنجا دوای ئەوە کە بەڵێن و پەیمانی پێ دەدەن، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:[1] {أخرجوا اليَّ منكم اثني عشر نقيباً، ليكونوا على قومهم بـما فيهم}، واتە: لەنێو خۆتاندا دوادزە (١٢) نوێنەر (نەقیب)م بۆ هەڵبژێرن، بۆئەوەی ئەوان سەرپەرشتیاری قەومەکەیان بن، واتە ئەو دوازدە کەسە، هەر کامێکیان سەرپەشتیاری تیرەیەك، یان کۆمەڵێك لەو خەڵکە دەکا، کە مسوڵمان بوون.

ب- هەروەها لە ڕووداوێکی دیکەی ژیانی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) - کە بەسەرهاتی دیلەکانی هۆزی (هوازن)ە، دوای

---

(١)) رواه الطبراني في (الكبير)، والذهبي في (تأريخ الإسلام)، وابن سيد الناس في (عيون الأثر)، و السيرة النبوية لابن هشام، ج١، ص(٢٢٨-٢٢٩).

جەنگی حونەین- فەرموویەتی: بگەڕێنەوە با نوێنەرانتان ئەو ڕایەمان بۆ دەرببڕن: (فارجعوا حتى يرفع إلينا عُرفاؤُكم أمرَكم)[1].

٤) ئنجا با لە ڕووی فیقهییەوە تەماشا بکەین: هەڵبژاردن یانی چی؟ بێگومان هەڵبژاردن ئەوەیە کە خەڵکێك دەچێ دەنگدەدا تاکو کەسانێك ببنە نوێنەری و، بچنە پەرلەمان و ئەنجوومەنێکەوە و، لەوێ بڕیار بدەن و یاسای بۆ دەربکەن، ئنجا ئایا هەڵبژاردن لە ڕووی فیقهییەوە دەبێتەوە بە چی؟ دەڵێین: دەبێ بە شایەدییدان، خوای (سبحانه وتعالى) لە ئایەتی (٢٨٢)ی سوورەتی (البقرة)دا لەوبارەوە کە پێویستە کەسێك کە شایەدییەکی لەلایە، هەرکات پێویست بوو، بچێ بۆ شایەدیی دان، فەرموویەتی:

﴿... وَلَا يَأْبَ ٱلشُّهَدَآءُ إِذَا مَا دُعُواْ ...﴾ (٢٨٢)



واتە: شاهیدەکان کاتێك بانگدەکرێن، با مانیع نەبن لەوەی کە بچن.

واتە: کاتێك یەکێك بانگدەکرێ بۆ شایەدییدانێك، پێویستە بچێ، دەجا ئەوکەسەی کە دەچێ هەڵدەبژێرێ، لەڕاستییدا دەنگدانەکەی

---

(١) بڕوانە: (البداية والنهاية)، ج٤، ص٤١٠، پوختەی ئەو ڕووداوەش ئەوەیە کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پاش جەنگی حونەین و گرتنی دەستکەوتێکی زۆرو، پاشان مسوڵمان بوونی هۆزی (هوازن) سەرپشکی کردن لەنێوان: هاوسەرو منداڵەکانیاندا، کە بەدیل گیرابوون و، ماڵ و سامانەکانیان، کە بیانداتەوە، ئەوانیش داوای هاوسەرو منداڵەکانیان کردەوە، ئنجا کاتێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) داوای لەسوپایەکەی کرد کە دیلەکانیان بۆ ئازاد بکەن و، زۆربەیان گوتیان: ڕازین، فەرمووی: {إنا لاندري من أَذِنَ منكم مِمَّن لم يأذن، فارجعوا حتى يرفع إلينا عُرفاؤكم أمركم}، واتە: ئێمە نازانین کێتان ڕازییەو کێتان ناڕازییە، بگەڕێنەوە با عەریفەکانتان هەڵوێستتانمان بۆ بەرز بکەنەوە.

بەوە کە: فڵان کەس با نوێنەرم بێ، یان ئەگەر لیستی داخراو بێ، با فڵان حیزبە نوێنەرەکانی من دیاریی بکات، واتە: شایەدیی دەدات کە ئەو نەفەرانە شایستەی ئەوەن بڕیاربەدەست بن و، نوێنەری خەڵك بن و سەرپەرشتیاری خەڵك بن، کەواتە: ئەوە شایەتییدانەو، خوای پەروەردگارییش فەرمانی کردوە: ﴿... وَلَا يَأْبَ ٱلشُّهَدَآءُ إِذَا مَا دُعُواْ ...﴿٢٨٢﴾﴾ شاهیدەکان کاتێك بانگدەکرێن بۆئەوەی شایەدییبدەن، با سەرپێچیی نەکەن.

هەروەها لە ئایەتی ژمارە (٢٨٣)ی سوورەتی (البقرة)دا، دەفەرموێ: ﴿... وَلَا تَكْتُمُواْ ٱلشَّهَـٰدَةَ ۚ وَمَن يَكْتُمْهَا فَإِنَّهُۥٓ ءَاثِمٌ قَلْبُهُۥ ...﴾، واتە: شایەدییدان مەشارنەوە، (واتە: تۆ دەزانی کە فڵان کەس شایستەیە، ئەوە شایەدییەکە لەلای تۆ، ئەو شایەدییە مەشارەوە) و هەرکەس بیشارێتەوە، دڵی گوناهبارە.



واتە: لەسەر مسوڵمانان پێویستە بچن شایەدیی بدەن بۆ کەسانێك کە بە شایستەیان دەزانن: نوێنەر و بەرپرسیان بن.

+ کەواتە بەشدارییکردنەکەش واجب دەبێ؟

- بەڵێ فەرز دەبێ، چونکە بنچینەیەکی شەرعییمان هەیە، دەڵێ: «ما لایتم الواجب إلا به فهو واجب»، هەر شتێك فەڕزێك لەسەری پەکی بکەوێ، ئەویش فەڕز دەبێ.

ئنجا ئایا فەڕز نیە کەسانێك هەبن مشوورمان لێ بخۆن؟ بە تەئکید با، چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِى ٱلْأَمْرِ مِنكُمْ ۖ ...﴿٥٩﴾﴾ النساء.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! فەرمانبەریی خوا و فەرمانبەریی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)و هی کاربەدەستانێ کە لە خۆتانن، بکەن، بەڵێ کاربەدەستانی خۆمان دەبێ، خۆمان هەڵیانبژێرین، فەرزە ئێمە کاربەدەستان و مشوورخۆرانێکمان هەبن، کە کاروبارمان بەڕێوە بەرن، ئەوەش نایەتەدی مەگەر بە هەڵبژاردن، ئەگەرنا کەس ئایەتی بۆ نەهاتۆتە خوارەوە کە حوکمڕان بێ و، ئەوی دیکە فەرمانبەر بێ!

پوختەی مەبەست: خوای پەروەردگار مسوڵمانان دەدوێنێ:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡ ... ﴿٥٩﴾ ﴾ النساء

ماناى وایە کۆمەڵگای مسوڵمان لەسەری پێویستە، فەرمانبەریی خوا و پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بکات و، کاربەدەستانێکی هەبن کە بە قسەیان بکات، لە سنووری قورئان و سوننەتدا، کەواتە: واجبە ئێمە کاربەدەستانێکمان هەبن، کە ئەو کاربەدەستانەش پەیدا نابن، بەبێ هەڵبژاردن، کەواتە: ئەو هەڵبژاردنەش دەبێتە فەرز.

٥) ئنجا دەڵێین: بەدیلی ئەوە کە خەڵك نوێنەران و کاربەدەستانی خۆی هەڵبژێرێ، چییە؟ بێگومان دوو شتە:

یەکەم: حوکمی خۆسەپاندن و تاکیی و دیکتاتۆریی.

دووەم: حوکمی میراتیی، یانی، کەسێك دەمرێ کوڕی لەجێی بێ و هەروەها، وەك ئەوەی ئەو خەڵکە مەڕ ومالێت بێ، وەك چۆن کەسێك دەمرێ کوڕەکەی مەڕ و ماڵەکەی بە میرات دەگرێ، ئەو میللەت و خەڵکەش وەك مەڕ و ماڵ تەماشا دەکرێ، بەڵێ سیستمی حوکمڕانیی

ئەگەر شووڕایی نەبێ، یان دەبێ حوكمی میراتیی بێ، وەك ئەو پادشایەتیی و مەلیكایەتییەی كە هەیە، یان دەبێ دیكتاتۆریی و خۆسەپاندن بێ، كێ دەسەڵاتی هەبوو خۆی بسەپێنێ، وەك هەندێك لە شەرعزانان لەژێر كاریگەریی واقعێكیی ناشەرعییدا، بنچینەیەكی غەڵەتیان داناوە، دەڵێن: «من اشتدَّتْ وطأته وجَبَتْ طاعته»، كێ دەسەڵاتی زۆر بێ، پێویستە بە قسەی بكرێ! ئنجا ئەگەر بەو پێیە بێ، دەبوویە مووساش لە قسەی فیرعەون دەرنەچووبا و، ئیبراهیمیش لە قسەی نەمروود دەرنەچووبا و، موحەممەدیش (سەڵات و سەلامی خوا لەسەر هەموویانبێ) لە قسەی ئەبووجەهل و ئەبوو سوفیان و ...هتد دەرنەچووبایە!! كە دیارە ئەوە قسەیەكی پووچە.

## پێناسەی پەڕلەمان

ئایا پەرلەمان چییە؟ بەپێی پێناسەی ئێستا: پەرلەمان ئەو ئەنجوومەنەیە، کە سێ ئەرکی سەرەکیی هەن:

یەك: یاسادانان.

دوو: موافەقەکردن لەسەر پێکهێنانی حکوومەت، پاشان چاودێریی ئەو حکوومەتەو دوایی لێپرسینەوەی وەزیرەکان و سەرۆکی حکوومەت، لەسەر ئەو شتانە کە دەیکەن و تێبینیی لەسەریان هەیە.

سێ: بڕیاردانی بودجەی حکوومەت و وەزارەتەکان و، ئاگاداربوون لە واریداتی دەوڵەت و نەفەقاتی دەوڵەت، چی دێ و، چۆن سەرف دەکرێ؟

ئنجا ئایا ئەگەر کەسێك بچێتە ئەو ئەنجوومەنەوە، بۆ ئەوەی: یاسایەك دەرنەچێ پێچەوانەی شەریعەت بێ، ئەوە حوکمی چییە؟ بێگومان ئەوە واجبە، ئەدی ئەگەر لێ بگەڕێ ئەو ئەنجوومەنە یاسا دەربکات و پێچەوانەی شەریعەتیش بێ و، دوایی بە ناوی ئەو خەڵکەشەوە تەواو بێ، ئایا ئەوە گوناهـ نیە؟ بە تەئکید ئەوە گوناهە، پاشان ئایا حکوومەت: ئەگەر چاودێریی هەڵسوکەوتی سەرۆك و، وەزیر و کاربەدەستەکانی بکرێ و، لێپرسینەوەیان لەگەڵ دا بکرێ، ئایا ئەوە پێویستە یان نا؟! بێگومان پێویستە، چونکە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) تێکڕای مسوڵمانانی بە بەرپرسیار زانیون، بەرانبەر بە کۆمەڵگا: ((کلکم راع وکلکم

مسؤل عن رعيته))، رواه البخاري: ٧١٥١، ومسلم: ٢٢٧، بەڵام بە تەئکید پەرلەمان دەسەڵاتی زیاترە و، دەستی کراوەترە بۆ لێپرسینەوەی بەرپرسەکان، کەواتە: هەموو ئینسانێك ئەرکیەتی کە چاودێریی حکوومەت و کاربەدەستانی بکا، چ جای ئەنجوومەنێك، بە دەستی کراوەترەوە، بتوانێ ئەو سەرۆکە، یان وەزیرە بێنێتە بەردەم خۆی و، لێی بپرسێتەوە، ئنجا ئاگاداربوون لەوە کە ماڵ و سامان: چی دێ بۆ ئەو وڵاتە و، چۆن سەرف دەکرێ؟! بێگومان ئەوەش ئەرکێکی دیکەی شەرعیی گرنگ و گەورەیە، کەواتە: ئەو پەرلەمانە بەو ئەرکانەوە، پێویستە خەڵکی باشی بچێتە نێو و، مسوڵمانان لە بەرانبەریدا، خۆیان بە بەرپرسیار بزانن و، مەیدان چۆڵ نەکەن بۆ کەسانی دیکە، ببنە نوێنەریان، کە دوایی لە بواری یاسادانان‌دا، ڕەچاوی شەریعەت و دین و ژینی خەڵك نەکەن و، ڕەچاوی بەها بەرزە ئەخلاقییەکانی خەڵك نەکەن، هەروەها لەبواری دوو ئەرکە گەورەو گرنگەکەی دیکەی پەرلەماندا[1]، بۆیە: ئەگەر مسوڵمانانی کۆمەڵگایەك کەمتەرخەم بن بەرانبەر بە ئەنجوومەنێکی ئاوا و، هەوڵنەدەن بچنە نێوی، بۆ ئەوەی ئەو سێ ئەرکە سەرەکییە جێبەجێ بکەن، بێگومان گوناهبار دەبن.

+ بەڵام مامۆستا! ئێمە کاتێك هێندێ کتێب دەخوێنینەوە! یان لە ئینتەرنێت تەماشا دەکەین: هێندێ بیروڕا هەن، یان قسەی هێندێ خەڵك دەبیستین، پێیان وایە: بەشداریکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەمان دا، ناڕەوایەو، لە ڕوانگەی ئایینی ئیسلامەوە حەرام و داهێنراوە و، پەرلەمان لە جێگای خوای گەورە بڕیار دەدا! ئنجا ئێمە دەپرسین: ئایا خاوەنی ئەو بیرو ڕایانە بەڵگەیان هەیە؟ یان ئەو ئایەت و

---

(١) واتە: متمانەدان بە پێکهێنانی حکوومەت و، دانانی بودجە.

فەرموودانەی بە بەڵگە دەیانهێننەوە کامانەن؟ ئایا دەبنە بەڵگە بۆ ئەو بیرووڕایە، یان نا؟

. ئەوەندەی من سەرنجمداوە، ئەوانەی کە بەشدارییکردن لە پەرلەمانێکی بەو شێوەیەدا کە باسمکرد، واتە: پەرلەمانێکی تێکەڵ، یاخود کە زۆرینەی خەڵکی نامسوڵمان بێ، یان پابەند نەبێ بەشەریعەتەوە، بە قەدەغە دەزانن، سێ جۆرە بەڵگەیان هێناوەتەوە: یەکەم: چەند ئایەتێك، دووەم: چەند دەقێکی سوننەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، سێیەم: چەند بەڵگەیەکی عەقڵیی و واقیعیی.

## ٢- بەڵگەکانی ئەوانەی بەشداریی کردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا، بە ناڕەوا دەزانن

جۆری یەکەمی بەڵگەکانیان: چوار ئایەتی قورئان:

١/ ئایەتی(٦٨)ی سوورەتی (الأنعام) کە خوا دەفەرموێ:

﴿ وَإِذَا رَأَيْتَ ٱلَّذِينَ يَخُوضُونَ فِيٓ ءَايَٰتِنَا فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُواْ فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِۦۚ وَإِمَّا يُنسِيَنَّكَ ٱلشَّيْطَٰنُ فَلَا تَقْعُدْ بَعْدَ ٱلذِّكْرَىٰ مَعَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾.

لێرەدا خوا - عزوجل - بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: هەرکات ئەوانەت بینی کە کوفرو گاڵتە بەئایەتەکانی ئێمە دەکەن، پشتیان تێبکە، تاکو دەچنە نێو قسەو باسێکی دیکەو، ئەگەر شەیطان لەبیری بردیەوە، دوای بیرکەوتنەوە، لەگەڵ کۆمەڵی ستەمکاراندا دامەنیشە.

٢/ ئایەتی (١٤٠)ی سوورەتی (النساء) کە خوا دەفەرموێ:

﴿ وَقَدْ نَزَّلَ عَلَيْكُمْ فِي ٱلْكِتَٰبِ أَنْ إِذَا سَمِعْتُمْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ يُكْفَرُ بِهَا وَيُسْتَهْزَأُ بِهَا فَلَا تَقْعُدُواْ مَعَهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُواْ فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِۦٓۚ إِنَّكُمْ إِذًا مِّثْلُهُمْۗ إِنَّ ٱللَّهَ جَامِعُ ٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱلْكَٰفِرِينَ فِي جَهَنَّمَ جَمِيعًا ﴾.

کە ئەمیش هەمان نێوەڕۆکی ئایەتی پێشووی هەیەو، خوا سبحانه وتعالى بە مسوڵمانان دەفەرموێ: لەکتێبدا بۆتان نێرراوەتە خوار

[ئاماژەیە بە ئایەتی (٦٨)ی (الأنعام)] کە هەرکات بیستتان ئایەتەکانی خوا، کوفریان پێدەکراو گاڵتەیان پێدەکرا، هەتا دەچنە نێو باسێکی دیکەوە، لەگەڵیان دامەنیشن، ئەگەرنا ئێوەش وەك وان دەبن، بێگومان خوا موونافیقان و کافران وێکڕا لەدۆزەخدا کۆ دەکاتەوە.

٣/ ئایەتی (١١٣) لە سووڕەتی (هود) کە خوا دەفەرموێ:

﴿ وَلَا تَرْكَنُوٓاْ إِلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ فَتَمَسَّكُمُ ٱلنَّارُ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِنْ أَوْلِيَآءَ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ﴿١١٣﴾ ﴾.

واتە: بەلای ئەوانەدا کە ستەمیان کردوە، دامەشکێن، دەنا ئاگرتان تووش دەبێ و هیچکەسیش جگە لەخوا دۆستتان نابێ و، پاشان سەرناخرێن.

٤/ ئایەتی (٢١)ی سووڕەتی (الشورى) کە خوا دەفەرموێ:

﴿ أَمْ لَهُمْ شُرَكَٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنۢ بِهِ ٱللَّهُۚ وَلَوْلَا كَلِمَةُ ٱلْفَصْلِ لَقُضِيَ بَيْنَهُمْۗ وَإِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٢١﴾ ﴾.

واتە: یان ئایا چەند هاوبەشێکیان هەن، کە بێ ئەوەی خوا مۆڵەت بدات، بەرنامەیان بۆ داناون! ئەگەر بڕیاری هەڵاواردن (لە دواڕۆژدا) نەبووایە، دادوەرییان لەنێواندا دەکراو، بێگومان ستەمکاران ئازارێکی بە ئێشیان هەیە.

ئەمە جۆری یەکەمی بەڵگەکانیان، هەڵبەتە هەندێ ئایەتی دیکەش دەهێننەوە، بەڵام ئەوانیش هەر لە چوارچێوەو سوڕگەی ئەم ئایەتانەدا دەسووڕێنەوە.

چۆنیەتی بەڵگە هێنانەوەشیان بەم ئایەتانە، بەمجۆرەیە:

**١و٢:** بەنسبەت ئایەتی (٦٨)ی (الأنعام)و، ئایەتی (١٤٠)ی (النساء)ەوە، دەڵێن: وەك دەبینرێ خوای كاربەجێ لە بڕوادارانی قەدەغەكردوە: لەگەڵ كەسانێك لەكۆڕو مەجلیسدا دابنیشن، كە كوفرو گاڵتە بەئایەتەكانی خوا دەكەن و، فەرمووویەتی: كە لە سۆنگەی دانیشتنیانەوە، لەوجۆرە كۆڕو مەجلیسانەدا، دەچنە ڕیزی ئەوانەوە: ﴿... إِنَّكُمْ إِذًا مِّثْلُهُمْ ... ﴿١٤٠﴾﴾النساء، ئنجا ئەگەر دانیشتنی تەنیاش قەدەغەبێ، چۆن چۆنی بوونە ئەندام لە پەرلەمانێكدا، كە یاسای پێچەوانەی شەریعەت دەردەكا، ڕەوایە؟!

٣: بەنسبەت ئایەتی (١١٣)ی (هود)ەوە دەڵێن: خوای زانا -عزوجل- بەلاداشكان و پشت پێوەدانی[1]، ستەمكارانی قەدەغەكردوەو، هەڕەشەی سزادانی لەوكەسانە كردوە، كە بەلای ستەمكاراندا دەچن، كەواتە: چۆن ڕەوایە بەشداریی پەرلەمانێك بكرێ و، تێیدا ببیە ئەندام، كە یاساو بڕیاری ستەمكارانەو پێچەوانەی شەریعەتی تێدا دەدرێن؟!

٤: بەنسبەت ئایەتی (٢١)ی (الشوری)وە، دەڵێن: خوای بەرزو مەزن لەم ئایەتەدا ڕایگەیاندوە: كە هەركەسێك ئایین و بەرنامەی ژیانی، لەكەس و لایەنێكەوە وەربگرێ، ئەوە ئەو كەس و لایەنەی كردوە بە هاوبەش (شریك)ی خوا -سبحانه وتعالی-، كەواتە: پەرلەمانێكیش كە یاساو بڕیاری دژ بەشەریعەت دەردەكات، كراوەتە هاوبەشی خواو، بەهیچ جۆرێك بەشداریی تێداكردنی ڕەوا نیە!

---

(١) پشت پێوەدان: پشت پێبەستن و پاڵپێوەدان.

**جۆری دووەمی بەڵگەکانیان چەند دەقێکی سوننەت و سیرە:**

١) «مَنْ كثَّر سواد قوم، فهو منهم»[١]، واتە: هەرکەسێك ئاپۆرایی (یاخود ژمارەی) کۆمەڵێك زۆر بکا، ئەویش لەوانە.

٢) هەر لەوشێوەیە دەقێکی دیکەش هەیە، کە دەفەرموێ: ((من تشبَّه بقوم فهو منهم))، رواه أبو داود: (٤٠٣٣)، والطبراني: (٨٣٢٧)، واتە: هەر کەسێك خۆی وەك کۆمەڵێك لێبکات، ئەویش لەوانە.

بۆیەش دەڵێم دەق، چونکە کێشە لەنێو زانایاندا هەیە، کە ئایا ئەم دوو دەقە، فەرمایشتی پێغەمبەرن (صلى الله عليه وسلم) یان نا؟.

٣) دەقێکی دیکە ئەوەیە کە (ابن هشام) لە (السيرة النبوية)دا[٢] هێناویەتی، کە هاوبەشدانەرەکان وەفدێك کە بریتی دەبێ لە (عتبة بن ربيعة) دەنێرن بۆ لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)و بۆی پێشنیار دەکەن، دەڵێن: ئەی موحەممەد! ئەم قسەیەی کە هێناوتە، (واتە ئەم دین و قورئانە) ئەگەر مەبەستت پێی ماڵ و سامانە، هێندەت ماڵ و سامان بۆ کۆدەکەینەوە، لە هەمووما‌ن ساماندارتر بی و، ئەگەر مەبەستت پێی سەرۆك خێڵایەتییە، دەتکەینە سەرۆکی خۆمان و، ئەگەر مەبەستت پێی پادشایەتییە، دەتکەینە پادشای خۆمان.

بەڵام پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەو شتانە ڕەفز دەکا.

٤) بەڵگەیەکی دیکەیان ئەوەیە کە دەڵێن: قورەیشییەکان (دار الندوة) یان هەبووەو دەڵێن: (دار الندوة)ی ئەوکاتە، لەجێی پەرلەمانی ئێستا

---

(١) أخرجه الديلمي: ٥٦٢١.

(٢) السيرة النبوية لابن هشام، ج١، ص١٤٦.

بووە، بەڵام پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئامادە نەبووە ببێتە ئەندام تێیدا، بەڵێ ئامادە بووە بچێ قسەیان بۆ بکات، بەڵام ئامادە نەبووە لەوێدا ببێتە ئەندام، ئەم قسەیە (محمد قطب) لە کتێبی: (واقعنا المعاصر)دا هێناویەتی[1].

چۆنیەتی بەڵگە هێنانەوەشیان، بەم دەقانەی سوننەت و سیرەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ، بەم شێوەیە:

**١و٢**: بەنسبەت دەقی: (مَنْ كثَّر سواد قوم، فهو منهم)و دەقی: (من تشبَّه بقوم فهو منهم)ەوە دەڵێن: مادام هەرکەسێك ژمارەو ئاپۆرایی کۆمەڵێك زۆر بکات، یان خۆی وەك وان لێبکات، حوکمی ئەوانی هەبێ و، بچێتە ڕیزی وانەوە، کەواتە: بوونە ئەندام لەپەرلەمانێکدا کە یاساو بڕیاری دژو پێچەوانەی ئیسلام دەردەکات، ڕەوا نیە، چونکە بابای پەرلەمانتار، هەرچۆن بێ ژمارەو کۆمەڵی کەسانێکی لادەرو لاڕێ زیاد دەکات.

٨١

**٣**: بەنسبەت دەقی سێیەمەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هەرسێك پێشنیارەکانی شاندی هاوبەشدانەرەکانی ڕەفزکردون و، ئامادە نەبووە کە سەروەت و سامانی خۆیانی پێبدەن، یان ببێتە سەرۆك هۆزیان، یان ببێتە پادشایان، دەڵێن: کەواتە: دروست نیە مرۆڤی مسوڵمان بە کەمتر لەوە، کە بوونە ئەندامە لە پەرلەمانێکی وادا، ڕازی بێ و بەشداربێ!

٤: بەنسبەت ئەوەوە کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئامادەنەبوو لە (دار الندوة)دا بەشداربێ و تێیدا ببێتە ئەندام، دەڵێن: بەهەمان شێوەش دروست و ڕەوا نیە کە خەڵکی مسوڵمان و ئیسلامیی، لە پەرلەمانێکی بەو جۆرەدا، ببێتە ئەندام و بەشداریی بکا.

---

[1] واقعنا المعاصر، ص(٤٦٣-٤٦٤).

**جۆری سێیەمی بەڵگەکانیان، چەند بەڵگەیەکی عەقڵیی:**

یەکەم: دەڵێن: پەرلەمان بە زۆرینەی دەنگ، حەرام حەڵاڵ دەکات و حەڵاڵ حەرام دەکات، ئەوەش شیرك و کوفرە، کەواتە: بە لای کەمەوە قەدەغەیە لە کۆڕ و مەجلیسێکی ئاوادا بەشداربی.

دووەم: دەڵێن: بەشداریی لە پەرلەماندا، مایەی شەرعییەتپێدانی ئەو قەوارە سیاسییە و، ئەو ئەنجوومەنەیە کە حەڵاڵ و حەرام دەستکاریی دەکا، ئنجا چۆن دەبێ ڕەوایەتیی بە شتێکی وا بدەین و، چۆن دەبێ خەڵك چەواشە بکرێ و، سیمای دزێوی ئەو قەوارەیە جوان بکرێ، بە بەشداریی تێداکردنی؟

سێیەم: بەڵگەیەکی دیکەیان ئەوەیە کە بەشدارییکردن لە پەرلەماندا دەبێتە هۆی خلیسکانی کەسانێك کە تیایدا بەشدار دەبن و، دەبێتە مایەی فیتنە و تووشی گوناهبوونیان. ٨٢

چوارەم: بەڵگەیەکی دیکەیان ئەوەیە کە دەڵێن: لەڕێی دیموکڕاسییەوە، هەرگیز حوکمی ئیسلامیی نایەتەدی.

ئەم شتانە بەڵگەکانی ئەوانن.

+ ئایا ئەوانە دەبنە بەڵگە؟!

- ئێمە دەبێ ئەو بەڵگانە یەك بەیەك هەڵسەنگێنین، کە ڕەنگە جگە لەمانە هەندێك شتی دیکەش بێننەوە، بەڵام هەر هاوشێوەی ئەمانەن و، من هەوڵمداوە بەهێزترین بەڵگەکانیان بهێنمەوە[1]، ئێستاش با ئەو سێ جۆرە بەڵگەیە بەڕیز هەڵسەنگێنین و لەمەحەك بدەین:

---

(١) ئەمەش ئینساف و دادگەریی دەیخوازێ، کە سیفەتێکی بنەڕەتیی مرۆڤی مسوڵمانە.

**٢- هەڵسەنگاندن و هەڵوەشاندنەوەی ئەو بەڵگانەی بۆ ئیسپاتی ناڕەوایی بەشداریکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەمان دا، دەهێنرێنەوە:**

جۆری یەکەم:

**١و٢/** ئایەتی (٦٨)ی (الأنعام)و ئایەتی (١٤٠)ی (النساء)، کە وەك گوتمان: یەك نێوەڕۆکیان هەیە، ئایەتی یەکەمیان پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەدوێنێ و، ئایەتی دووەمیان: ڕوو لە مسوڵمانان دەکا و، ئاماژەش دەکاتەوە بە ئایەتی یەکەم، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ: کە هەموو ئەو شتانەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پێیانەوە مولزەمە، ئوممەتەکەیشی پێیانەوە مولزەمە، کەواتە: هەرچی ئەرکە لەسەر پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، ئەرکە لەسەر ئوممەتەکەیشی، پاشان ئەو ئایەتەی سووڕەتی (النساء) وشەی (يَخُوضُونَ)شمان بۆ تەفسیر دەکا، کە لە سووڕەتی (الأنعام) دا هاتوە:

﴿ وَإِذَا رَأَيْتَ ٱلَّذِينَ يَخُوضُونَ فِيٓ ءَايَٰتِنَا ... ﴿٦٨﴾ ﴾الأنعام

﴿يَخُوضُونَ ﴾یانی چی؟ ئایەتەکەی سووڕەتی (النساء) دەفەرموێ:

﴿ وَقَدْ نَزَّلَ عَلَيْكُمْ فِي ٱلْكِتَٰبِ أَنْ إِذَا سَمِعْتُمْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ يُكْفَرُ بِهَا وَيُسْتَهْزَأُ بِهَا ... ﴿١٤٠﴾ ﴾النساء.

کەواتە: (يَخُوض)[1] یانی: کوفرکردن بە ئایەتەکانی خوا و گاڵتەپێکردنیان و بەدرۆدانانیان، ئەم دوو ئایەتە فەرمان بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەکەن و، فەرمان بە مسوڵمانانی شوێنکەوتووی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەکەن، کە لەهەر کۆڕ و مەجلیسێکدا، کەسانێك هەبوون گاڵتە و کوفریان بە ئایەتەکانی خوا دەکرد و، بەدرۆیان دادەنان، بەشداریی ئەو کۆڕ و مەجلیسە مەکەن، هەتاکو دەچنە نێو باس و بابەتێکی دیکەوە، ئنجا کە چوونە نێو باس و بابەتێکی دیکەوە، بۆتان هەیە بەشداریی بکەن و، ئەگەر هات و شەیتان لەبیری بردیەوە، لە مەجلیسەکەدا دانیشتی، ئەوە هەر کاتێك بیرت هاتەوە، یەکسەر لەو مەجلیسە هەڵسە، هەروەها لەگەڵ کەسانی ستەمکاردا دامەنیشن، ئەگەرنا ئێوەش وەك ئەوانن، یانی: ئێوەش ئەگەر لەگەڵیان دابنیشن، هەمان حوکمی وانتان هەیە.

ئنجا بابزانین: توێژەرەوانی قورئان، چۆن تەفسیری ئەم ئایەتانەیان کردوە؟ (القرطبي) لە تەفسیرەکەی خۆیدا دەڵێ:[2] «فكل من جلس في مجلس معصية و لم ينكر عليهم ما يخوضون فيه، يكون معهم في الوزر سواء، وينبغي أن ينكر عليهم إذا تكلّموا بالمعصية و عَمِلوا بها، فإن لم يقدر على النكير عليهم، فينبغي أن يقوم عنهم، حتى لا يكون من أهل هذه الآية».

واتە: هەر کەسێك لە کۆڕێکدا دابنیشێ کە گوناهی تێدا بگوترێ و بکرێ (واتە: ئایەتەکانی خوای تێدا بە کەم تەماشا بکرێن، یاخود ناشەرعیی تێدا بکرێ و بگوترێ) ئینکارییشیان لێنەکات و ڕەخنەیان

---

(١) لەڕووی زمانەوانیەوە (خَوْض) بریتیە لە چوونە نێو شتێکی شل، وەك: ئاو، باتڵاغ، المعجم الوسيط، ص٢٦٢.

(٢) الجامع لأحكام القرآن، ج٥ ص٤١٨.

لێ نەگرێ، ئەوە وەك ئەوان لە گوناهەکەدا بەشدارە، بۆیە دەبێ ڕەخنەیان لیبگرێ و بێدەنگ نەبێ و، ئەگەر نەیتوانی، پێویستە هەڵسێ، بۆ ئەوەی وەبەر حوکمی ئەم ئایەتە نەکەوێ.

کەواتە: لە پەرلەمانێکدا کە شتێکی ناشەرعیی تێدا دەگوترێ و، دەویسترێ بڕیارێکی ناشەرعیی تێدا بدرێ، ئەگەر پەرلەمانتارە ئیسلامییەکان، بێدەنگ بن، ئەوە دیارە گوناهبارن، بەڵام ئەدی ئەگەر وەدەنگ هاتن؟ ئەوە بێگومان نەك گوناهبار نین، بەڵکو لە ڕاستییدا گەورەترین جیهادیان کردوە، کارێکی زۆر باشیان کردوە، چونکە هەق گوتن لەلای ستەمکار، گەورەترین جیهادە، وەك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ((أفضل الجهاد كلمة الحق عند سلطان جائرٍ))[1]، واتە: چاکترین تێکۆشان، گوتنی قسەیەکی هەقە لەلای حوکمڕانێکی ستەمکار.

٨٥

٣/ ئایەتی سێیەم، کە ئایەتی ژمارە (١١٣)ی سوورەتی (هود)ە، کە وشەی (وَلاَ تَرْكَنُوا) هەندێك لە توێژەرەوان بە (ولاتميلوا) تەفسیریان کردوە، واتە مەیل بە لای ئەوانەدا مەکەن کە ستەم دەکەن، بەڵام لە ڕاستییدا (ولاتميلوا) واتە: پێی ڕازیی مەبن و پشتگیریی مەکەن، بە بەڵگەی ئەوە کە (طبري) لە تەفسیرەکەی خۆیدا دەڵێ:[2] «قال أبو العالية الركون هو الرضا»، (ركون) ڕازیی بوون و پەسەندکردنە.

هەروەها (ابن كثير) لە تەفسیرەکەی خۆی دا، دەڵێ:[3] «ولا تركنوا إلى الذين ظلموا أي: لا تستعينوا بالظلمة، فتكونوا كأنكم رضيتم بأعمالهم، فتمسكم النار».

---

(١) أخرجه البيهقي في شعب الإيمان: ٨٢٨٩.

(٢) جامع البيان، ج٢، ص١٢٧.

(٣) تفسير القرآن العظيم، ج٢، ص٤٦٢.

واتە: یارمەتیی وەرمەگرن لە ستەمکارەکان، بۆ ئەوەی وا نەیەنە بەرچاو کە بە کردەوەکانیان ڕازین و، سەرەنجام ئاگرتان تووش بێ.

کەواتە: مسوڵمانێك کە دەچێتە پەرلەمانێکەوە، بۆئەوەی ڕەفزی ئەو ستەمە بکات کە تێیدایەو، ڕەفزی ئەو ناحەقییە بکا، ئەوە ئەم ئایەتە بەتەئکید نایگرێتەوە، چونکە مەیلی[1] نەکردوە بە لای ستەمکارەکاندا، نەك هەر مەیلی نەکردوە، بەڵکو ڕەخنەی لێگرتوون و بەرائەتیی لە کردەوە خراپەکانیان کردوە.

٤/ ئایەتی چوارەم، کە ئایەتی (٢١)ی سوورەتی (الشورى)یە، کە دەفەرموێ: ﴿ أَمْ لَهُمْ شُرَكَٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنۢ بِهِ ٱللَّهُ ... ﴿٢١﴾ ﴾الشورى.

واتە: ئایا چەند هاوبەشێکیان بۆ خوا داناون، کە شتێکیان بۆ بڕیار دەدەن لە دین، کە خوا ئیزنی لەسەر نیە، (واتە: شەرعیان بۆ دادەنێن).

دەڵێین: ڕاستە پەرلەمانێك حەڵاڵ حەڕام بکا و حەڕام حەڵاڵ بکا، ئەو ڕەفتارەی شیرکە بە دەقی ئایەت و، لە ڕاستییدا پەرلەمانێك کە ئەوەی تێدا دەکرێ، بەکردەوە دەوری خوای پەروەردگاری پێ دراوە، چونکە حەڵاڵ و حەڕام دانان، تەنیا مافی خوای پەروەردگارەو، هیچ کەس ئەو حەقەی نیە، بەڵام بێگومان کاتێك مسوڵمانێك دەچێتە ئەو

---

(١) وشەی: (ركن يركن ركوناً) وێڕای مەیل بەلاداکردن، مانای پشت پێ بەستن و سەنگدانە سەریش دەگەیەنێ و،لە تەفسیری سوورەتی(هود) بە درێژیی توێژیومانەتەوە، کە بەرگی دەیەمی تەفسیری قورئانی بەرزو بە پێزە.
هەروەها سەرنجی: المعجم الوسيط، ص٣٧٠، ٣٧١، بدە، کە هێناویەتی: (رَكَن إليه يَرْكَنُ رَكْناً وركوناً: مالَ إليه وسَكَنَ واعتمد عليه..).

پەرلەمانەوە، بۆ ئەوەی ڕێگا بگرێ لە دیارییکردنی حەڵاڵ و حەرام، لە لایەنی ئینسانەکانەوە، ئەوە زۆر جیایە لەوەی کە چووە پشتگیریی بکا، بەڵکو بابایەکی وا، وەك پێشتر گوتمان: گەورەترین جیهادی کردوە و، بەهیچ ڕەنگێکیش بەر حوکمی ئایەتەکە ناکەوێ.

**جۆری دووەم: چەند دەقێکی سوننەت و سیرە**

جۆری دووەمی بەڵگەکانیان وەك گوتمان: چەند دەقێکی سوننەت و سیرە بوون:

**یەکەم/** لە دەقەکان بریتی بوو لە: ((من كثر سواد قوم، فهو منهم))، سەرەتا ئێمە دەڵێین: ئەم دەقە هەرچەندە ئەبوو یەعلا گێڕاویەتەوەو، لە هەندێك لە کتێبەکاندا هاتوە، بەڵام زانایان مشتومڕی زۆریان لەسەر سەنەدەکەی هەیەو، زۆریان هەر بە فەرموودەی نازانن، پاشان ئەگەر گریمان فەرموودەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)یش بوو، ئێمە دەڵێین: کەسێك کە دەچێتە نێو پەرلەمانێکەوە، بۆ ئەوەی ڕەخنە بگرێ لە هەر بڕیارێکی ناشەرعیی و ستەمکارانە و، هەر یاسایەکی ناحەق کە دەدرێ و، پێچەوانەی شەریعەتە، ئەوە نەك ژمارەی خەڵکی بێدین و خراپی زۆر نەکردوە، بەڵکو لێی کەم کردوونەتەوە و، بۆتە بەربەست لە بەردەمیاندا! کەوابێ: فەرموودەکە بە هیچ جۆرێك ئەو جۆرە کەسە ناگرێتەوە.

**دووەم/** ((مَنْ تَشَبَّه بقوم فهو منهم))، ئەلمونناویی لە کتێبی: (فيض القدير)داو[1]، زانایانی دیکەش دەڵێن: لێرەدا مەبەست لەو خۆ

---

(١) فيض القدير، شرح الجامع الصغير، ج٦، ص(١٣٥-١٣٦).

وێچواندنە، خۆ وێچواندنە لە تایبەتمەندییەکانی دینییاندا، یاخود لە شتێکدا کە پێچەوانەی شەریعەتە، لە عەقیدە و عیبادەت و حەڵاڵ و حەرامێکدا، کە هەڵقوڵاوی بەرنامەکەیانە، بەڵام ئەگەر لە شتی باشدا، خۆت بە کەسانی نامسوڵمان بچوێنی، نەك هەر هیچ گرفتێکی نیە، بەڵکو:

١) خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿... فَبَشِّرْ عِبَادِ ﴿١٧﴾ ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُ ۖ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمْ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٨﴾ الزمر﴾.

واتە: موژدە بدە بەو بەندانەم، کە گوێ بۆ هەموو قسەیەك دەگرن، پاشان بە دوای چاکترینی دەکەون، ئەوانە کەسانێکن کە خوا هیدایەتی داون و، ئەوانەن خاوەن عەقڵ.



٢) بەڵێ عاقڵ ئەو کەسەیە: عەقڵی خەڵك بێنێتە لای عەقڵی خۆی! ئنجا با تەماشای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بکەین، کاتێك کە شەڕی خەندەق دەبێ، وەك لە سیرەی ئیبنو هیشامدا هاتوە[١]، سەلمانی فارسیی دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا! (صلی الله علیه وسلم) ئێمە لە وڵاتی فارس، کاتێك دوژمن هێرشی بۆ دەهێناین، ئەگەر شوێنەکەمان دەشت بووایە، خەندەقمان لێدەدا، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) یەکسەر پێشنیارەکەی سەلمان وەردەگرێ، کە دیارە فارسەکان ئەو کاتە مەجووسیی و ئاگرپەرست بوون، بەڵام پێغەمبەری خوا یەکسەر ئەزموونەکەیان پراکتیزە دەکا.

---

(١) السيرة النبوية لابن هشام، ج٣، ص١٠٩، هەروەها بڕوانە: (البداية والنهاية) لابن كثير.

٣) هەروەها پێغەمبەری خوا کاتێك دەیەوێ نامە بنووسێ بۆ پادشاکان[١]، هاوەڵان دەڵێن: ئەی پێغەمبەری خوا! پادشاکان عادەتیان وایە نامەی بێ مۆر ناخوێننەوەو، دەبێ خەتم کرابێ، ئەویش فەرمان دەکا ئەنگوستیلەیەکی بۆ دروست بکەن، مۆرێکی لەسەر هەڵکەنراوە، کە لەسەری نووسراوە: (محمد رسول الله)، (أَلله) لەسەرێ، (رسول) لە نێوەڕاست (محمد) لە خوارێ، کە دیارە ئەوە عادەتی دەوڵەتانی کافر بووە، بەڵام هیچ ناشەرعییەکی تێدا نیەو، وەك پێشتریش گوتوومانە: لە بواری عادەت و هەڵسوکەوتەکاندا، دەستکراوەیی هەیەو، دەبێ بەڵگە هەبێ لەسەر قەدەغەیی، کەواتە: کەسێك کە دەچێتە ئەو پەرلەمانەوە، یاخود بەشداریی هەڵبژاردن دەکا، یان هەر شتێکی دیکەی ئیداریی دەکا، تۆ دەبێ تەماشا بکەی: ئایا ئەو شتە بەرژەوەندیی تێدایە یاخود زیان؟ ئەگەر بەرژەوەندیی تێدا هەبوو، ئەوە هەرچەندە لەو شتەدا خۆیشت وەك کافران لێکردبێ، هەر شتێکی باشتکردوە، بۆ نموونە: ئایا ئەگەر ئێستا ئێمە بتوانین تەیارە و ساڕۆخ و پاپۆڕ و چەکی نێوکیی (السلاح النّووي) دروست بکەین، چ نا شەرعییەکی تێدایە؟! ئەمریکا و جوولەکە بۆچی هەڕەشە لە دنیا دەکەن؟ بێگومان لەسۆنگەی ئەوەوە کە چەکی نێوکییان هەیە، ئنجا ئایا مسوڵمانان ئەگەر بتوانن ئەو شتانە وەدەست بێنن، کە ئەهلی کوفر هەیانن، شتێکی خراپیان کردوە؟ بێگومان نەخێر، چونکە چاولێکردنی شتی خراپیان، خراپە، ئەمما چاولێکردنیان لە شتێکدا کە باشە، بۆ نموونە: لە تەکنۆلۆجیایەکدا کە ئێمە ئێستا پێویستییمان

---

(١) (البداية والنهاية)، ج٦، ص٥، هەروەها (بخاري)و (مسلم)یش هێناویانە، بڕوانە: (صحيح البخاري)، رقم: ٦٥، و (صحيح مسلم)، رقم: ٥٧/٢٠٩٢.

بەوانە، کە خۆمان بەرهەمی بێنین، نەك هەر باشە، بەڵکو فەرزە، (أبو حامد الغزالي) لە (إحياء علوم الدين)دا گوتوویەتی: هەر شتێك مسوڵمانان پێویستییان پێی هەبێ، لە سەریان پێویستە دابینی بکەن، لە دەرزییەکەوە تا هەر پێداویستییەکی دیکەی ژیانیان[1].

سێیەم/ دەربارەی پێشنیارکرانی پادشایەتیی و، پارە و سامان و، سەرۆك خێڵایەتیی بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، کە ئەویش ڕەفزی کردوە، وەڵامەکەی زۆر ئاسانە:

چونکە ئەوان ئەو شتانەیان بۆ پێشنیار کردوون، لە بەرانبەر ئەوەدا کە واز لە ئایین و پەیامەکەی بهێنێ، ئنجا بێگومان پەرلەمانتارێکی مسوڵمان، یان وەزیرێك کە دەچێ بەشدار دەبێ لە حکوومەتداو، پێی دەڵێن: دەبێ دەستبەرداری دینەکەت بی، ئەوجار بێی؟ ئەوە بە تەئکید حەرامە و، پێشی کافر دەبێ ئەگەر وابکا.

+ ئەدی بە نسبەت (دار الندوة)وە؟

- لە وەڵامی بەڵگەی چوارەمەشیاندا دەڵێین:

یەکەم: هیچ سەرچاوەیەك نیە دەری بخات، کە داوا لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کرابێ لە [دار الندوة] دا ، ببێتە ئەندام و، ئەویش ئامادە نەبووبێ.

---

(١) (إحياء علوم الدين)، ج١، ص٢٨، کە گوتوویەتی: (أما فرض الكفاية، فهو كلُّ علمٍ لا يُسْتَغْنى عنه في قوام أمور الدنيا) واتە: ئەو زانستەی کە وەدەستهێنانی فەرزی کیفایەیە، بریتیە لە هەر زانیارییەك، کە کاروباری ژیانی دنیا پەکی لەسەری کەوتوە.

دووەم: ئەو (دار الندوة)یە وەك پەرلەمان نەبووە، خەڵك هەڵیبژێرێ، بەڵكو بەشداربووانی (دار الندوة) كۆمەڵێك لە سەر گەورەكانی قورەیش بوون، كە خاوەن دەستەڵات و سەروەت و سامان بوون و، بەزۆر خۆیان فەرز كردبوو و، خۆیان لە خەڵك كردبووە هەمەكارە و بڕیاربەدەست، ئنجا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) چۆن دەچێ لە شوێنێكی وادا بەشدار دەبێ؟ كە بێگومان ئەوە زۆر جیایە لە پەرلەمانێك كە خەڵك بۆ خۆی هەڵیدەبژێرێ و، نوێنەرانی خەڵك و كۆمەڵگان!

**جۆری سێیەمی بەڵگەكانیان، كە بە حیساب هەندێ بەڵگەی عەقڵیی و واقیعیی بوون:**



١) بەڵگەی یەكەمیان ئەوەیە دەڵێ: پەرلەمان بە زۆرینە حەڵاڵ حەڕام دەكا و حەڕامیش حەڵاڵ دەكا، بۆیە قەدەغەیە لە پەرلەمانێكی وادا ببیە ئەندام و بەشداریی ئەو كارە ناڕەوایە بكەی! ئێمەش دەڵێین: ڕاستە، ئەو جۆرە پەرلەمانانەكە لەبارەیانەوە دەدوێین، وان، بەڵام.

یەكەم: خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ... ﴿١٨﴾﴾ فاطر، واتە: هیچ گوناهبارێك گوناهی یەكێكی دیكە كە هەڵناگرێ.

هەروەها دەفەرموێ: ﴿كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ رَهِينَةٌ ﴿٣٨﴾﴾ المدثر، واتە: هەركەسە بارمتەی كردەوەكانی خۆیەتی، بۆیە ئەگەر كەسێك لەوێ بۆ وێنە: پێشنیار دەكا كە شەڕاب وەك بیبسیی بخورێتەوە، یان داوێنپیسی ڕێی لێ نەگیرێ، كەسێك كە ئەوە پێشنیار دەكا، یان كەسێك پشتگیریی بڕیارەكە دەكا، بەوە كافر دەبن، چونكە پێچەوانەی دەقی قورئان و فەرمایشتی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم)، بەڵام

کەسێك کە ڕەخنە لەو بڕیارە دەگرێ و، لە ڕێیدا دەبێتە بەربەست، ئەوە گوناحی ئەوی دیکەی نایەتە ئەستۆ، وەك گوتراوە: مەڕ بەپێی خۆی و بزن بەپێی خۆی.

دووەم: پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ: ((إنما الأعمال بالنيات))، رواه البخاري (١) ومسلم(١٩٠٧)[١]، واتە: کردەوەکان بە پێی نیەتەکانن، ئەو کەسەی کە بۆیە دەچێتە ئەو پەرلەمانە، بڕیاری باش و ڕێك و ڕاست بدا و، لە دژی هەر بڕیار و یاسایەك بێ، پێچەوانەی شەریعەت بێ، بەپێی نیەتی خۆی پاداشتی هەیە، ئەوەش کە بۆیە دەچێ: کۆمەڵگا بەرەو گوناە و تاوان بەرێ، ئەویش بەپێی نیەتی خۆی گوناهبارە.

سێیەم: دەڵێین: ئەسڵەن پەرلەمانتارێکی ئیسلامیی بۆیە دەچێ، کە ڕێگا بگرێ لەوجۆرە بڕیارو یاسایانەو، لە بنەڕەتدا ئەرکی هەر ئەوەیە. ٩٢

٢) بەڵگەی دووەمی، هی عەقڵیی و واقیعییان: ئەوەیە کە بەشدارییکردنی ئینسانی مسوڵمان لە پەرلەمانێکی وادا، دەکاتە شەرعییەتپێدانی ئەو واقیع و ڕژێم و سیستمە! ئێمەش دەڵێین: ئەوە ئەگەر پشتگیریی بڕیارە ناشەرعییەکانیان بکات، وایە، بەڵام ئەگەر بۆیە بەشداربێ لەنێو جەرگەی پەرلەمان و حکوومەت و ئەو سیستمەدا، ناڕەزایی دەرببڕێ و ڕەخنە بگرێ لە ناحەقیی و ناشەرعییەکان، چۆن ئەوە دەکاتە شەرعییەت پێدان؟ بەڵکو ئەوە ڕەوایەتیی لێستاندنەوەیە، ئنجا ئەگەر مرۆڤ نەچێتە نێو پەرلەمان و حکوومەت و لە ماڵیش بێ،

---

(١)

دەبێ هەر ناڕازیی بێ لە شتی ناشەرعیی، بەڵام ئایا ناڕازیی بوونێك لە ماڵێ، یاخود کە لەبڵاوکراوەیەکدا شتێ دەنووسێ، یاخود وتارێك دەدا لە مزگەوت، ئەوە لەکوێ: کە چەند سەد کەسێکی ئاسایی، یان چەند هەزار کەسێك گوێبیستی ببن، یان بیخوێننەوەو، ئەوە لە کوێ: لە پەرلەمانێکدا کە نوێنەرانی میللەتی لێن، لەوێ قسەکەی خۆی بکا، بە تەئکید لەوێ زۆر کاریگەرترە.

٣) بەڵگەی سێیەمیان: ئەوەیە کە بەشداریی لەو پەرلەمان و نێوەندانەدا، کە ئیسلامیان وەك بەرنامەی ژیان تێدا تەبەننیی نەکراوە، دەبێتە هۆی خلیسکانی هەندێك کەس، یاخود لەژێر زەخت و فشار و تەماعدا تووشی غەڵەت و گوناهـ دەبن و، تەنازول دەکەن، دەڵێین: ئەوە ڕاستە، کەسێك کە دەچێتە ئەو شوێنە، ئەگەری ئەو حاڵەتەی هەیە، بۆیە لەسەر ئیسلامییەکان پێویستە کە خەڵکی بەهێز و خۆڕاگر بنێرن و، لە جیاتی ئەوەی کارتێکراو بن، کارتێکەر بن و، کاریگەریی چاکیان بۆ سەر دەوروبەری خۆیان هەبێ، نەك کاریگەریی خراپی دەوروبەریان لەسەر بێ، بەڵام بێگومان ناگونجێ بەهۆی هەبوونی ئەو ئەگەرانەوە، چوونە پەرلەمان قەدەغە بکرێ، چونکە ئەمە وەك ئەوە وایە کە گوتراوە: [لە ترسی ئەوەی بەراز گەنم نەشێلن و نەکێڵن، گەنم ناکەن] بەراز جاری وایە گەنم دەشێلن و هەڵیدەکەننەوە! بەڵێ ناکرێ ئەوە کە شتێکی ئیحتیمالییە، بیکەینە پاساوی گەنم نەچاندن! ئنجا لە خوا بەزیاد بێ، خەڵکی ئیسلامییش دامەزراون و پتەون و، بەپێی ئەزموونیش بۆماندەرکەوتوە، کە بە ڕاستیی ئیسلامییەکان بەگشتی هەڵبژاردەی نێو کۆمەڵگاکانی خۆیانن، لە سەرڕاستیی و، مەبدەئیی بون و، پاکیی و نەزاهەت و، تەنازول نەکردن لە پڕەنسیپەکانی خۆیان،

بۆیە بە ئیحتیمالێکی وا بێهێز، کۆمەڵێك بەرژەوەندیی زۆر چاك، کە دوایی باسیاندەکەین، نادیدە ناگیرێن.

٤) بەڵگەی چوارەمیان: ئەوەبوو، کە لە ڕێی دیموکراسییەوە، حوکمی ئیسلامیی نایەتە دی، ئێمەش لە وەڵامی ئەوەدا سێ خاڵان دەخەینە ڕوو و دەڵێین:

یەکەم: زۆر لە بنەماکانی دیموکراسیی لە شەریعەتی خۆماندا هەن، وەك جاری دیکەش گوتوومانە، بۆ وێنە:

١) گەڕانەوە بۆ ڕای خەڵك، خوا هەمیشە دەفەرموێ: [يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا، يَاأَيُّهَا النَّاسُ، يَابَنِي آدَمَ]، دواندنەکانی خوا، هەموویان لەگەڵ خەڵکن، تەنانەت بۆ یەکجاریش خوا نەیفەرمووە: «يا أيها المسؤلون، يا أيها العلماء، يا أيها المشائخ»، ئنجا ئامانجی بنەڕەتیی دیموکراسیی، گەڕانەوەیە بۆ ڕای خەڵك، ئەدی ناڵێن: دیموکراسیی حوکمی گەلە، بۆ گەل و، لەپێناو گەلدا[1]؟!

شەریعەتی خوای پەروەردگاریش، بەڵێ لە خواوە هاتوە، بەڵام هەر بەدەستی گەل پراکتیزە دەکرێ.

٢) کاربەدەستانی کۆمەڵگەی مسوڵمان، دەبێ خۆیان هەڵیانبژێرن و دیارییان بکەن.

٣) دەسەڵاتیش دەبێ بە ئاشتییانە دەستاودەستی پێ بکرێ.

٤) پێویستە زۆرینە حوکم بکا و، کەمینەش مافەکانی پارێزراو بن.

---

(١) ئەمە پێناسەی هەرە باوی دیموکراسییە.

٥) پێویستە ئازادیی و مافەكانی خەڵك هەموویان پارێزراو بن،

هەموو ئەو بنەمایانەی دیموكڕاسیی لە شەریعەتی خۆماندا هەن، ئەوەی كە لە دیموكڕاسییدا هەیە و لەگەڵ شەریعەتدا تێكدەگیرێ، ئەوەیە كە حەڵاڵ و حەڕام بدرێتە دەست ئەو ئەنجوومەنە، یان بدرێتە دەست هەر لایەنێك، چونكە حەڵاڵی خوا، حەڵاڵە تاكو قیامەت و، حەڕامی خوا، حەڕامە تاكو قیامەت، ئێمەی مسوڵمان شووڕامان هەیەو، ئەوان دیموكڕاسییان هەیە، شووڕای ئێمە پابەندە بە شەریعەتەوە، بەڵام دیموكڕاسیی ئەوان بەربەرەڵایە، بۆیە بە پێی دیموكڕاسیی بڕیاری وا دەردەكەن، كە پێچەوانەی عەقڵ و فیترەت و بەرژەوەندیی مرۆڤە، بەڵام شەریعەت دەستی ئەو ئەنجوومەنانە دەگرێ و ناهێڵێ بڕیارێك دەربكەن، پێچەوانەی نەگۆڕەكانی شەریعەت بێ، كە بەتەئكید هەرچی لەگەڵ نەگۆڕەكانی شەریعەتدا تێك بگیرێ، لەگەڵ عەقڵی سەلیم و فیطرەتی ساغیشدا دژو ناكۆكە.



**دووەم:** مەسەلە ئەوە نیە كە: حەتمەن دەبێ لەڕێی ئەو هەڵبژاردنانەوە، یەكسەر حكوومەتی ئیسلامیی دروست بێ، چونكە ئێمە بڕوامان بە پلەپلەیی هەیە، وردە وردە زەمینە خۆش دەكرێ و ڕای گشتیی دروستدەكرێ، ئنجا دیسان ئەوەش ڕاست نیە، كە لەڕێی هەڵبژاردن و دیموكڕاسییەوە حوكمی ئیسلامیی نایەتەدی، ئەوە لە توركیا، حیزبی داد و گەشەپێدان، حەماس لە فەڵەستین، ئەگەر ئینقیلابیان بەسەردا نەكردنایە، (جبهة الإنقاذ) لە جەزائیر لەڕێی هەڵبژاردن و پرۆسەی دیموكڕاسییەوە تەوژمی ئیسلامیی سەركەوت،[1] بەڵام

---

(١) هەروەها لە ساڵی (٢٠١١)ز، لە مصیرو، لە ساڵی (٢٠١٨)ز دا، لە تونس و، ماوەیەكیش بە شێوەیەك لە شێوەكان لە (مغرب)، هەر تەوژمی ئیسلامیی

ئەگەر نەشتوانین حکوومەتێکی ئیسلامیی لەڕێی هەڵبژاردن و دیموکڕاسییەوە بینا بکەین، دەتوانین زۆر بەرژەوەندیی بۆ خەڵك دابین بکەین و، زۆر زەرەر و زیانیان لێ وە دوور بخەین.

سێیەم: وردە وردە مەشق و ڕاهێنانیش بە خەڵکی خۆمان دەکەین، لەبواری حوکمڕانیی و ئیدارەی کۆمەڵگاو وڵاتدا، چونکە بێگومان کەس لەپڕ نەبووە بەکوڕ! دیارە ئامانجی کاری ئیسلامییش ئەوەیە کە بەرژەوەندییەکان بۆ خەڵك و کۆمەڵگا دابین بکرێن، لەڕێی ئەم بەشدارییکردنەشەوە، بە تەئکید کۆمەڵێك بەرژەوەندیی دابین دەکەین، کە ئەوە بۆ خۆی بەسە ببێتە پاساوی ڕەوایی بەشداریی تێداکردنی پەرلەمان و، بەڵکو زۆر جار پەسەندیی و، هەندێکجار فەرزبوونی بەشداریی تێداکردنیشی.

+ ئایا ناوی دەوڵەت و حکوومەتەکە گرنگە، یان نێوەڕۆك و ئامانج؟ وەك حکوومەتێکی ئیسلامیی، یان دیموکڕاسیی یان هەر ناوێکیتر؟

- زانایان بنچینەیەکیان هەیە دەڵێن: «العبرة بالمحتويات والمضامين، وليستْ بالأسماء والعناوين»، دەبێ تەماشای نێوەڕۆك بکرێ، نەك تەماشای دیکۆرو ڕواڵەت، جاری وایە شەخسێك ناوێکی ئیسلامیی هەیە، ناوی موحەممەدە، بەڵام هەموو کردەوەکانی پێچەوانەی شەریعەت و ناوەکەینی، کەسێکی دیکەش ناوێکی دیکەی هەیە، بەڵام نێوەڕۆکێکی باشی هەیە، بە حەقیقەت عیبرەت بە نێوەڕۆك و موحتەوایە، چ دەکرێ و، چۆن دەکرێ و، تا چ ڕاددەیەك بەرژەوەندیی خەڵك تەحقیق دەکرێ؟! چونکە شەریعەت هەمووی بۆ

---

براوەو و باڵادەست بووە.

ئەوە هاتوە: بەرژەوەندیی (مصلحة)ی خەڵك دابین بێ، بەرژەوەندیی خەڵکیش بەگشتی دوو شتە: دوورخستنەوەی زیانەکان و، هێنانەپێشی سوودەکان، بە تەعبیری شەرعزانان: (دفع المضار وجلب المنافع)، هەروەها ئایین و شەریعەتی خوا، لە چەندان ئایەتی قورئان دا ڕاگەیەنراوە، کە بۆ: چەسپاندنی دادگەریی و لابردنی ستەم، هاتوە، ئیدی لە چ ڕێیەکەوە، ئەو بەرژەوەندییە تەحقیق بێ و، ئەو دادگەرییە بچەسپێ و، پێچەوانەی دادگەریی، کە ستەم (ظلم)ە لاببرێ، ئەوە پێویستە لەو ڕێیەوە دەستبەکار بی.

+ لە میانەی ئەم قسانەی بەڕێزتانەوە: هەستدەکەم هێندێك خەڵك ئەو هەستەی بۆ دروست ببێ، کە پێی وابێ ئیسلامییەکان وەك پێویست قەناعەتیان بە بەشدارییکردن لە هەڵبژاردندا نیە، وەڵامت چیە بۆ ئەوە؟

97

- لەنێو بازنەی ئیسلامییەکاندا، بۆچوونی جیاجیا هەن، ئەوەش شتێکی سەیر نیە، بگرە شتێکی زۆر سروشتیی و زۆر ئاساییە، من پێموایە، بەشێکی زۆر لە هەستیاریی (حساسیة)ی هەندێك لە ئیسلامییەکان بەرانبەر بەو پەرلەمان و حکوومەتانەی کە ئیسلامیی نین، ئەوەیە کە لەگەڵ دیموکراسییدا ڕاست ناکەن، ئەوەندەی داکۆکییدەکەن و خەریکی ئەوەن پەرە بە ئیباحییەت بدەن و، ئیدۆلۆژییەکانی خۆیان بچەسپێنن، هێندە لە خەم ئەوەدا نین کە بەرژەوەندیی خەڵك دابین بکەن، پاشان زۆر نکووڵیی لە کلتوور و عەقیدە و دین و ئەدەب و ئەخلاقی ئەو خەڵکە دەکەن و، دەیانەوێ فیکرە و کلتوورێکی دیکە فەرز بکەن، لەسەر ئەو خەڵك و کۆمەڵگایە، پێموایە هەستیاریی هەندێك لە ئیسلامییەکان، دەگەڕێتەوە بۆ ئەوە.

دواییش ئێمە بەڕاستیی و بە هەموو قەناعەتەوە دەڵێین: ئایا بەدیل چییە بۆ مودارا کردن لەگەڵ واقیع داو، هەوڵدان بۆ گۆڕینی پلە پلەیی؟

١) یان ئەوەتا دەبێ ڕابکەی بۆ شاخ، وەك هاوەڵانی ئەشکەوت (أصحاب الكهف) خوا لێیان ڕازی بێ.

٢) یان تەسلیمی ئەو واقیعە بی، وەك مسوڵمانانێکی فەقیرۆکە کە سەری خۆیان کزکردوەو بوون و نەبوونیان وەك یەك وایە!

٣) یان دەبێ دژی ئەو واقیعە بوەستیەوە، واتە: بە چەك و هێز.

ئنجا ئەگەر تەماشای مێژووی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بکەین، هیچ کام لەو سێ ئەگەرەیان هەڵنەبژاردوون، کە ئێمەش لە لامان مەرفوزن:



١- پێغەمبەران علیهم السلام ڕایان نەکردوە لە واقیع: بەڵێ، هاوەڵانی ئەشکەوت ڕایانکردوە، بەڵام هیچ پێغەمبەرێکم نەبینیوە لە کۆمەڵگای خۆی ڕای کردبێ، هاوەڵانی ئەشکەوتیش چونکە پێغەمبەرێك نەبووە ڕێنماییان بکا، پاشان ئەوان شەش حەوت کەس بوون، ئەوپەڕەکەی حەوت کەس بوون و هەشتەمیان سەگەکەیان بووە، دیارە شەش حەوت کەس، واقیعیان پێناگۆڕێ و لە ئەشکەوتێکدا دەحەوێنەوە، بەڵام ئەو هەموو خەڵك و میللەتە بۆ کوێ بەرین؟

٢- پێغەمبەران تەسلیمی واقیعیش نەبوون، چونکە ڕازیبوون بە واقیعێك کە نەفامیی و نا شەرعیی تێدایە، یاخود بێدەنگبوون لە بەرانبەریدا، گوناهێکی گەورەیە، نەخێر تۆ دەبێ بەرەنگاریی بکەی،

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: ((المؤمن الذي يخالط الناس ويصبر على أذاهم، أفضل من الذي لا يخالط الناس ولا يصبر على أذاهم))[1]، واتە: ئەو مسوڵمانەی تێکەڵ دەبێ لەگەڵ خەڵك و سەبریش دەگرێ لەسەر ئازاریان، باشترە لەوەی تێکەڵ نابێ و لەسەر ئازاریشیان سەبریش ناگرێ.

ئیسلام هەرگیز لەگەڵ گۆشەگیریی و سەلبییەت و کشانەوە لە کۆمەڵگادا نیە.

٣- هەروەها پێغەمبەران دژی واقیعەکەشیان نەبوون و، بەچەك و هێز، واتە: کە بە چەك لەگەڵی ڕووبەڕوو ببنەوە، بە توندوتیژیی مامەڵەی لەگەڵ بکەن و هەوڵی گۆڕینی بدەن!، من هیچ پێغەمبەرێکم نەبینیوە وایکردبێ، بەڵکو ئەوە هەر نەیارانی پێغەمبەران بوون، کە هەڕەشەیان لە پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) کردوە، توندوتیژییان بەرانبەر بەکار هێناون، بەڵام هەمیشە پێغەمبەران ئەهلی سەبر بوون، دانیان بە خۆیاندا گرتوە، بەڵگەیان بەکارهێناوە، خەڵکیان بانگ کردوە بۆ دیالۆگ و وتووێژ، بۆ بەڵگەو دەلیل، بەڵێ هەر نەیارانی پێغەمبەران بوون، کە هەڕەشەیان لە پێغەمبەران و شوێنکەوتووانیان کردوە:

١- بەسووتاندن ﴿... حَرِّقُوهُ وَٱنصُرُوٓاْ ءَالِهَتَكُمْ ... ﴿٦٨﴾﴾ الأنبياء.
٢- بە گرتن: ﴿... لَأَجْعَلَنَّكَ مِنَ ٱلْمَسْجُونِينَ ﴿٢٩﴾﴾ الشعراء.
٣- بە دەرکردن: ﴿... لَنُخْرِجَنَّكُم مِّنْ أَرْضِنَآ ... ﴿١٣﴾﴾ إبراهيم.
٤- بە بەردباران کردن: ﴿... لَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمَرْجُومِينَ ﴿١١٦﴾ الشعراء﴾.

---

(١) أخرجه أحمد: ٥٠٢٢، وقال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح.

بەڵێ هەر نەیارانی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) هەڕەشەیان لە پێغەمبەران کردوە، کەواتە: ئێستا ئێمە مەعقووڵ نیە وەك شوێنکەوتووانی پێغەمبەران، شتێك بکەینە بەرنامەو ستراتیژی خۆمان، کە نەیارانی پێغەمبەران کردوویانە!! ئنجا بەڕاستیی ئەهلی باتیڵ پێویستییان بە هێز هەیە، باتیڵەکەی خۆیانی پێ بەرقەرار بکەن:

﴿ ... حَرِّقُوهُ وَٱنصُرُوٓاْ ءَالِهَتَكُمۡ ... ﴿٦٨﴾ ﴾الأنبياء.

ئەوە پەرستراوە ساختەکان و بت و سەنەمەکانن، پێویستییان بەوە هەیە خەڵك سووتاندنیان لەپشتەوە بێ، بۆ ئەوەی خەڵك بترسێ، بەڵام حەق پێویستیی بە زەبرو زەنگ نیە، چونکە حەق بۆ خۆی بەهێزو پێزە، پێویستیی بە توندوتیژیی و هێز ناکات، بیکەیە سەنەد و پاڵپشتی.



٤) کەواتە: دەمێنێتەوە ڕێی چوارەم، کە ئێمە بەشداری کاروباری ئەو خەڵکە بین، بە تایبەتییش کۆمەڵگاکانی ئێمە، زۆر جیان لەو کۆمەڵگایانەی کە پێغەمبەرانیان بۆ هاتوون، پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) کە هاتوون، کۆمەڵگاکانیان کافر بوون، موشریك بوون، بەڵام کۆمەڵگای ئێمە خۆی بە مسوڵمان دەزانێ و، زۆرینەشی مسوڵمانەو دروشمەکانی ئیسلامەتیی تێدا هەن، پەرلەمانێکیش کە دروست دەکرێ ناچارە ڕەچاوی سروشت و حاڵەتی کۆمەڵگایەکەی بکا، بۆ وێنە، لە کەم پەرلەمانی وڵاتانی ئیسلامییدا هەیە، جورئەتی ئەوە بکەن گاڵتە بە ئایەتەکانی خوا بکەن، یان کوفریان پێبکەن، یاخود بڕیارێك دەربکەن، یەکسەر پێچەوانەی دەقێکی شەریعەت بێ، ئەم حاڵەتە زۆر کەمە، جار جار بە فرت و فێڵ، هەندێك کەسایەتیی

و مەلای دینفرۆش شتەکەیان بۆ خوار دەکەن بەملاولادا، بەڵام ڕاستەوخۆ، کەم کەس هەیە جورئەتی ئەوە بکا: شتێك بڵێ یەکسەر پێچەوانەی ئایەتێکی خوا و فەرمایشتێکی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بێ، کەواتە: ئەو جۆرە ئەنجوومەن و پەرلەمانە، دیسان لەو ڕووەشەوە حوکمەکەی زۆر جیایە لەوەی کە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بەشداریی کۆمەڵگاکانی خۆیانیانکردوە، بەڵام پارێزگارییشیان کردوە لە ئیمان و عەقیدە و نەگۆڕەکانی ئایینی خۆیان، کە هەر ئەمەش ڕێبازی ڕاست و تەواوە.

## باسی دووەم

# بەڵگەکانی ڕەوایی بەشداریی کردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا





## دەستپێك

بەڕێـــزان!

ئاڵقەی ئەمجارەمان تەواوکەری ئاڵقەی پێشوومانە، سەبارەت بە بۆچوونی جیاوازی ئیسلامییەکان، لە بارەی هەڵبژاردن و پەرلەمانەوە، لە ئاڵقەی ڕابردوودا باسمان لە ڕای یەکەم کرد، ئەمجارە دەمانەوێ لەسەر ڕای دووەم بدوێین، واتە: بیروڕای ئەو کەسانەی پێیانوایە: بەشدارییکردن لە هەڵبژاردندا، نەك هەر ڕەوایە، بەڵکو جاری وایە فەرزیشە! لەم ئاڵقەیەدا ئەم بیروڕایە شیدەکەینەوەو گفتوگۆی لەبارەوە دەکەین.

105

بەڕێز مامۆستا عەلی باپیر! بفەرموو باسی ئەو بەڵگانەمان بۆ بکە کە دەبنە پشتیوان بۆ ئەم بیروڕایەی ئاماژەمان پێکرد:

- بسم الله الرحمن الرحيم، الحمدلله، وصلى الله تعالى وسلم وبارك على رسول الله محمد وآله المهتدين بهداه، من الصحْب والأزواج والقرابة والتابعين لهم بإحسانٍ إلى يوم اللِّقاء.

سەرەتا بەوە دەستپێدەکەم کە لە بواری هەڵسوکەوتەکان و عادەت و نەریتەکاندا - وەك زۆر جاری دیکەش گوتوومانە - بنچینەیەکی شەرعیی هەیە، زانایان هەموویان لەسەری یەکدەنگن و، زۆریش گرنگە بۆ ئێمەی مسوڵمان، ئەوانەی لە گۆڕەپان و مەیدانی کاری ئیسلامییدا دەور دەبینین، کە هەمیشە لەبەرچاومان بێ، چونکە لەبەرچاوگرتنی ئەو بنچینەیە، دەبێتە هۆکاری ئەوە کە خۆمان

دەستكراوە ببینین و، مەیدان لەبەردەم خۆماندا بە تەخت و هەموار ببینین بۆ جموجۆڵ، ئەو بنچینەیەش ئەوەیە كە لە بواری هەڵسوكەوت و عادەتەكاندا، بناغە ئەوەیە كە هەموو شتێك ڕەوایە: (الأصل في المعاملات والعادات الإباحة)، هەروەها زانایان لەسەر ئەوەش ڕێككەوتوون كە (الأصل في الأشياء الإباحة)[1]، بناغە لە شتەكاندا بریتیە لە ڕەوایی، هەروەها بە نسبەت پاك و پیسییەوە، گوتوویانە: (الأصل في الأشياء الطهارة)، بناغە لە هەموو شتەكاندا ئەوەیە، كە بە پاك دادەنرێن، واتە: دەبێ بەڵگە هەبێ لەسەر پیسییان، ئەگەرنا هەر بەپاك دادەنرێن.

ئنجا بینا لەسەر ئەم بناغە شەرعییە، دوای ئەوەی ئێمە پێشتر - لە ئاڵقەی ڕابردوودا - ڕوونمانكردەوە كە هیچ بەڵگەیەك نیە لەسەر قەدەغەبوونی بەشدارییكردنی مسوڵمانان، لە پەرلەمانێكی تێكەڵدا، كە غەیری ئەوانیشی تێدایە، واتە: پەرلەمانێك كە ئەگەری ئەوەی لێدەكرێ یاسای ناشەرعیی تێدا دەربكرێ و، شتی حەڕامی تێدا حەڵاڵ بكرێ و، شتی حەڵاڵی تێدا حەڕام بكرێ، مادام هیچ بەڵگەیەك نیە لەسەر قەدەغەبوونی، مانای وایە لەسەر ئەسڵ و سروشتی خۆی، كە بریتیە لە ڕەوایی، ماوەتەوە، كەواتە: ئێمە ئێستا پێویستییمان بە هیچ بەڵگەیەك نیە بۆ ئیسپاتی ڕەوایی بەشدارییكردن لە پەرلەماندا، چونكە دەركەوت كە هیچ بەڵگەیەك نیە لەسەر قەدەغەبوونی، هەركاتێكیش هەڵسوكەوتەكان، بەڵگە لەسەر قەدەغەبوونیان نەبوو، كەواتە: ڕەوان، بەڵام بۆ زیاتر بەرچاوڕوونیی و دڵنیایی هەموو لایەك، پێنج (٥) جۆرە

---

(١) بڕوانە: (القواعد النورانية الفقهية) ابن تيمية، ص١١٢، و: (رسالة لطيفة جامعة في أصول الفقهه المهمة) عبدالرحمن بن ناصر السعدي، ص(١٠٥-١٠٦).

بەڵگە لەوبارەوە دێنینەوە، بەڵام سەرەتا دەمەوێ ئەوەش باس بکەم کە مەسەلەی بەشدارییکردنی مسوڵمانان لە هەڵبژاردنی پەرلەمان و لە حکوومەتدا، لەکاتێکدایە، کە مسوڵمانان بۆیان ناگونجێ، خۆیان قەوارەیەك پێك بێنن کە پابەند بێ بە شەریعەتەوە، چ لەڕووی یاسا دەرکردن و، چ لەڕووی جێبەجێکردنەوە.

ئنجا یەکسانیشە: ئەو بەشدارییکردنە، چ لە کۆمەڵگایەکی مسوڵمانی وەك هی خۆماندا بێ، چ لە کۆمەڵگایەکی نامسوڵمانی وەك وڵاتانی ڕۆژئاواو ڕۆژهەڵاتدا، واتە: مەسەلەکە ئەوەیە: ئایا مسوڵمانان چی بکەن، لە کاتێکدا دەستیان ناگاتە ئەنجوومەن و حکوومەت و کیان و قەوارەیەکی پابەند بە شەریعەتەوە؟! لەو حاڵەتەدا باسی ئەوە دەکەین، ئەگەرنا مادام مسوڵمانان بتوانن دەوڵەت و قەوارەیەکی پابەند بە شەریعەتەوە، بۆخۆیان دروست بکەن، ئەو کاتە هەر نابێ باسی ئەوە بکرێ: ئایا دروستە بچینە نێو پەرلەمانێکەوە کە یاساو بڕیاری ناشەرعیی تێدا دەدرێ، یان نا؟ بەڵکو ئەوە بەس لە حاڵەتی ناچارییدایە، چونکە زانایان وەك بنچینەیەکی شەرعیی دەڵێن: (للضرورات أحكامُها)، ناچارییەکان یاسای تایبەتی خۆیان هەیە، بەڵام دیسان وەك بنچینەیەکی دیکەی شەرعیی گوتوویانە: (الضرورات تُقَدَّر بِقَدَرِها)، ناچارییەکان ئەندازەگیریی خۆیان هەیە، ئەویش بەرهەڵدا نیە، کەواتە: دەبێ هەموو لایەك بزانن: کە ئێمە لێرەدا، قسە لە حاڵەتی نائاسایی دەکەین، ئەگەرنا حاڵەتی ئاسایی مسوڵمانان، ئەوەیە کە بۆخۆیان ئەنجوومەنی ڕاوێژیان هەبێ و، بۆخۆیان حکوومەت و، دەسەڵاتی دادوەریی و، دامودەزگاکانی بەڕێوەبردنی کۆمەڵگای خۆیانیان هەبێ، واتە: ئەوان تێیدا باڵادەست





بن، بەڵام ئەگەر حاڵەتی نائاسایی بوو و، مسوڵمانان ئەوەیان بۆ مەیسەر نەبوو، ئەوە وەك پێشتریش گوتمان، مسوڵمانان:

١- یان دەبێ وەك هاوەڵانی ئەشکەوت سەری خۆیان هەڵبگرن و بڕۆن.

٢- یان دەبێ تەسلیمی واقیعی ناشەرعیی بن.

٣- یان بە گۆشەگیریی و بێهەڵوێستیی دابنیشن.

٤- یان دەبێ بەچەك و هێز بە گژ واقیعدا بچنەوە.

٥- یان دەبێ مودارا لەگەڵ واقیع دابکەن و، بەشداریی دامەزراوەکانی بکەن و، ئەوەی کە پێیان شەرعییە و بە چاك و ڕاستی دەزانن، بیڵێن و بیکەن، کە بە تەئکید هەر ئەوەی کۆتاییان شتێکی ڕەوایە.

+ بەڕێز مامۆستا عەلی باپیر! ئەگەرچی لە کاتی دیکەدا باستکردوە، بەڵام ئایا مەبەستت لە پابەندیی پەرلەمان و حکوومەت بەشەریعەتەوە، واتە: مسوڵمان بەس خۆیان تێیاندا بن، یان دەرفەتی ئەوە هەیە غەیری خۆشیان تێیان دابن؟!

- بەڵێ لە ئەنجوومەنێکدا کە مسوڵمانان بۆ بەڕێوەبردنی کۆمەڵگای ئیسلامیی دیاریی دەکەن[1]، بوار هەیە کە غەیری مسوڵمانانی تێدابن و زۆربەی زانایانی هاوچەرخ، باسیانکردوە، کە هەموو پێکهاتەکانی کۆمەڵگا بۆیان هەیە نوێنەریان هەبێ لەوێدا، کە دەگونجێ لە کاتێکی دیکەدا باسی هەڵوێست و ڕەفتاری قەوارەیەکی ئیسلامیی لەگەڵ کەمایەتییە فیکریی و دینییەکاندا بکەین[2]، هەروەها لە

---

(١) هەروەها لە حکوومەتیش دا، وەك دوایی باسی دەکەین.

(٢) لە کتێبی چوارەمی مەوسووعەی: [ئیسلام و دەوڵەتداریی] دا بە ناوونیشانی:

حکوومەتیشدا، هەر دەگونجێ خەڵکی نامسوڵمان بەشداربێ، کاتی خۆی لە دەوڵەتی ئیسلامییدا، خەڵکی نامسوڵمان بەشدار بووە، بە پلەی وەزیرو پلەی جۆراوجۆر بەشدار بووە، بۆیە ئەو حکوومەت و ئەنجوومەن و قەوارەیە، چ هەمووی مسوڵمان بێ، چ زۆرینەی یان کەمینەی مسوڵمان بێ و، نفووزو دەسەڵات بە دەست مسوڵمانانەوە بێ، هەر بە ئیسلامیی دادەنرێ.

**پێنج جۆرە بەڵگە لەسەر بەشداریی کردن لە هەڵبژاردن و پەرلەمان دا :**

ئنجا با بێینە سەر خستنەڕووی پێنج جۆرە بەڵگەکان، سەرەتا بەکورتیی و بەڕیز، ئاماژەیان پێدەکەین و، پاشان یەك لەدوای یەك دەیانتوێژینەوە:

١- ئەو بنچینە شەرعییەی دەڵێ: ئەسڵ لەبواری عادەت و هەڵس و کەوتەکاندا، بریتیە لە ڕەوایی و دەستکراوەیی.

٢- چەند ئایەتێك کە ئاماژە بەو مەسەلەیە دەکەن.

٣- چەند فەرمایشتێکی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم). کە ئاماژە بەو پرسە دەکەن.

٤- ئامانجە شەرعییەکان (مقاصد الشريعة).

٥- چەند بەڵگەیەکی عەقڵیی و واقیعیی.

---

(نا مسوڵمانان لە کۆمەڵگا و دەوڵەتی ئیسلامیی دا) بەدرێژیی لەو بارەوە دواوین.

## جۆری یەکەم لە بەڵگەکان

## بنچینەی شەرعیی: ئەسل لە هەڵس وکەوتان دا: ڕەوایی و دەستکراوەییە

ئەو بنچینە شەرعییە کە دەڵێ: بناغە لە شتەکاندا ڕەواییە، (الأصل في الأشياء: الإباحة) یان: بناغە لە هەڵس و کەوت و عاداتەکاندا ڕەواییە (الأصل في المعاملات والعادات: الإباحة)، ئەم بنچینەیە، بنچینەیەکی گرنگە بۆ ئێمەی مسوڵمان کە ئێستا لەم واقیع و هەلومەرجانەدا کار دەکەین، کە بۆ ئێمە حاڵەتێکی نائاساییین، چونکە حاڵەتی ئاسایی مسوڵمانان و کۆمەڵگایەکی ئیسلامیی، ئەوەیە کە هەموو شتێکیان هەڵقوڵاوی شەریعەتەکەیان بێ و، خۆیان دەسەڵاتیان هەبێ، بەسەر هەموو کاروبار و ئیشەکانیاندا.

ئەم بنچینە شەرعییەش، زانایان بە چەند شێوەیەك تەعبیریان لێکردوە، بۆ وێنە: دەڵێن: (الأصل في العادات: العفو)، واتە: بناغە لە عادەتەکاندا بواردرانە.

هەروەها گوتووشیانە: (الأصل في العادات: الإباحة)، واتە: بناغە لەعادەتەکاندا ڕێپێدرانە.

جاری واشە گوتوویانە: (الأصل في المعاملات العفو)، کە مەبەست لە (عادات) و (معاملات) یەك شتە، واتە: ئەوەی کە خەڵك لەنێو خۆیاندا ڕەفتاری پێدەکەن، بەڵێ بناغە لە موعامەلە و عاداتەکاندا بریتیە لە بوارهەبوون.

ئنجا ئەمە لە بەرانبەریدا بنچینەیەکی دیکە هەیە، کە دەڵێ: (الأصل في العبادات: الحظر)، واتە: بناغە لەخوا پەرستییەکاندا، لێ قەدەغەکرانە.

یان: (الأصل في العبادات: الإتِّباع)، واتە: بناغە لەخواپەرستییەکاندا، شوێنکەوتنە، یانی: وەك چۆن: بناغە لە بواری عادەت و لە هەڵسوکەوتەکاندا، دەستکراوەیی و ڕەواییە، واتە هیچ شتێ لە هەڵسوکەوت و عادەتەکان، قەدەغە نیە، مەگەر دەقێکی شەرعیی قەدەغەی کردبێ، بە پێچەوانەوە: بواری عیبادەتەکان، بناغە تێیدا بریتیە لە قەدەغەکران، مەگەر شتێك شەرع بڕیاری بۆ دابێ و، داینابێ، یانی: ڕاست بە پێچەوانەی هەڵس و کەوت و عادەتەکانەوە، چونکە هەڵس و کەوت و عادەتەکان، بریتین لە ڕەفتار پێکەوەکردنی مرۆڤەکان، لە بوارەکانی سیاسیی و ئابووریی و کۆمەڵایەتییدا، بەڵام عیبادەت بریتیە لە هەڵسوکەوتی ئینسانەکان لەگەڵ خوادا، بۆیە دەبێ خوا (سبحانه وتعالى) بە بەندەکانی بفەرموێ: ئاوا مامەڵەم لەگەڵ بکەن، ئاوا ئیمانم بێنن و، ئاوا نوێژ بکەن و سەجدەو ڕکووع بەرن و، ئاوا ڕۆژوو بگرن و، ئاوا لێم بپاڕێنەوە و...هتد، دەبێ خوا بۆ خۆی بۆ بەندەکانی دیاریی بکات.

بەڵام هەڵس و کەوتەکان: خۆمان وەك ئینسان عەقڵمان پێ دەشکێ تا ڕاددەیەکی زۆر، چۆن پێکەوە مامەڵە بکەین! بەس پێویستییمان بە چوارچێوەیەکی فراوانی شەرعیی هەیە، تاکو لە حوکمی عەقڵ و فیترەت دەرنەچین.

+ ئایا ئەو بنچینەیە لە ئایەتێکەوە وەرگیراوە، یان هەر ڕێککەوتنی عەقڵیی زانایانە؟ سەرچاوەکەی چییە؟!

- ئەو بنچینەیە کە زۆربەی زانایان باسیان کردوە، لەوانە:

١- ئیبنو تەیمییە.

٢- نەوەویی.

٣- ئیبنو عەبدولسسەلام.

٤- شاطیبی.

٥- ئامودیی.

٦- ئەبو حامیدی غەززالیی.

بەڵێ ئەم بنچینەیە لە تێوەڕامانی دەقەکانی شەریعەت (قورئان و سوننەت) بەگشتی، هەڵهێنجراوە، کە هەموو بنچینە شەرعییەکانی دیکەش هەر وان.



ئێستاش ئاماژە دەکەین بەقسەی دوو لەزانایان، لەبارەی ئەم بنچینە شەرعییەوە.

١- (إبن تيمية) ڕەحمەتی خوای لێبێ لە کتێبی: (القواعد النورانية الفقهية)دا[1] دەربارەی ئەم بنچینە شەرعییە، دەڵێ:

[الأصل في العبادات التوقيف، فهو لا يشرع منها إلا ما شرعه الله، وإلاّ دخلنا في قوله تعالى: ﴿أَمْ لَهُمْ شُرَكَٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنۢ بِهِ ٱللَّهُ ...﴿٢١﴾﴾الشورى، والعادات الأصل فيها العفو، فلا يُحظَر منها إلا ما حرّمه الله تعالى، وإلاّ دخَلْنَا في معنى قوله: ﴿قُلْ أَرَءَيْتُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ لَكُم مِّن رِّزْقٍ فَجَعَلْتُم مِّنْهُ حَرَامًا وَحَلَٰلًا ...﴿٥٩﴾﴾يونس].

---

(١) ص:١١٢ .

واتە: بناغە لە خواپەرستییەکاندا بریتیە لە وەستێنران، (بەندە دەبێ بوەستێ) هیچ عیبادەتێك بە شەرعیی دانانرێ، مەگەر ئەوە کە خوا بە شەرعیی دانابێ و بەڵگەی لەسەر ناردبێ، چونکە هەر عیبادەتێك زیاد بکرێ، ئەوە دەچینە نێو مانای ئەم ئایەتەوە، کە دەفەرموێ:

﴿ أَمۡ لَهُمۡ شُرَكَـٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمۡ يَأۡذَنۢ بِهِ ٱللَّهُ ﴿٢١﴾ ﴾ الشورى.

واتە: ئایا چەند هاوبەشێکیان هەن: شتێکیان لە دین بۆ داناون، کە خوا ئیزنی لەسەر نیە؟!،

113

[کەواتە: هەر عیبادەتێك زیاد بکرێ، مانای وایە شتێك زیاد کراوە، کە خوا فەرمانی پێ نەداوە، چونکە عیبادەت بریتیە لەوە کە خوا یان فەرزی کردوە، یاخود پەسەندی کردوەو، عیبادەت تەنیا دوای فەرمانی خوا، دەیزانی کە ئەوە عیبادەتە، یان نا؟ کەواتە: هەر شتێك خوا فەرمانی پێ نەکردبێ، بە پێویست کردن، یاخود فەرمانی پێ نەکردبێ، بە بە پەسەند دانان، مانای وایە عیبادەت نیە، بۆیە هەر شتێك زیاد بکرێ لەلایەن ئینسانەکانەوە لە بواری عیبادەتدا، ئەوە قەدەغەیەو، بریتیە لەوە کە شەریك بۆ خوا بڕیار درابێ][1]، ئنجا دەڵێ: بەڵام عادەتەکان بناغە تێیاندا بریتیە لە عەفوو، [واتە: لێگەڕان و وازلێهێنران و، مرۆڤەکان دەستیان بەرهەڵدا کراوە، لە بواری مامەڵەو هەڵسوکەوت و عادەتەکاندا][2] هیچ کام لە

(1) نێوان کەوانەکان خۆم زیادم کردوە، بۆ رون کردنەوەی مەبست.

(2) نێوان کەوانەکان خۆم زیادم کردوە، بۆ رون کردنەوەی مەبست.

عادەتەکان قەدەغە ناکرێن، جگە لەوەی خوای بەرز قەدەغەی کردوون، چونکە هەر شتێك لە هەڵسوکەوت و عادەتەکان قەدەغە بکەین، کە شەرع قەدەغەی نەکردبێ، مانای وایە: پێچەوانەی فەرمانی خوا جووڵاوینەوە، کە دەفەرموێ:

﴿ قُلْ أَرَءَيْتُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ لَكُم مِّن رِّزْقٍ فَجَعَلْتُم مِّنْهُ حَرَامًا وَحَلَٰلًا قُلْ ءَآللَّهُ أَذِنَ لَكُمْ أَمْ عَلَى ٱللَّهِ تَفْتَرُونَ ﴿٥٩﴾ ﴾یونس،

واتە: ئەی موحەممەد! (صلى الله عليه وسلم) بڵێ: ئایا ئەو بژیوە دەبینن، کە خوا بۆی ناردوونە خوار، هەندێکیتان لە خۆتانەوە قەدەغەو، هەندێکیشتان حەڵاڵ کردوە، ئنجا ئایا خوا مۆڵەتی داون و فەرمانی پێکردوون وابکەن، یاخود بە ناوی خواوە بوختان و درۆ دەکەن؟!

کەواتە: هەرشتێك لە بواری هەڵسوکەوتەکاندا، قەدەغە بکرێ بەبێ دەقێکی شەرعیی، مانای وایە: شتێك کراوە پێچەوانەی فەرمانی خوا، چونکە خوا دەفەرموێ: لەخۆوە شت قەدەغە مەکەن، وەك خوای پەروەردگار لە سوورەتی (المائدة)دا دەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تُحَرِّمُوا۟ طَيِّبَٰتِ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكُمْ ... ﴿٨٧﴾ ﴾ المائدة.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ئەو شتە خۆش و بەتام و سوودبەخش و چاکانەی، خوا بۆی حەڵاڵ کردوون، قەدەغەیان مەکەن.

٢- ئنجا با بچین بۆ لای زانایەکی دیکە، داخۆ ئەو چۆن تەعبیر لەم بنچینە شەرعییە دەکات؟ (عبدالرحمن بن ناصر السّعدي) لە

کتێبێکیدا بە ناوی: (رسالة لطيفة جامعة في أصول الفقه المهمة)[1]، واتە: [نامیلکەیەکی بچووکی کۆکەرەوە دەربارەی بنچینە گرنگەکانی فیقە]، دەڵێ: (الأصل في العبادات: الحظر، إلاّ ما ورد عن الشارع تشريعه، والأصل في العادات: الإباحة، إلاّ ما ورد عن الشارع تحريـمه)، واتە: بناغە لە عیبادەتەکاندا بریتیە لە قەدەغەکران، جگە لەوەی شەرعدانەر بە ڕەوای دانابێ و، بڕیاری لەسەر دابێ، بەڵام بناغە لە عادەتەکاندا، بریتیە لە ڕەوایی، جگە لەوەی کە شەرعدانەر (کە خوایە سبحانه وتعالى) قەدەغەی کردوە.

ئنجا بۆ زیاتر سەلماندنی ڕاستیی ئەم ڕایە، دەڵێین: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: (({مَنْ أَحْدَثَ فِي أَمْرِنَا هذَا مَا لَيْسَ فِيهِ فَهُوَ رَدٌّ}[2]، واتە: هەر کەسێك لەم دینەی ئێمەدا، شتێك پەیدا بکات، کە لەو نەبێ، ئەوە ڕەتکراوەیە.



کە لێرەدا مەبەستی بواری ئیمان و عیبادەتە، چونکە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە بواری هەڵسوکەوت و عادەتەکاندا فەرموویەتی: ئێوە لە کاروباری دنیاتان دا شارەزاترن، وەك لە ڕووداوی مووتوربەکردنی دارخورمایاندا هاتوە، کە پێغەمبەری خوا بەلای کۆمەڵێکدا تێپەڕی، دارخورمایان موتوربە دەکردو فەرمووی: ئەگەر واش نەکەن زەرەری نیە، ئەوانیش وازیان لە موتوربەکردنیان هێناو، سەرەنجام دار خورمایەکان بەریان نەگرت، دوایی چوونە لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) گوتیان، ئەی پێغەمبەری خوا!

---

(١) ص ١٠٥، ١٠٦.

(٢) أخرجه البخاري: ٢٦٩٧، ومسلم: ١٧١٨

دار خورمایەکان بەریان نەگرت! فەرمووی: بۆچی؟ گوتیان: تۆ فەرمووت: ئەگەر واش نەکەن زەرەری نیە، ئەویش فەرمووی: ئەگەر شتێکم پێ گوتن کە ئەوە خوا فەرموویەتی، لێم وەربگرن، بەڵام ئەگەر شتێکم دەربارەی کاروباری دنیا گوت، وەك بۆچوونی خۆم: ((أنتم أعْلمُ بأمور دنياكم))[1]، ئەوە ئێوە بە کاروباری دنیاتان شارەزاترن، کەواتە: ئیمان و عیبادەت و ئەوشتانە کە لە وەحییەوە نەبێ نازانرێن، ئەوە (توقيفي)ین و، دەبێ تێیاندا لەو شوێنە بوەستین کە دیاریی کراوە، بەڵام لە بواری هەڵسوکەوت و عادەتەکاندا، دەستمان کراوەیە، چونکە خوای بەبەزەیی لە چەندان ئایەتدا، ڕایگەیاندوە کە هەموو شتێکی بۆ بەندەکانی خوڵقاندوەو دەستی ئاوەڵا کردوون، بۆ وێنە:

١- لە سووڕەتی (البقرة)دا دەفەرموێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ لَكُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا ... ﴿٢٩﴾ ﴾.



واتە: خوا ئەو کەسەیە کە هەرچی لەسەر زەوییە، بۆ هەمووتانی خوڵقاندوە، یان: هەرچی لەسەر زەوییە، هەمووی بۆ ئێوەی خوڵقاندوە.

٢- لە سووڕەتی (الجاثية)دا دەفەرموێ: ﴿ وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ ... ﴿١٣﴾ ﴾الجاثية.

واتە: هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوییدایە، بۆ ئێوەی خوڵقاندوە، لەلایەن خۆیەوە، کەواتە: هەموو شتەکان و، هەموو هەڵسوکەوتەکان لە ئەسڵدا ڕەوان، چونکە خوا ئەم ژیان و نیعمەت و بوونەی بۆ ئینسان ڕەخساندوەو، مەگەر ئەوەی بە دەقێکی ڕۆشن قەدەغەی

---

(١)) رواه مسلم، به ژمارە: ٢٣٦١،٢٣٦٢،٢٣٦٣.

کردبێ، ئەگەرنا هیچ شتێك و هیچ جۆرە مامەڵەو هەڵس و کەوتێك، قەدەغە نیە.

ئنجا بێگومان: بەشدارییکردن یان نەکردن لە پەرلەماندا، لە بواری هەڵسوکەوتەکاندایەو، هیچ دەقێکی لەسەر نیە کە قەدەغەی کردبێ، کەواتە: لە ئەسڵدا ڕەوایە، دەمێنێتەوە ئەوە کە ئایا قازانجی تێدایە بەشداریی تێدا بکرێ، یان زەرەری تێدایە؟ کە ئەوەش دەکەوێتەوە سەر بۆچوونی ئەو کۆمەڵ و خەڵکەو، دەتوانن بەشداریی بکەن، ئەگەر وا بزانن قازانجی تێدایەو، دەشتوانن نەچن، ئەگەر زەرەری تێدا ببینن.

+ مامۆستا! لەم بەڵگەو بنچینەیەوە، شتێك تێدەگەین، ئەویش ئەوەیە کە خوای گەورە دەرفەتی زۆری بە ئینسان داوە، عەقڵی خۆی بەکاربێنێ، بەڵام هێندێك لە مامۆستایان و بانگخوازان، پێناسەیەك بۆ ئیسلام دەکەن، کە لە قورئاندا هەموو شتێك بڕێنراوەتەوەو، خوای کاربەجێ هەموو شتێکی بۆ دیاریی کردووین، ئنجا ئایا ئەمە چۆنە؟!

- ئەوەی کە وا دەڵێ، دەبێ بزانێ دەڵێ چی؟ ئەگەر بڵێ: خوای پەروەردگار هەموو شتێکی لە قورئاندا بۆ بڕاندووینەوە، ئەوە ڕاستە بە مانایەك و، هەڵەیە بە مانایەکی دیکە:

أ- ڕاستە بەومانایە کە خوا - سبحانه وتعالى - لە قورئاندا هێڵ و بنچینە گشتییەکانی هەموو شتێکی بۆ داناوین، وەك فەرموویەتی:

﴿ وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ تِبْيَٰنًا لِّكُلِّ شَىْءٍ (٨٩) ﴾ النحل.

واتە: کتێبمان دابەزاندۆتە سەرت ڕوونکەرەوەی هەموو شتێکە.

مەبەست هەرشتێکە کە پێویست دەکات و، عەقڵی ئینسان نایبڕێ.

ب- بەڵام ئەگەر مەبەست ئەوەبێ کە خوا هەموو وردەکارییەکانی باس کردوون، ئەوە وانیە، چونکە ئەگەر خوا هەمووشتێکی ڕوونکردۆتەوە، ئەدی بۆچی بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:

﴿... وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾﴾النحل.

واتە ئێمە زیکرمان بۆ تۆ ناردوە، تاکو ئەوەی بۆیان نێردراوەتە خوار، بۆیان ڕوون بکەیەوەو، بۆ ئەوەی خۆشیان بیر بکەنەوە، کەواتە: تەنیا ڕوونکردنەوەی پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) بەس نیە، بەڵکو دەبێ مرۆڤەکان خۆشیان بیر بکەنەوە، ئەوکاتە دەتوانن قورئان جێبەجێ بکەن، کەواتە: قورئان پێویستیی بە ڕوونکردنەوەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)و، بیرکردنەوەی ئێمەش هەیە، ئەوکاتە دەتوانین لەقەدەر خۆمان لێی تێبگەین و جێبەجێ بکەین.

## جۆری دووەم، لە بەڵگەکان
## چەند ئایەتێکی قورئان

دەتوانین زۆر ئایەتان بێنینەوە لەسەر ئەوە، کە ڕەوایە: بچیە پەرلەمانێکی بەو شێوەیەوە کە باسمان کرد، کە لەوێدا ئەوەی هەق و ڕاستە بیڵێی و، ئەوەی ناڕاست و ناهەقە، بەرپەرچی بدەیەوە و ڕێی لێ بگری و، بەپێی توانا هەوڵ بدەی: لە ڕێی ئەو مینبەرەوە لەگەڵ هەق و، دژی ناهەق بی و، شتێك بکەی کە بە قازانجی خەڵك و کۆمەڵگایەکەت بێ:



١- یەکێك لەو ئایەتانە، ئایەتی ژمارە (١٢٥)ی سوورەتی (النحل)ە کە خوای پەروەردگار فەرمانمان پێدەکا و دەفەرموێ:

﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ ... ﴾.

واتە: بانگەواز بکە بۆ لای ڕێبازی پەروەردگارت، بە حیکمەت و لێزانیی و، ئامۆژگاریی چاك و، بە چاکترین شێوە وتووێژو موناقەشەیان لەگەڵدا بکە.

ئنجا ئەو بانگەوازکردنە بۆ ڕێی پەروەردگار، چ لە نێو پەرلەمان بێ، چ لە دەرەوەی پەرلەمان بێ، هەر واجبە، بەڵام بە تەئکید تۆ لەنێو هەڵبژاردەی کۆمەڵگایەکدا، بچی بانگەواز بکەی بۆ لای ڕێبازی خواو یاساکانی شەریعەت، زۆر جیاوازە لەوەی کە لە کۆڵان و جادەو هۆڵێك و، بۆ کەسانێکی دیارییکراو، یان کەسانێکی گشتیی

قسە بکەی، ئەوە لە کوێ تۆ قسە بکەی بۆ هەڵبژاردەو نوێنەرانی خەڵك، یان قسە بکەی بۆ خەڵکێك بە گشتیی!!

٢- هەروەها بەپێی ئایەتەکانی قورئان: لەسەر مسوڵمانان پێویستە: بانگەواز بکەن بۆ چاکەو فەرمان بە پەسند بکەن و، رێ لەخراپە بگرن، واتە: فەرمان بە هەر شتێکی پەسەند بکەن و، رێگا لە هەر شتێکی ناپەسەند بگرن، وەك خوا لە سوورەتی (آل عمران) ئایەتی (١٠٤)دا، دەفەرموێ:

﴿ وَلۡتَكُن مِّنكُمۡ أُمَّةٞ يَدۡعُونَ إِلَى ٱلۡخَيۡرِ وَيَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴾.

واتە: با لە ئێوەدا کۆمەڵێك هەبن، [یاخود ئێوە کۆمەڵێك بن] کە بانگەواز دەکەن بۆ چاکە و، فەرمان دەکەن بە شتە باش و پەسەندکان و، رێ دەگرن لە شتە ناپەسەندو خراپەکان و، هەر ئەوانەش سەرفرازن.

ئاشکراشە کە بانگەواز کردن بۆ چاکەو، فەرمانکردن بە پەسندو، رێگریی لە ناپەسند، سەرجەم بوارەکانی دینداریی و دنیاداریی دەگرنەوە: فیکرو عەقیدە، عیبادەت و تەزکیە، خوو و رەوشت، لایەنی خێزانیی، لایەنی کۆمەڵایەتیی، لایەنی سیاسیی، لایەنی ئابووریی... هتد.

ئنجا بە تەئکید مرۆڤ لە هەموو شوێنێك، لە سەری پێویستە لەگەڵ چاکەدا بێ و پشتگیریی بکات و دژی خراپە بێ و پێشگیریی لێبکات، بەتایبەت لە شوێنێکدا کە یاسای لێدەردەچێ و، شوێنی لێپرسینەوەو چاودێرییکردنی حکوومەتەو، شوێنی زانینی ئەوەیە کە واریدات چی هەیەو، خەرج و نەفەقات چۆن دەکرێ؟! لەوێ پێویستترە ئەو فەرمان بە چاکەیەو، نەهی لە خراپەیە ئەنجام بدەی.

٣- هەروەها خوای کارزان دەفەرموێ: ﴿...وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡبِرِّ وَٱلتَّقۡوَىٰۖ وَلَا تَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡعُدۡوَٰنِۚ ...﴿٢﴾﴾ المائدة.

واتە: هاوکاریی یەکدی بکەن لەسەر چاکەکاریی و پارێزکاریی و، هاوکاریی یەکدیی مەکەن لەسەر گوناهـ و دەستدرێژیی ...، کەواتە: هەر شتێك بۆ خەڵك چاك بێ و، بۆ لای خوا مایەی تەقوابێ، مسوڵمان لەسەری پێویستە دەستبارگری خەڵك بێ بۆ وەدیهێنانی، ئنجا ئەگەر کەسانێك ئەنجوومەنی نیشتیمانی یاخود ئەنجوومەنی نوێنەران، دەکەنە شوێنی بانگەشە بۆ خراپە، مسوڵمان دەیکاتە شوێنی بانگەشە بۆ چاکە، ئەگەر ئەوان دەیکەنە شوێنی خۆتێکهەڵبەستن بۆ خراپە و دەستباریی یەکدی گرتن بۆ خراپە، ئەو دەیکاتە شوێنی دەستبارگرتن لەگەڵ خەڵك دا، بۆ شتی چاکەو پەسندو، مایەی خێرو خۆشیی خەڵك.

چونکە بەدەقی قورئان هاوکاریی و دەستبارگرتن بۆ چاکەکاریی و پارێزکاریی فەرزە.

٤- هەروەها خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُواْ قَوَّـٰمِينَ بِٱلۡقِسۡطِ ...﴿١٣٥﴾﴾ النساء،.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! زۆر دادگەریی بەڕێوەبەرن و بیچەسپێنن، بەڵێ مسوڵمان لە سەری پێویستە، لە هەموو شوێنێك دادگەریی بچەسپێنێ و، ستەم و زوڵم لابەرێ، بەڵام لەو شوێنەدا کە نێوەندی بڕیاردانە، زیاتر لەسەری پێویستە کە تێیدا هەوڵ بدات، دادگەریی بچەسپێنێ و زوڵم و ستەم لابەرێ.

## جۆری سێیەم، لەبەڵگەکان
## چەند فەرموودەیەك

جۆری سێیەمی بەڵگەکانمان، چەند فەرموودەیەکەو، فەرموودەی پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) لەوبارەوە زۆر زۆرن، بەڵام ئێمە تەنیا دووانمان بە نموونە هێناونەوە:

١- یەکیان ئەو فەرموودەیە کە موسلیم گێڕاویەتەوە، کە دەفەرموێ: ((من رأى منكم منكراً، فليغيِّـره بيده، فإن لم يستطع فبلسانه، فإن لم يستطع فبقلبه، وذلك أضعف الإيمان))[1].

واتە: هەر کامێکتان شتێکی ناپەسەندی بینی، با بەدەستی بیگۆڕێ [ئەگەر توانی]، ئەگەر نەیتوانی بە زمان و، ئەگەر نەیتوانی با بەدڵ پێی ناخۆش بێ، لە ڕیوایەتێکی دیکەدا هاتوە: ((وليس وراء ذلك مثقال حبة خردل من إيـمان))، واتە: لەدوای پێناخۆشبوونی دڵیشەوە، هێندەی قورسایی دەنکە خەرتەلەیەك ئیمان نیە، واتە کەسێك نە بە دەست خراپە بگۆڕێ و، نە بە زمان خەریکی گۆڕینی بێ و، نە بە دڵیش پێی ناخۆش بێ، هێندەی دەنکە خەرتەلەیەك ئیمانی نیە، چونکە هیچ هەڵوێستێکی نەبووە لە بەرانبەر ناپەسەندیی و ناشەرعییدا، کەواتە: بەپێی ئەم فەرمایشتە: لەسەرمان پێویستە ناپەسەندیی و ناشەرعیی بگۆڕین، ئنجا ئایا لە کۆمەڵگای ئێمەدا، زوڵم و زۆرو گەندەڵیی و خراپەو شتی ناشەرعیی و ناپەسەندو ناشیرینی زۆر نیە، کە خەڵکی بێزار کردوە؟! بە تەئکید با، ئاشکراشە کە پەرلەمان گونجاوترین هۆکارو شوێنە، بۆ ئەو

---
(١) رواه مسلم: ١٨٦.

گۆڕین و چاکسازییە، چونکە لەوێوە دەنگت دەگاتە هەموو خەڵك، لەسۆنگەی ئەوەوە کە هەڵبژاردەو نوێنەرانی خەڵکەکە لەوێن.

٢- فەرمووودەیەکی دیکەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کە هەر لە سەحیحی موسلیمدا هاتوە، دەفەرموێ: ((إنه يستعمل عليكم أمراء، فتعرفون و تُنكرون، فمن كره فقد برِيء، ومن أنكر فقد سَلِمَ، ولكن من رضي وتابَعَ))[1]، واتە: کاربەدەستانێکتان بەسەرەوە دادەنرێنن، کە هەندێ شتیانتان پێ چاکەو هەندێ شتیانتان ڕەخنەتان لێی هەیە، [ئنجا خەڵکەکە دەکاتە سێ بەش و دەفەرموێ:]

١) {فمن كره فقد برِيء}، هەرکەس خراپەی ئەوانی پێ ناخۆش بێ، ئەوە بەڕائەتی بۆ خۆی هێناوەتە دی، [واتە: گوناحی نایەتە

١٢٣ سەرو مادام خراپەی گوناهکارانی پێ ناخۆش بێ، بەشدار نیە لە گوناهەکەیاندا، کە ئەوە لای کەمیەتی].

٢- {ومن أنكر فقد سَلِمَ}، [بەڵام لەوە باشتر ئەوەیە کە مرۆڤ ڕەخنەی لێ بگرێ و، هەوڵ بدات ئەو خراپەیە نەهێڵێ، واتە: بەگژ خراپەکانیاندا بچێتەوە] هەرکەسێك بە گژ خراپەکانیاندا بچێتەوە، ئەوە سەلامەت بووە، [ئەوی پێشێ هەر بەرییە، بەڵام ئەمە سەلامەتیشە]،

٣- (ولكن من رضي وتابع) بەڵام کەسێك ڕازیی بێ و لەگەڵ ئەو ناشەرعییانەشدا بێ!! [وەڵامەکەی نەداوەتەوە، یانی: لە هەموو گوناهەکانیاندا بەشدارە] کەواتە: کەسێك ستەم و خراپەو ناشەرعیی دەبینێ و بێدەنگ و بێهەڵوێستە، ئەوە نیشانەی ڕازییبوونیەتی و، لەو خراپەو ناشەرعییانەشدا بەشدارە.

---

(١) أخرجه مسلم: ٤٩٠٧.

## جۆری چوارەم، لە بەڵگەکان
## ئامانجە شەرعییەکان

جۆرێکی دیکە لەو بەڵگانە، ئامانجەکانی شەریعەتە، ئێمە ئەگەر لە ئایەتەکانی قورئانەوە ڕابمێنین، کە زانایان پێی دەڵێن: (إستقراء نصوص الشريعة) واتە: تێوەڕامان و سەرنجدانی دەقەکانی شەریعەت، بەڵێ بە تێوەڕامانی دەقە شەرعییەکان، کۆمەڵێك ئامانجی شەرعییمان دێنە دەست، کە بەڵگەی ئیسپاتی ڕەوایی بەشداریی تێداکردنی، ئەوجۆرە ئەنجوومەن و پەرلەمانەن، کە باسمان کرد:

١- یەکێك لەوانە: شەریعەت بۆ ئەوە هاتوە کە بەرژەوەندیی خەڵك بێنێتە دی، ئنجا بەرژەوەندیی (مصلحة)ی خەڵك بریتیە لە دوو شت:

١) هێنانەدی قازانجەکان.

٢) دوورخستنەوەی زیانەکان (جلب المنافع و دفع المضار)،

تەماشای هەموو دەقەکانی شەریعەت بکەن، دەگەنە یەك ئەنجام، ئەویش ئەوەیە کە شەریعەت بۆیە هاتوە، بەرژەوەندیی خەڵك بێنێتە دی: بەرژەوەندیی دنیاو قیامەتیان، بەرژەوەندیی جەستەو ڕووحیان، بەرژەوەندیی تاك و خێزان و، کۆمەڵگاو دەوڵەتیان، کەواتە: تۆ لە هەر ڕێیەکەوە بەرژەوەندیی خەڵکت بۆ بچەسپێ، پێویستە لەو ڕێیەوە بڕۆی و، لەهەر ڕێیەکەوە پێچەوانەی بەرژەوەندییت - کە خراپە (مفسدة)یە - بۆ دوور بخرێتەوە، دیسان لەسەرت پێویستە، ئنجا ئێمە بە بەشدارییکردنمان لە ئەنجوومەنی نوێنەراندا، باشتر دەستمان دەڕوات بۆ ئەوەی بەرژەوەندیی خەڵك و کۆمەڵگاکەمان بچەسپێنین.

٢- بە سەرنجدانی دەقەکانی شەریعەت، بۆمان دەردەکەوێ کە بەرزترین و پیرۆزترین بەها، کە پێغەمبەران بۆی هاتوون بیچەسپێنن، بریتیە لە داد (عدل)و، خراپترین ڕەفتار کە پێغەمبەران هاتوون لای بەرن، بریتیە لە ستەم و زوڵم (ظلم)، بە بەڵگەی ئەوەی کە خوای بێ وێنە (سبحانه وتعالى) لە ئایەتی (٢٥)ی سووڕەتی (الحديد)دا دەفەرموێ:

﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلْقِسْطِ ... ﴿٢٥﴾﴾ الحديد

واتە: بێگومان هەموو پێغەمبەرانمان بەبەڵگە ئاشکرایەکانەوە ڕەوانەکردوون و، کتێب و تەرازووشمان پێدا ناردوون، تاکو خەڵك بە دادگەریی بەڕێوە بچن.

١٢٥

بەڵێ چەسپاندنی دادگەریی، ئامانجی هەموو پێغەمبەران بووە صەڵات و سەلامی خوایان لەسەربێ، ئنجا دیارە عەدل ناچەسپێ، تاکو زوڵم لانەبرێ، ئنجا تۆ لە ڕێی ئەو پەرلەمانەوە، لە هەموو ڕێیەك باشتر دەستت لەوە گیر دەبێ، کە بتوانی دادگەریی بچەسپێنی و، یاسای وا دەربکەی دادگەریی و بەرژەوەندیی خەڵکی تێدابێ و، ستەم و خراپەو فەسادی پێ لابچێ، ئنجا بۆ سەلماندنی ئەوە کە شەریعەت بۆ هێنانەدی بەرژەوەندیی و چاکسازیی تێداکرانی کۆمەڵگاو چەسپاندنی دادو، لابردن و نەهێشتنی ستەم و خراپە (فساد) هاتوە، دەتوانین ئاماژە بەم چەند ئایەتە بکەین:

أ- خوا -سبحانه وتعالى- لە سووڕەتی (الفجر)دا دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ طَغَوْاْ فِى ٱلْبِلَٰدِ ﴿١١﴾ فَأَكْثَرُواْ فِيهَا ٱلْفَسَادَ ﴿١٢﴾﴾ الفجر،

ب-واتە: ئەوانەی کە لە وڵاتاندا (لەخوا)یاخیی بوون و، پڕیان کرد لە فەساد.

ئەوەی کە ئێستا پێی دەڵێن: (گەندەڵیی)، بەڵام (فساد) لە قورئاندا واتاو مەفهوومێکی گشتیی هەیەو، بوارەکانی: سیاسیی و ئیداریی و ئەخلاقیی و ئابووریی و کۆمەڵایەتیی و... هتد، هەمووی دەگرێتەوە، کەواتە: لە ئەنجامی سەرکێشیی و یاخیبوون لە خوادا، فەساد بڵاودەبێتەوە!

ج- پێغەمبەر (شعیب) بە هۆزی (مدین) دەفەرموێ: ﴿...إِنْ أُرِيدُ إِلَّا ٱلْإِصْلَٰحَ مَا ٱسْتَطَعْتُ ... ﴿٨٨﴾﴾هود.

واتە: من جگە لە چاکسازیی شتێکی دیکەم ناوێ، کەواتە: پێغەمبەران هاتوون ئیسڵاح بکەن، بەڵام طاغووت و فیرعەونەکان هاتوون ئیفساد بکەن، مانای وایە شەریعەت هاتوە بۆ ئیسڵاح و چاکسازیی و، لابردنی ئەو فەسادو فەوزایەی کە طاغووت و فیرعەونەکان بڵاویان کردۆتەوە.



پوختەی قسان:

ئامانجی هەرە گەورەی شەریعەتی خوای کاربەجێ، هێنانەدی بەرژەوەندیی مرۆڤە، بەتاك و خێزان و کۆمەڵگاوە، کە دیارە ئەمەش بەبێ چەسپاندنی دادگەریی و چاکەکاریی و، لابردن و نەهێشتنی ستەم و خراپەکاریی، دەستەبەرنابێ، ئنجا لەسۆنگەی ئەوەوە کە ئەنجوومەنی ڕاوێژ (پەرلەمان) مەڵبەندی بڕیارو یاسادانانی وڵاتەو، ئاویش کە لە سەرچاوەو بنەوان لێڵ بوو، لە جۆگا ڕوون نابێتەوە، بۆیە بەشداربوون لەو مەڵبەندی بڕیاردان و یاسادانانەدا، نەك هەر ڕەوا، بگرە پێویستیشە، بۆ ڕێگرتن لەبڕیارو یاسای خراپ و سەقەت و، هاوکاریی کردن، یان دەسپێشخەربوون بۆ دەرکردنی بڕیارو یاسای وا، کە بەرژەوەندیی خەڵك و وڵات دابین بکەن.

## جۆری پێنجەم، لە بەڵگەکان
## چەند بەڵگەیەکی عەقلیی و واقیعیی

جۆرێکی دیکە لە بەڵگەکان، چەند بەڵگەیەکی عەقلّیی و واقیعیین، کە بە کورتی ئاماژەیەکیان پێ دەکەین:

**یەکەم:** پەرلەمان مینبەرێکە دەتوانی هەقی لەسەر بلّێی و بانگەوازی چاکەی لەسەر بکەی، هی وا هەیە دەڵێ: یاساکان هەر دەردەچن، ئێمە بەشداربین یان نا، چونکە ئێمە کەمینەین! دەڵێین: نەخێر مەرج نیە، دوێنێ کەمینە بووی، ڕەنگە سبەینێ ببی بە زۆرینە، ئنجا ئەو خەڵکەش نابێ هەموویان گومانی خراپیان پێبەری، هەیە لە هەندێ شتی حەقدا لەگەڵتدایە، ئنجا خراپترین ئیحتیمال ئەوەیە کە تۆ هەق و چاکەت بۆ نەچەسپێ، بەڵام لانیکەم: بۆ خەڵکت دەرخستوە، کە بڕیاری شەرع ئەوەیەو، بۆ قیامەت خەڵك بیانووبڕاو کراوە! کە ئەمەش ئامانجێکی گەورەی ڕەوانەکرانی پێغەمبەرانە (صلی الله علیهم وسلم):

﴿ رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةٌۢ بَعۡدَ ٱلرُّسُلِۚ ... ﴿١٦٥﴾ ﴾النساء.

واتە: پێغەمبەرانێکی موژدە دەرو ترسێنەرن، تاکو خەڵکی دوای(هاتنی) پێغەمبەران بەڵگەیان لەسەر خوا نەبێ...

**دووەم:** ئەندامانی پەرلەمان پارێزبەندیی (حصانة)یان هەیەو پارێزراون، یانی خاوەنی کەسایەتیی خۆیانن و، قسەیان دەڕوات و، لە بەرانبەر

حکوومەت و دامودەزاگاکاندا، جۆرێك لە پارێزراوییان هەیەو، باشتر مەجالیان هەیە کە فەرمان بە چاکەو نەهی لە خراپە بکەن.

سێیەم: بڕیارو یاساکانی پەرلەمان بەناوی خەڵکەوە دەردەچن، ئنجا کە بەناوی خەڵکەوە دەردەچن، بۆچی نوێنەرانی ئەو خەڵکە مسوڵمانە لەو پەرلەمانەدا نەبن، کە بڵێن: ئێمە لەو یاساو بڕیارە ناڕازیین، چونکە ئەگەر کەسێك لەوێ نەبێ، قسەی شەرعیی بکا، مانای وایە ئەو پەرلەمانە بڕیار دەداو، بە ناوی ئەو خەڵکە مسوڵمانەشەوەیە! کەواتە: لە ڕاستییدا بۆ دیفاع کردن لە ئیرادەو ڕای ئەو خەڵکە مسوڵمانە، کە لە شتی ناشەرعیی ناڕازییە، دەبێ نوێنەرانێکیان هەبن.

چوارەم: سوودێکی دیکەی ئەو بەشدارییە، ئەوەیە کە کەسانێك پڕاوەیان پێبکرێ و ڕابهێنرێن، چۆن کار بکەن و چۆن ئیدارەی وڵات بکەن؟ چونکە کەس لە سکی دایکی خۆیدا فێر نابێ و، ئەگەر لە دام و دەزگاکانی کۆمەڵگاکەمان دوور بین و، نەتوانین تەفاعولیان لەگەڵدا بکەین، بەتەئکید دواییش هەر ناشێ و، نەشارەزاو، بێ توانا دەبین.

پێنجەم: هەروەها بەرگریی کردن لە ماف و ئازادیی و بەرژەوەندییەکانی خەڵك، کە لەگرنگترین ئامانج و مەبەستەکانی شەریعەتە، یەکی دیکەیە لە بەڵگەو پاساوەکانی ئەو بەشدارییی کردنە.

+ ئەدی سەبارەت بە ڕای زانایانی هاوچەرخ، ئەوان چی دەڵێن؟

- بەڕاستیی قسەی زانایان، وەك گوتراوە: «أقوال العلماء يُستدلُّ لها ولا يُستدلُّ بها»، واتە: قسەی زانایان بەڵگەی بۆ دەهێنرێتەوەو بە

بەڵگە ناهێنرێتەوە، ئەگەرنا زۆربەی هەرە زۆری زانایانی هاوچەرخ، ئەو ڕایەیان هەیە، كە ئێمە بە بەڵگە سەلماندمان ڕاست و بەجێیە.

## هەڵوێست و بیروڕای زانایانی هاوچەرخ:

١- سەرجەم كۆمەڵ و جم و جۆڵە ئیسلامییەكان بەبێ هەڵاواردن (إستثناء) واتە: هەموو ئەوانەی كە لە گۆڕەپانی كاری ئیسلامییدان، كەم و زۆر لەگەڵ بەشدارییكردندان لە دامەزراوەكانی نێو كۆمەڵگادا، هەر لە سەردەمی (حَسَن البنّا)وە، خوا لێی خۆشبێ، كە (برایانی مسوڵمان)ی دامەزراند، هەتا (أبوالأعلى المودودي) خوا لێی خۆشبێ، كە (كۆمەڵی ئیسلامیی پاكستان)ی دامەزراند، هەتا ئیسلامییەكانی توركیاو مالیزیاو فیلیپین و بەنگلادیش و عالەمی عەرەبی، هەموویان لەگەڵ ئەو ڕایەن.



٢- پاشان (شیخ ناصرالدین الألباني) فەرمووودەناسی ناوداری ئەم سەردەمەی ئێمە، ڕەحمەتی خوای لێبێ، كە پرسیاری لێكراوە[1] كە مسوڵمانانی جەزائیر (جبهة الإنقاذ) پرسیاریان لێكردوە: ئایا دروستە بەشدار بین لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا؟!، لە درێژەی وەڵام و قسەكانیدا دەڵێ: «ولكن لا أرى ما يمنع الشعب المسلم إذا كان في المُرَشَّحين من يعادي الإسلام، و فيهم مُرَشَّحون إسلاميون من أحزاب مختلفة المناهج، فننصح في الحالة هذه، كلَّ مسلم أن ينتخب من الإسلاميين فقط»، واتە: بەڵام لەم حاڵەتەدا هیچ بەربەستێك نابینم لەبەردەم میللەتێكی مسوڵماندا، مادام لە كاندیدەكاندا كەسانێك هەبن دژایەتیی ئیسلام بكەن، كەسانێكی دیكەش هەبن كە لە لایەنە ئیسلامییەكان بن، كە بەرنامەی جیاجیایان

---

(١)بڕوانە (فقه النوازل) ج٤ ص ٤٠٠، محمد بن حسين الجيزاني.

هەن، لەو حاڵەتەدا ئامۆژگاریی هەر مسوڵمانێك دەكەین، كە تەنیا دەنگ بدات بە ئیسلامییەكان و، بەس ئەوان هەڵبژێرن.

٣- (الشيخ عبدالله بن عبدالعزيز بن باز) خوا لێی خۆشبێ یەكێكی دیكەیە لەو زانایانەی كە لەو بارەوە پرسیای لێكراوە، وەك خاوەنی كتێبی (المشاركة في الحياة السياسية)، (د. مشير عمر المصري)، هێناویەتی[1] پرسیاری لێكراوە، دەربارەی هەڵبژاردن و بەشداریی كردن لە ئەنجوومەنی گەل (مجلس الشعب)دا، ئەویش گوتوویەتی: {إن النبـي (صلى الله عليه وسلم) قال: (إنّما الأعمال بالنيات، وإنما لكل امريء ما نوى))، متفق عليه، لذا فلا حرج في الإلتحاق بمجلس الشعب إذا كان المقصود من ذلك تأييد الحق و عَدَم الموافقة على الباطل}، واتە: پێغەبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {كردەوەكان بە پێی نیەتەكانن، هەر كەسە بەپێی نیەتەكەی كردەوەی بۆ دەنووسرێ}، بۆیە هیچ سەغڵەتییەك نابینم لەوەدا كە ئینسان بچێتە نێو مەجلیسی شەعب (واتە: پەرلەمان) مادام مەبەست لەوەدا پشتگیرییكردنی حەق بێ و، دژوەستانەوەی باتڵ بێ.

٤- یەكێكی دی لەو زانایانە (ابن العثيمين)ە، ڕەحمەتی خوای لێبێ، وەك لە كتێبی: (المشاركة في الحياة السياسية)دا هاتوە[2]، لەدرێژەی چەند قسەیەكیدا كە وەڵامی پرسیارێكی لەوبارەوە داوەتەوە، گوتوویەتی: «أُدخلوها، أَتتركونها للعلمانيين والفسقة؟!»، واتە: بچنە نێو پەرلەمان، ئایا بۆ عەلمانییەكان و فاسقەكان، بەجێی دەهێڵن؟!.

---

(١) ص٢٣٥.

(٢) ص ٢٣٦.

واتە: قسەی باش لە پەرلەماندا بکەن و، پشتگیریی حەق بکەن و، هەوڵ بدەن یاسای باش دەربکەن.

٥- یەکێکی دیکە لەو زانایانە (الشیخ محمد أبو زهرة)یە، کە هەر لە سەرچاوەی پێشوودا[١] گوتوویەتی: «إن ترشيح بعض الإخوان المسلمين الذين يستمسكون بالعروة الوثقى، ولِلدِّين الإعتبار الأول في نفوسهم، أَمرٌ واجِبٍ جِدٌ واجِبٍ».

وەلامەکەی دەربارەی (إخوان المسلمين)ە لە میسر، دەڵێ: کاندیدکردنی هەندێك لە برایانی مسوڵمان، ئەوانەی دەست بە ڕێسمانی خواوە دەگرن و، پێش هەموو شتێك ئیعتیبار بۆ دین دادەنێن لە دڵ و دەروونی خۆیاندا، پێویستەو بەڵکو زۆریش پێویستە (کە کاندید بکرێن و بچنە نێو ئەو پەرلەمانانەوە).



٦- هەروەها یەکێکی دیکە لەوانە (دکتور یوسف القرضاوي)یە، کە لە ژمارەیەك کتێبەکانیدا باسی ئەم مەسەلەیەی کردوە، بۆ وێنە: کتێبی: (من فقه الدولة في الإسلام)[٢].

٧- یەکی دیکە لەوانە: (سلمان بن فهد العودة)یە کە لە سەرچاوەی پێشووتردا دەڵێ: «إن العضوية في المجالس النيابية وغيرها، فالذي أراه إجمالاً أن هذا من باب تقليل المفاسد أو جلب بعض المصالح، أو حصول الإنسان على بعض حَقِّه، كما دخل رسول الله (صلى الله عليه وسلم) في جوار أبي طالب والمُطْعِم بن عدي»[٣].

---

(١) ص ٢٣٦.

(٢) ص ١٦١، ط دار الشروق.

(٣)- المشاركة في الحياة السياسية،ص ٢٣٧.

واتە: بوونە ئەندام لە ئەنجوومەنی نوێنەران و غەیری ئەوەشدا (واتە: ئەنجوومەنی پارێزگاو هاووێنەکانیدا)، ئەوەی کە دەیبینم بە کورتیی ئەوەیە: کە لە جۆری کەمکردنەوەی زەرەرەکان و بەدەستهێنانی هەندێك لە بەرژەوەندییەکانە، یاخود وەدەستهێنانی ئینسانە، بۆ بەشێك لە حەقەکەی، هەروەك چۆن پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) چووە پەنای ئەبوتاڵیب و موطعیمی کوڕی عەدیی...)، [واتە: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کاتێك چۆتە پەنای(ئەبوتاڵیب )مانای وانیە بە ناشەرعییەکانی (ئەبووتاڵیب) ڕازییە و، کە (موطعیم) پەنای داوە، مانای وانیە بە سەرۆکی خۆی دەزانێ، یاخود بە دەسەڵاتدارێکی شەرعیی دەزانێ، بەڵام بەرژەوەندییەك و حەقێکی خۆی لەو ڕێیەوە مسۆگەر کردوە].

ئەوەش قسەی هەندێك زانایان کە وەك گوتم لەم پەڕی دنیا تاکو ئەوپەڕی، هەموویان ڕایان وایە کە بەشدارییکردن لەو جۆرە پەرلەمانانەدا، مادام مسوڵمانان بەرژەوەندیی تێدا ببیننەوە، نەك هەر پەسندە، بەڵکو هەندێکیان بە پێویستیشی دەزانن.

+ ئەمەوێ ئەوە بپرسم: کە ئایا پێت وانیە هێندێ جیاوازیی هەیە لە نێو پەرلەمانەکانی وڵاتاندا، بۆ نموونە لە کوردستان دا، کە بە هەر هۆیەك بێ، پەرلەمان نەیتوانیوە ئەرکی سەرشانی خۆی جێبەجێ بکا، کەمترین جار موناقەشە لەسەر ئەو شتانە کراوە کە خوای پەروەردگار بە ئاشکرا حوکمەکەیانی دیارییکردوون، بۆنموونە: لە ماوەی چوار ساڵی پەرلەماندا، تاکە یاسایەك لەو شێوەیە کە موناقەشەی لەسەر کرا، مەسەلەی چەندژنیی بوو، ئەو جیاوازییە چۆنە؟

- ڕاستە ئەو جیاوازییە هەیەو، کاریگەریی زۆریشی هەیە لەسەر حوکمی بەشداریی کردنەکە، پێموایە بە حەقیقەت بارودۆخی

کوردستان جیاوازە لە هی شوێنەکانی دیکە، ئەوە زانایان بە نسبەت شوێنەکانی دیکەوە وایانگوتوە، بەڵام بە نسبەت ئێمەوە لەکوردستاندا، کە دەستکراوەترین، پاساو و بەڵگەی زیاترمان هەیەو، هاندەری زیاترمان هەن بۆ بەشدارییکردن، تۆ مەبەستت ئەوەیە کە لەلای ئێمە ناسەلمێنرێ لە کەسانێك کە دژی شەرع بوەستنەوە، وەك لە شوێنانی دیکە هەیە، بۆ نموونە: لە شوێنێکی وەك تونس، هەروەها لە تورکیا، کە ئێستاش لە شوێنە ڕەسمییەکاندا ئافرەت بۆی نیە سەرپۆشی لەسەر بێ، یان بۆیان نیە بە ناوی ئیسلامەوە حیزبیان هەبێ، بەڵام ئێمە لە کوردستان دا بە تەئکید دەستمان کراوەترەو، بارودۆخەکە زۆر جیایە، لەبەر ئەوە ئێمە ڕێ لەبەر دەمماندا ئاچووغترە.

ئنجا هەموو جارێ دەبێ بیر بکەینەوە کە تۆ بەدیلت چییە؟ ئایا ئەوەیە کە تۆ بێی بەهێز خۆت بە واقیعێکدا بدەی، کە بەگشتی میللەتی خۆتەو خەڵکێکی مسوڵمانە؟ بەڵگەت چییە بۆ ئەوە؟ ئایا پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) وایان کردوە، یاخود سەبریان گرتوەو خەریکی هۆشیارکردنەوەو تێگەیاندنی خەڵك بوون؟، بێگومان سەبریان گرتوە لەسەر ئازارو نارەحەتییەکانیان، بە تەئکید ڕێبازی پێغەمبەران صلی الله علیه وسلم هەر ئەوە بووە، وەك فەرموویانە:

﴿... وَلَنَصْبِرَنَّ عَلَىٰ مَآ ءَاذَيْتُمُونَا ... ﴿١٢﴾﴾ إبراهيم.

واتە: سەبر دەگرین هەرچەندە ئازارمان بدەن! من لە ژیانی هەموو پێغەمبەراندا سەڵات و سەلامی خوا لەسەر هەموویان بێ، یەك پێغەمبەرم پێ شكدێ، کە لە قۆناغێکی دیارییکراودا ویستبێتی کۆمەڵگاکەی بەجێ بهێڵێ، ئەویش (یونس)ە، علیه السلام، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿ وَذَا ٱلنُّونِ إِذ ذَّهَبَ مُغَٰضِبًا فَظَنَّ أَن لَّن نَّقۡدِرَ عَلَيۡهِ فَنَادَىٰ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ أَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٨٧﴾ ﴾الأنبياء.

واتە: خاوەنی نەهەنگ کاتێك کە بە تووڕەیی [لە گەلەکەی تووڕە بوو، چونکە ئیمانیان نەدەهێنا] ڕۆیی و پێی وابوو کە سەر زەمینی لێ تەنگ ناکەین [بۆ هەرکوێیەك بچێ پەیامی خوا بگەیەنێ، قەیناکات] ئیدی سەرەنجام [کە نەهەنگ قووتیدا] لە تاریکایی یەکاندا [تاریکی شەوگارو، دەریاو، نێو سکی نەهەنگ] بانگی (خوای) کرد: کە جگە لە تۆ هیچ پەرستراوێك نیە، تۆ پاکی، من چوومە ڕیزی ستەمکارانەوە.

بەڵێ تەنیا یەك پێغەمبەر لە هەڵوێستێکیدا کەم حەوسەڵەیی پێشانداوەو، خەڵکی نەینەوای بەجێ هێشتوە، ئەویش خوای پەروەردگار سزای داوەو، لەسکی نەهەنگدا سجنی کردوە، تاکو لەوێدا دەڵێ:

﴿ ...لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٨٧﴾ ﴾ الأنبياء

واتە: بێجگە لە تۆ هیچ پەرستراوێك نیە، پاکیی بۆ تۆ من ستەمم لە خۆم کرد [کە بەبێ ئیزن و مۆڵەتی تۆ گەلەکەم جێهێشت].

کە دوایی دەگەڕێتەوە بۆ لایان و ئیمان دێنن، کەواتە: بەجێ هێشتنی خەڵك، یان دژوەستانی خەڵك و کۆمەڵگای خۆت، ڕێبازو شێوازی کاری پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) نەبووە، هەڵبەتە ئێمە لێرەدا ناڵێین: بە هیچ شێوەیەك پەنا بردن بۆ هێزو بەرگریی

لەخۆکردن، دروست نیە، بەڵام کۆمەڵگا نابێ لەڕێی توندوتیژییەوە بگۆڕدرێ و، پێغەمبەران لە ڕێی تێگەیاندنەوە خەڵك و کۆمەڵگایان گۆڕیوە، بەڵام کاتێك تۆ زوڵم و ستەمت لێ دەکرێ و ڕێت لێ دەگیرێ، ئەوە حیسابێکی دیکەیە، مەبەستمان ئەوەیە کیانی ئیسلامیی لە ڕێی توندوتیژییەوە دروست نابێ، بەڵکو لەڕێی تێگەیاندن و قەناعەت پێهێنانی خەڵك و بانگەوازەوە دەبێ، پێغەمبەران هەموو وایان کردوە، پێغەمبەری خاتەمیش (محمد) (صلی الله علیه وسلم) وەك جاری دیکەش باسمان کردوە، کۆمەڵگاو دەوڵەت و قەوارەی ئیسلامیی دروست کرد، بێ ئەوەی خوێن لە لووتی هیچ کەسێك بێ، بەڵکو لەسەر بناغەی بەیعەت و بەڵێن پێدرانی لە لایەن خەڵکی (یثرب)ەوە، کە هاتن و بە سەرۆك و حوکمڕانی خۆیان قبووڵیان کردو، ئیسلامیشیان بە بەرنامەی خۆیان قبووڵ کرد، لەسەر ئەو بناغەیە، ئەو کیانە ئیسلامییە دروست بوو، ئێمەش دەبێ دوای پێغەمبەری خۆمان (صلی الله علیه وسلم) بکەوین.



+ بەڵام هێشتا هێندێك خەڵك کە عەلمانیین و هەندێکیشیان کە خۆیان بە ئیسلامیی دەزانن، یان ئیسلامیین و بیرو بۆچوونێکی تایبەتییان هەیە، پێیان وایە بەشدارییکردنەکانی ئێوە، یان بەڵگەکانی ئێوە لە پێناو بەرژەوەندیی خۆتاندایە.

- (بە پێکەنینەوە) ئنجا ئەگەر بێت و بەو چاوە تەماشای هەڵوێست و جموجۆڵی هەر کەسێك بکەی، ئەوە هیچ کەسێك سەلامەت نابێ، ئنجا هەیە بە بەڵگەوە سەلامەت نابێ، بۆ وێنە: ئەو کەسەی کە هەرچی ئیمتیازاتی مەعنەویی و ماددیی ئەم وڵاتەیە، قۆرخی کردوە بۆ خۆی و بنەماڵەو حیزبەکەی، ئەوە بە بەڵگەوە سەلامەت نەبووە،

بەڵام ئێمە بە تۆمەت سەلامەت نابین، چونکە دەبێ جارێ لێمان بگەڕێن، داخۆ دوای ئەوەی دەسەڵاتمان دەبێ، چی دەکەین؟!

پاشان پێویستە ئەوانە بەویژدانەوە سەرنج بدەن! ئایا بەئەندازی ئەوەکە دەستمان ڕۆیشتوە، ئێمە دیفاعمان لەکێ و لەچی کردوە؟ ئنجا ئێمە ئەگەر دیفاع لە بەرژەوەندیی خۆشمان بکەین، وەك خەڵکێك کە زوڵممان لێنەکرێ، ئەوە هیچ ناهەقیی و ناشەرعییەکی تێدانیە! چونکە ئێمەش هەر بەشێکین لە کۆمەڵگاو خەڵکی خۆمان، بەڵام لە ڕاستییدا ئێمە خۆمان بە دڵسۆزی خەڵکی خۆمان و ئەم کۆمەڵگایە دەزانین، بە هەموو پێکهاتەکانییەوە، بە خوا لە لای خۆمەوە، خۆم بە دڵسۆزو بە پەرۆش دەزانم بۆ هەموو ئەوانە کە لەم کۆمەڵگایەدان، بە مسوڵمان و نامسوڵمانەوە، ئەو مرۆڤە هەرکەسێك بێ، بۆی دڵسۆزم و وەك ئینسانێك پەرۆشمە، چونکە ئێمە دەبێ خەمخۆرو سوور بین لەسەر ئەوەی کە خەڵك بەختەوەر بکەین، خەڵك سەرفرازی دوارۆژو بەختەوەری دنیا بێ، ئەوە ئەرکی شەرعیی ئێمەیە بەرانبەر بە خەڵك و کۆمەڵگامان، ئیدی ئومێدەوارین خەڵکیش گومانی خراپمان پێ نەبەن و، لانی کەم دەرفەتمان بدەن و چاوەڕێ بکەن، داخۆ ئەگەر دەسەڵاتمان هەبوو چی دەکەین؟! ئەوکاتە با بەچاك، یان بەخراپ، حوکممان بەسەردا بدەن!

## دەستپێك

خوێنەرە بەڕێزەکان!

ئەم بابەتەی بەردەستتان (بەشداریی کردن لە حکوومەتێك دا کە بەشەریعەتەوە پابەند نیە) بریتیە لە دوو ئاڵقەی وتووێژی نێوان بەندەو کاك عومەر گوڵپی کە لە بەرنامەی (سەرنج)ی کەناڵی ئاسمانیی (پەیام) دا ئەنجام دراون و، پاش هێنرانە سەر کاغەزیان و،[1] چاوپێداگێڕانەوەی خۆم، بۆتە بەشێکی ئەم کتێبە.

شایانی باسیشە کە لە ئاڵقەی یەکەمیاندا، بیروڕاو بەڵگەکانی ئەوانەمان خستۆتەڕوو، کە پێیان وایە بەهیچ جۆرێك دروست نیە مسوڵمانان بەشداریی لە حکوومەت و قەوارەیەکی سیاسییدا بکەن، کە بەڕەسمیی و بەڕاشکاویی، پابەندیی خۆی بەشەریعەتی خواوە ڕانەگەیاندبێ و، ئیسلامی وەك بەرنامەی ژیان تەبەننیی نەکردبێ، پاشان سەرجەم بەڵگەکانیانمان هەڵوەشاندوەو ئیسپاتمان کردوە، کە بەڵگەکانیان بایی سەلماندنی دەعواکەیان ناکەن!

لە ئاڵقەی دووەمیشیان دا، بیروڕاو بەڵگەکانی ئەوانەمان خستۆتەڕوو کەپێیان وایە شتێکی دروست و ڕەوایە، هەرکات مسوڵمانان خێرو بەرژەوەندییان تێدابینی و، چەند مەرجێکیان ڕەچاوکردن، بەشداریی لەو جۆرە حکوومەتانەدا بکەن و، لەوبارەوە بەجوانیی نوختەمان خستۆتە سەرپیت.

---

(١)) لەلایەن دووبرای کەناڵی ئاسمانیی (پەیام)ەوە، خوا پاداشتیان بداتەوە.

هیواداریشم ئەم بابەتە كۆتایی بەزۆر مشت ومڕی لابەلا بێنێ كە لەوبارەوە دەكرێن و، لەجیاتی ئەوە هەموولایەكمان وزەو توانەیەكانمان یەك بخەین، بۆ گۆڕین و پاكسازیی و چاكسازیی تێدا ئەنجامدانی، خەڵك و كۆمەڵگایەكەمان.

شایانی باسە بابەت و باسەكانی ئەم بەشەش بەمجۆرەن:

**باسی یەكەم:** بەڵگەكانی ئەوانەی بەشداریی كردن لە حكوومەتێك دا، كە پابەند نیە بەشەریعەتەوە بە ناڕەوا دەزانن.

**باسی دووەم:** بەرپەچدانەوەی بەڵگەكانی ئەوانەی بەشداریی كردن لە حكوومەتێك دا، كە بە شەریعەتەوە پابەند نیە، بە ناڕەوا دەزانن.

**باسی سێیەم:** بەڵگەكانی ئەوانەی بەشداریی كردن لە حكوومەتێك دا، كە پابەند نیە بەشەریعەتەوە بەچەند مەرجێكەوە بە ڕەوا دەزانن.

بەڕێـــزان!

لەم ئاڵقەیەی بەرنامەکەماندا سەبارەت بە حکوومەت قسەو باس و گفتوگۆ دەکەین، لەو ڕووەوە کە ئایا مسوڵمانان پێویستە چۆن مامەڵە لەگەڵ حکوومەتدا بکەن؟!

## پێناسەی دەوڵەت و حکوومەت

+ مامۆستا بەباشی دەزانم کە بە پێناسەی حکوومەت، یان ئەنجوومەنی وەزیران دەست پێبکەین، ئایا پێناسەی حکوومەت یان ئەنجوومەنی وەزیران چۆنە؟!



- بسم الله الرحمن الرحيم، الحمد لله، وصلى الله تعالى وسلم وبارك على رسول الله محمد، وآله المهتدين بهداه، من الصَّحب والأزواج والقرابة والتابعين لهم بإحسان إلى يومِ اللِّقاء.

دوو وشە هەن، پێویستە واتاکانیان لەیەك جیا بکەینەوە:

١- دەوڵەت و، ٢-حکوومەت:

أ- دەوڵەت: بەو قەوارە سیاسییە دەگوترێ، کە هەرسێ پێکهێنەرەکەی تێدا هاتبنە دی:

**یەکەم:** سەرزەمینێکی دیارییکراو، واتە: هەرێمێك و ناوچەیەك.

**دووەم:** کۆمەڵە خەڵکێك کە لەسەر ئەو سەرزەمینە دەژین، واتە: کۆمەڵگایەك.

سێیەم: دەستەڵاتێکی سیاسیی، بەدەست ئەو خەڵکەوەیە کە لەو سەرزەمینەدا، کاروباری خۆیانی پێ بەڕێوە دەبەن.

ئەم سێ پێکهێنەرە، مەرجن بۆ هاتنەدی ئەو قەوارەیەی کە پێی دەگوترێ: دەوڵەت، ئنجا ئەگەر تەماشای ئەو قەوارە سیاسییە بکەین، کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە سەردەمی خۆیدا بنیاتی نا:

١- دەبینین ئیقلیمێك هەیە کە شاری مەدینەو دەوروبەریەتی و، لەژێر ڕکێف و دەسەڵاتی مسوڵماناندایە.

٢- کۆمەڵە خەڵکێك هەیە، کە بریتین لە مسوڵمانان و جولەکەکان و، ئەو موشریك و بتپەرستانەی کە لەوێ بوون و، دوایی زۆربەیان بوونە مونافیق، واتە: پێکهێنەرەکانی ئەو کۆمەڵگایە بوونە سێ پێکهاتە: مسوڵمان، جوولەکە، مونافیق.

٣- دەستەڵاتێکی سیاسییش هەبوو کە بە دەستی پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) بوو، لەسەر بنچینەی صەحیفە (دەستوور)ێك کە پێشتر باسمان لێکرد.

(حکوومەت)یش بریتیە لە یەکێك لەو سێ پێکهێنەرانەی کە دەوڵەت پێك دێنن، کە دەستەڵاتە سیاسییەکەیە، کە هەم وشەی حکوومەتی بۆ بەکاردێ، هەم بە زاراوەی ئێستا، وشەی: ئەنجوومەنی وەزیرانی بۆ بەکاردێ و، هەم وشەی: دەستەڵاتی جێبەجێکردن (السلطة التنفیذیة)ی بۆ بەکاردێ، لە مێژووی ئیسلامییشدا (الوزارة)ی پێ گوتراوە، ئێستاش زۆرێك لە زانایان و سیاسەتمەداران وشەی: پێکهێنانی وەزارەت (تشکیل الوزارة) کە مەبەستیان پێی حکوومەتە، بەکاردێنن، ئنجا هەرکات

وشەی حكوومەت بەكاربێ، ئەو كاتە حكوومەتەكە (واتە: دەسەڵاتە سیاسییەكە) چ سیستمی سەرۆكایەتیی بێ، چ سیستمی پەرلەمانیی بێ، واتە ئەنجوومەنی وەزیران و، سەرۆك وەزیران و، پاشان سەرۆك كۆماریش هەبێ، یاخود یەكسەر سەرۆك كۆمار هەبێ و، ئەنجوومەنی وەزیران هەبێ، كاتێك دەگوترێ: حكوومەت هەردووكیان دەگرێتەوە، بەڵام كە دەگوترێ: ئەنجوومەنی وەزیران، سیستمی سەرۆكایەتیی مەبەست نیە، بەڵام ئەگەر بگوترێ: دەسەڵاتی جێبەجێكردن، دیسان چەمكەكەی گشتگیرەو بۆ هەموو حاڵەتەكە بەكاردێ.

شایانی باسیشە: كە ئەم مەسەلەیە، ئیسلامیی و عەلمانیی تێدانیەو، جیاوازی فیكرو ئیدۆلۆژیی كاریگەریی لەسەری نیە، بەڵكو ئەوە واقیعێكە كە بە درێژایی مێژووی بەشەر، قەوارە سیاسییەكان هەربوون:

١- سەرزەمینێكی دیارییكراو بووە.

٢- خەڵكێك هەبووە لەو سەرزەمینە ژیاون و ئازاد بوون.

٣- دەستەڵاتی خۆیانیان بەدەست بووەو، ئیدارەی خۆیانیان كردوە، كە وەك گوتمان: كاتی خۆی هەندێك جار بۆ هەموو قەوارە سیاسییەكە، لە جیاتی دەوڵەت، وشەی (حكوومەت) بەكار هێنراوە، وەك ئێستا لە هەندێك شوێندا، لە جیاتی (حكوومەت)، وشەی (دەوڵەت) بەكاردێ، بۆ وێنە: فارسەكان، كە مەبەستیان پێی: دەسەڵاتی جێبەجێكردنە.

+ ئایا لە دەقەكانی قورئان و فەرمooودە ڕاستەكانی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) ئاماژەیەكی ڕوون هەیە، لە بارەی حكوومەت و دەوڵەت و پێكهێنان و پێناسەیانەوە؟

- ئەم بابەتە پێویستیی بە ئاڵقەیەك، بەڵكو چەند ئاڵقەیەكی[1] تایبەتە، بەڵام ئەوەی كە لێرەدا بگونجێ بەكورتیی ئاماژەی پێبدەین، ئەوەیە كە خوای پەروەردگار لە چەند ئایەتێك دا، ئاماژەی بە بەرنامەو سیستم (نظام) كردوە، بۆ وێنە:

١) لە سوورەتی (الجاثیة)دا دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ جَعَلْنَٰكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ فَٱتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨﴾ ﴾.

لێرەدا خوا -سبحانه وتعالى- پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەدوێنێ و، لەپێش ئەم ئایەتەدا، باسی ئەزموونی ئەهلی كیتاب دەكا، (واتە: جوولەكەو نەسرانییەكان) لە بواری دینداریی و دنیادارییدا، دوایی بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: پاشان تۆمان لەسەر بەرنامەیەك دانا لە ئایینی خۆمان، دەجا شوێنی بكەوەو بە دوای ئارەزووی ئەوانە مەكەوە كە نازانن، كەواتە: شەریعەت و بەرنامەیەك بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هاتوە، كە دەبێ شوێنی بكەوێ و جێ بەجێی بكات.

٢- لە سوورەتی (المائدة)دا، دیسان دوای ئەوەی خوا -سبحانه وتعالى- لە درێژەی چەند ئایەتێكدا باسی ناردنە خوارەوەی تەورات دەكا بۆ جوولەكەكان و، باسی هاتنە خوارەوەی ئینجیل دەكا بۆ نەسرانییەكان، دەفەرموێ:

---

(١) كە سوپاس بۆ خوا هەتا ئێستا: (٢٠١٠/٥/٥) دە (١٠) ئاڵقەی بەرنامەی (سەرنج)مان لەبارەوە پێشكەش كردوەو (إن شاء الله) بەردەوامیش دەبین.
ئێستاش دەڵێین: دواتر ئاڵقەكانی بەرنامەی سەرنج گەیشتنە زیاتر لە شەست (٦٠) ئاڵقەو، پاشان لەشێوەی مەوسووعەیەكی چوار بەرگیی دا، چاپ كرا، بەناوی: [ئیسلام و دەوڵەتداریی].

﴿ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ ۖ فَٱحْكُم بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ ۖ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ عَمَّا جَآءَكَ مِنَ ٱلْحَقِّ ۚ لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا ۚ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً ... ﴿٤٨﴾ ﴾ المائدة.

واتە: هەروەهاکتێبێکمان بۆ ناردیە خوار، کە بە حەق ناردوومانەو، ئەوەی پێش خۆی بە ڕاست دەزانێ [کە لە خواوە هاتوون، وەك ئەسڵەکەیان] و بە سەریشیانەوە چاودێرە، بۆیە تۆ حوکمیان لەنێواندا بکە، بەوەی خوا بۆی ناردوویە خوار و، بەدوای ئارەزووەکانیان مەکەوە، بۆ هەرکامێکتان ڕێبازو بەرنامەیەکمان داناوە، ئەگەر خوا ویستبای هەمووتانی دەکردە یەك کۆمەڵ...

١٤٧

واتە: لە یەك کاتدا، هەموو بەشەری دەخوڵقاندو، یەك کتێب و بەرنامەی بۆ هەموویان دەنارد، بەڵام بۆ هەر کامێکتان بەرنامەو ڕێبازێکمان ناردوە، بەرنامەو ڕێبازێکی گونجاو لەگەڵ ئەو هەلومەرجەدا کە تێیدایەو، ئەو قۆناغە مێژووییە کە پێیدا تێدەپەڕێ.

هەروەها ئەگەر تەماشای سیرەو سوننەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بکەین، ئەوە زۆر ئاشکراو ڕوونە، کە وەك چۆن ئیمامەتیی بۆ مسوڵمانان کردوە لە نوێژداو، وتاری بۆ داون لە مزگەوتدا، بە هەمان شێوەش دادوەریی لەنێوانداکردوون، لەکاتێکدا کە کێشەو مشتومڕێکیان هاتبێتەپێش و، لە کاتی جەنگدا فەرماندەیەتیی جەنگی کردوە، هەروەها لەو شوێنانەدا کە خۆی لێیان نەبووە، کەسانێکی داناون کە حوکمڕانیی بکەن، کە پێیان گوتراوە (عُمّال) و، کەسانێکی ناردوە کە زەکات کۆبکەنەوە، هەروەها نامەی ناردوە

بۆ سەرۆکی دەوڵەتانی ئەو سەردەمە، هەروەها قازییەکانی داناون، لە شوێنەکان، بۆئەوەی دادوەریی لە نێوان خەڵکدا بکەن...، هەروەها سەرجەم ئەو ڕێکخستنە ئیدارییانەی کە دەوڵەتێك و قەوارەیەکی سیاسیی، پێویستی پێیانە، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بە لە بەرچاوگرتنی هەلومەرجی ئەوسای کە بەشەر بەگشتی تێیدا بووە، هەروەها سادەیی قەوارە سیاسییەکان، هەموو ئەوانەی لەو قەوارە سیاسییەدا، کە لە مەدینە بنیاتی ناوە، ڕەچاوکردوون.

دەمەوێ ئاماژەش بەوە بکەم کە هەتا ئێستا لە چەند بەرهەمێکمدا کەم و زۆر، ئاماژەم بەو بابەتە کردوە، وەك:

١- (کتێبی تەوژمی ئیسلامیی و عەلمانیی و خاڵە هاوبەش و جیاوازەکانیان).



٢- هەروەها (چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم).

٣- (سیاسەتی ئیسلامیی و چەند ڕوونکردنەوەیەك) کە یەکێکە لە نامیلکەکانی زنجیرەی: زنجیرەی بابەتە هەنووکەییەکان.

٤- کتێبی: (ئیسلام و مسوڵمانەتیی و کاری ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا).

لەسەرجەم ئەم بەرهەمانەدا، بەڕوونیی باسم کردوە کە ئیسلام بە بێ قەوارەی سیاسیی بەڕێوە ناچێ، بەڵێ لایەنە شەخسییەکەی بەڕێوە دەچێ، بەڵام لایەنە کۆمەڵایەتیی و سیاسیی و ئابوورییەکانی بەڕێوە ناچن[1].

---

(١) بەڵام توێژینەوەی تەرخان و فراوان لەبارەی دەوڵەتداریی و حوکمڕانیی لە

+ سەبارەت بە بەشدارییکردن لە ئەنجوومەنی وەزیراندا، حکوومەتێك کە لە بنەماکانیدا لە ئیسلامەوە سەرچاوەی نەگرتبێ، ئاشکرایە کە جێگای،مشت ومڕو ڕاجیاییە، لە نێوان زانایان و لە نێو مسوڵمانانیش دا بەگشتی، ئنجا نازانم جەنابت ئەو ڕایانە، لە چەند جۆری جیادا کۆدەکەیتەوە، بەڵام پێم خۆشە لە ئێستای بەرنامەکەمانداو، لە داهاتووشدا، گفتوگۆی ئەو ڕا جیاییە بکەین!

- بەگشتی سێ ڕا هەن لەوبارەوە، بەڵام پێش هەموو شتێ، دەبێ ئەوە بزانین: کە ئێمە لێرەدا قسە لەسەر قەوارەیەکی سیاسیی دەکەین، کە شەریعەتی ئیسلامیی بە ڕەسمیی تەبەننیی نەکردوە، ئنجا یان بەگشتی ئیش بە هیچکام لە بنەماو یاساکانی شەریعەت ناکا، یان لادان و هەڵەو پەڵەی هەیە لە پابەندیی شەریعەتدا، بۆ بەشدارییکردن لەو جۆرە قەوارە سیاسییانەدا، زانایانی هاوچەرخ مشتومڕیان هەیە، بەڵام لە حکوومەتێك و لە قەوارەیەکی سیاسییدا، کە بڕیاریدابێ شەریعەت پیادە بکا، ئەوە دیارە هیچ کەس نەك هەر مشتومڕی لەبارەیەوە نیە، بەڵکو یەکدەنگن لەسەر ئەوە کە لەسەر مسوڵمانان فەرزە، ئەو قەوارە سیاسییەیان هەبێ، کە شەریعەتی خوای پێ جێ بەجێ بکەن.

بەڵام لە حاڵێکدا کە مسوڵمانان ناتوانن قەوارەیەکی سیاسیی وایان هەبێ، شەریعەتی خوا پیادە بکات و، حکوومەت و دەوڵەتی پابەند

---

ئیسلامدا، ئەوەیە کە ئێستاکە لەئاڵقەکانی بەرنامەی (سەرنج)ی کەناڵی ئاسمانیی (پەیام)دا، سەرگەرمی پێشکەش کردنینی.

ئێستاش دەڵێم: دواتر بوو بە مەسووعەیەکی چوار بەرگیی بەناوی: [ئیسلام و دەوڵەتداریی].

بەشەریعەتەوەیان هەبێ، ئایا دروستە لەگەڵ ئەو حکوومەتەدا کە شەریعەت پیادە ناکات، بەشدار بن، یان نا؟! لەو بارەوە سێ ڕا هەن.

١- ڕایەکیان دەڵێ: بەڵێ بە موتڵەقیی دروستە، واتە ئەسڵ ئەوەیە کە دروستە بەشدار بن، هەڵبەتە بەو واتایە نا، کە دان دێنن بەوەدا کە حوکم بە شەریعەت نەکرێ! بەڵکو دەڵێن: بۆیە بەشداریی بکرێ، بۆ ئەوەی وردە وردە حوکم بە شەریعەت بکرێ و، هەڵەو کەم و کوڕییەکان بە پێی توانا، لا ببرێن و ڕاست بکرێنەوە.

٢- ڕایەکی دیکە دەڵێ: بە ڕەهایی ڕەوا نیە، واتە ئەسڵ ئەوەیە کە بەشداریی کردن، قەدەغەیەو هەڵاواردنیشی تێدا نیە.

١- ڕایەکی دیکەش دەڵێ: بەڵی لە ئەسڵدا قەدەغەیە مسوڵمانان لە قەوارەیەکی سیاسییدا بەشدار بن و، ببنە ئەندام، کە حوکم بە شەریعەت ناکات، بەڵام بە چەند مەرجێکەوەو، مادام مسوڵمانان بەرژەوەندیی تێدا بەدی بکەن، واتە: چەند قازانجێکی پێ وەدەست بهێنن و، چەند زیانێکی پێ لە خۆیان دوور بخەنەوە، ئەوە دروستە.

بەکورتیی دەتوانین بڵێین: دوو ڕان، چونکە ڕای سێیەم، ڕای دووەمیش دەخاتەوە نێو خۆی، کە دەڵێ: بە ڕەهایی و بە بێ مەرج دروستە، بەڵێ ڕای سێیەم، کە دەڵێ: بە مەرجەوە دروستە، ڕای دووەمیش دەخاتەوە نێو خۆی، بەو واتایە کە ئەگەر بە ڕەهایی دروست بێ، بە مەرجەوە، باشتر دروستە!

+ مامۆستا ئایا ئەو بۆچوونە جیاوازانە، زانایانی ئێستاو پێشووش قسەیان لەبارەیانەوە کردوە؟

- بەڵێ زانایانی پێشووش قسەیانکردوە، بەڵام نەك لەبارەی واقیعێکی وەك ئێستای ئێمەوە، بەڵکو بەگشتی قسەیان لێکردوە، کە ئەگەر دەسەڵاتێکی کافر هەبوو، حوکمی لە مسوڵمانان زەوت کردو، هەیمەنەی بە سەر وڵاتی مسوڵماناندا کرد، ئایا مسوڵمانان دروستە بەشداریی ئەو حکوومەتە کافرو ستەمکارە بکەن، یان نا؟! باسی ئەوەیان کردوە، ئنجا من هەر لە بەراییەوە دەڵێم: ئەو ڕایەم پێ ڕاستە کە دەڵێ: بە مەرجەوە دروستە بەشداریی بکرێ، واتە: ئەسڵ قەدەغەبوونە، بەڵام وەك هەڵاواردنێك لەو بناغەو ئەسڵە، مادام مسوڵمانان بەرژەوەندیی تێدا ببینن، ئەگەر چەند مەرجێك ڕەچاو بکەن، دروستە بەشداربن.

+ ئەو بەڵگانە چین کە ئەو سێ ڕا جیاوازە هەیانن، لەمەڕ بەشدارییکردن لە حکوومەتێکدا، کە بنەماکانی ئایینی ئیسلام ناکاتە بناغەی کارکردن؟

## بەڵگەکانی ئەوانەی بەشداریی کردن لە حکوومەتێك دا، کە پابەند نیە بە شەریعەتەوە، بە ناڕەوا دەزانن

- سەرەتا لەبارەی بەڵگەکانی شوێنکەوتووانی ئەو ڕایەوە دەدوێین، کە دەڵێ: بە موتڵەقیی دروست نیە، مسوڵمانان بەشداربن لە قەوارەیەکی سیاسیی و لە حکوومەتێکدا، کە شەریعەتی نەکردوە بە سەرچاوەی هەموو بڕیارو کارەکانی خۆی، دیارە ئەوانە دەڵێن: ئەسڵ ئەوەیە کە قەدەغەو ناڕەوایە، مسوڵمانان بەشداریی لە حکوومەتێکی وادا بکەن و، ئەو ئەسڵەش هیچ هەڵاواردنێکی نایەتەسەر، ئنجا ئەوانەی ئەم ڕایەیان هەیە، بەڵگەکانیان دوو جۆرن:



## جۆری یەکەمیان: چەند ئایەتێکی قوڕئان

١/ یەکێ لەو ئایەتانە ئەوەیە کە خوا -سبحانە وتعالی- لە سووڕەتی (المائدة)دا لە ئایەتەکانی ژمارە: (٤٤و ٤٥ و ٤٦ و ٤٧)دا، زۆر بە ڕوون و ڕاشکاویی ڕایدەگەیەنێ: کە هەرکەسێ حوکم نەکا بەوەی کە خوای کاربەجێ ناردوویەتە خوار، ئەوە لە کافرانە و، لە ستەمکارانە و، لە لەڕێ دەرچووانە، بەڵێ لە سیاق و لە درێژەی ئەو ئایەتانەدا کە خوا -عز وجل- تەوڕاتی ناردۆتە خوار بۆ جوولەکەکان، پاشان ئینجیلی ناردۆتە خوار بۆ نەسڕانییەکان، لەو سیاقەدا ئەوە دەفەرموێ، سەرەتا لەکۆتایی ئایەتی ژمارە (٤٤)دا دەفەرموێ:

﴿... وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴿٤٤﴾﴾المائدة.

واتە: هەرکەسێ حوکم نەکا بەوەی کە خوا ناردوویەتە خوار، ئا ئەوانەن کافران.

پاشان لە کۆتایی ئایەتی دوای ئەودا، واتە ئایەتی ژمارە (٤٥) دا دەفەرموێ: ﴿... وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّـٰلِمُونَ ﴿٤٥﴾﴾ المائدة.

واتە: هەرکەسێ حوکم نەکا بەوەی کە خوا ناردوویەتە خوار، ئا ئەوانەن ستەمکاران.

دوایی لە کۆتایی ئایەتی ژمارە (٤٧)دا، دوای ئەوەی باسی ناردنە خوارەوەی ئینجیل دەکا بۆ نەسرانییەکان، بۆ سەر (عیسا) «علیه السلام»، دەفەرموێ:

﴿... وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَـٰسِقُونَ ﴿٤٧﴾﴾ المائدة.

واتە: هەرکەسێ حوکم نەکا بەوەی کە خوا ناردوویەتە خوار، ئا ئەوانەن لە ڕێ دەرچووان.

چۆنیەتی بە بەڵگە هێنانەوەی ئەو جۆرە کەسانەش، کە خاوەنی ڕای ناوبراون، بۆ ئەم ئایەتانە، بەمجۆرەیە:

کە حوکم نەکردن بەوەی کە خوا ناردوویەتە خوارەوە، دەبێتە هۆی بەکافردانان و، بە ستەمکاردانان و، بە لەڕێ دەرچوو دانانی، ئەوکەسانەی کە هەڵوێستیان وایە، ئنجا دیارە هەرکەسێکیش بچێتە ئەو شوێنەوە، کە حوکمی تێدا ناکرێ، بەوەی کە خوا ناردوویەتە خوار، مانای وایە: کوفرو زوڵم و فیسقی دێتە سەر!

٢/ ئایەتێکی دیکە، ئایەتی ژمارە (٤٠)ی سوورەتی (یوسف)ە، کە خوا -سبحانه وتعالى- لەسەر زمانی (یوسف) «علیه السلام»، دەفەرموێ:

﴿إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ ۚ أَمَرَ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّآ إِيَّاهُ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٤٠﴾﴾ يوسف.

[لێرەدا مەبەست لە (حوکم) بەرنامەدانانە، نەك حوکمڕانییکردن، چونکە هەر مرۆڤەکان حوکمڕان دەبن، واتە: بەرنامەدانان و دیارییکردنی حەڕام و حەڵاڵ] واتە: حوکم تەنیا هی خوایە، فەرمانی کردوە کە جگە لەو کەسی دیکە نەپەرستن، [واتە: تەنیا حوکمی ئەو و بەرنامەی ئەو پیادە بکەن] ئا ئەوە دینداریی ڕاستە، [بەڵێ دینداریی ڕاست ئەوەیە کە تۆ تەنیا دینی خوا پیادە بکەی، ئەوکاتە مانای وایە تۆ تەنیا خوات پەرستوە] بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن.



بۆ چۆنیەتی بە بەڵگە هێنانەوەی ئەم ئایەتەش دەڵێن: بەپێی ئەم ئایەتە بەپێزە: حوکم تەنیا هی خوای پەروەردگارە، هیچ کەسی دیکە بۆی نیە، حەڕام و حەڵاڵ دیاریی بکات و، کەسێك حەڕام و حەڵاڵ دیاریی بکا، یاخود بەشێوەیەك حوکم بکات: دەستکاریی حەڕام و حەڵاڵی خوا بکا، ئەوە مانای وایە کارێکی کردوە، پێچەوانەیە لەگەڵ خوا بەیەکگرتن (توحید)دا، هەرکەسێکیش بچێتە ژێر ڕکێفی بابایەکی وا وە، ئەوە بێگومان نەك هەر گوناهبارە، بگرە تووشی لە دین دەرچوونیش دەبێ، مادام بەوە ڕازی بێ کە دەیکا.

٣/ ئایەتێکی دیکە ئایەتی (٦٥) سوورەتی (النساء)ە، کە خوای بێ وێنە دەفەرموێ:

﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا ﴾،

خوای زانا لە درێژەی چەند ئایەتێکدا که دەربارەی هەندێك لە دڵ نەخۆشەکان هاتوونە خوار[1]، کە بۆ یەکلاییکردنەوەی کێشەکانیان دەیانویست بچن بۆلای (أبو بَرزة الأسلمي)ی کاهین، دەفەرموێ: نەخێر سوێند بە پەروەردگارتان، ئیمان ناهێنن، تاکو تۆ نەکەنە دادوەر لەوەدا کەتێیدا کەتوونەتە مشتومڕەوە، دوایی هەست بە هیچ سەغڵەتییەك نەکەن، دەربارەی ئەو بڕیارەی کە بۆت داون و، بەتەواویی گەردن کەچبن!

چۆنیەتی بەبەڵگە هێنانەوەی ئەم ئایەتەش ئەوەیە کە دەڵێن: مادام خوا -تبارك وتعالى- سوێندی بە پەروەردگارێتیی خۆی خواردوە، کە هەرکەسێك پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) نەکاتە دادوەرو، بە بڕیارەکانی ڕازیی و، بۆیان ملکەچ نەبێ، ئیماندار نیە، کەواتە: هەرکەسێك حوکم و دادوەریی بەغەیری شەریعەتی خوا بکات، یان پەنا بۆ غەیری بەرنامەو شەریعەتی خوا ببات، بڕوادار نیە!

155 چەند ئایەتێکی دیکەش بە بەڵگە دێننەوە، بەڵام ئەم سێیە، نموونەی ئەو ئایەتانەن کە ئەوان دەیانهێننەوە، هەڵبەتە ئێمە دوایی دێینە سەر هەڵسەنگاندنی ئەوە کە ئایا ئەم ئایەتانە، ئەوەیان لێوەردەگیرێ کە بە هیچ شێوەیەك مسوڵمان بۆی نەبێ، بەشداریی لەو جۆرە حکوومەتانەدا بکات، یان نا؟!

---

(١) الإستيعاب في بيان الأسباب، ج١ ص٤١٨، أخرجه الطبراني في المعجم الكبير: ١٢٤٥، وابن أبي حاتم في التفسير: ٥٥٤٧، وقال المؤلفان: قلنا: إسناده صحيح. هەروەها بڕوانە: ج١ ص٤٢٦، کە لەو بارەوە ڕیوایەتێکی دیکەش دێنێ لە: سعيد بن منصور في سننه: ٦٦٠، والحميدي: ٣٠٠.

## جۆری دووەمی بەڵگەکان
## چەند بەڵگەیەکی عەقڵیی

١/ دەڵێن: بەشدارییکردنی خەڵکێکی ئیسلامیی یاخود خەڵکێکی مسوڵمان، لە حکومەتێکدا کە بە پێی شەریعەت بەڕێوە ناچێ، بریتیە لە شەرعییەت پێدانی ئەو حکومەتەو، سەرەنجام خەڵك چەواشە دەبێ و دەڵێن: مادام ئەو ئیسلامییانە، یاخود ئەو مسوڵمانانە، لەو حکومەتەدان، دیارە حکومەتێکە پێچەوانەی ئیسلام و شەریعەت نیە!!

٢/ دەڵێن: ئەو بەشدارییکردنە دەبێتە هۆی متمانە نەمانی خەڵك بە کەسانی ئیسلامیی و مسوڵمان و، بەو لایەنە ئیسلامییە کە بەشداریی کردوە.

٣/ بەڵگەیەکی دیکەیان ئەوەیە دەڵێن: ئەو حکوومەتە فشار دەخاتە سەر ئەو خەڵکە ئیسلامیی و کەسە مسوڵمانانەو، وایان لێدەکات کە لە پرەنسیپ و نەگۆڕەکانی خۆیان دابەزن و، تەنازول بکەن لە دین و عەقیدەی خۆیان.

٤/ بەڵگەیەکی دیکەیان ئەوەیە دەڵێن: بەهۆی بەشدارییکردنەوە لەو حکوومەتەدا، کەسانێك کە بەشدار دەبن، دەبنە شەریك و برابەش لە هەموو ئەو کەم و کووڕیی و ناشەرعیی و ستەم و خراپانەدا، کە ئەو حکوومەتە ئەنجامیان دەدا، ئاشکراشە کە دروست نیە تۆ بەپێی خۆت بچی لە شەڕدا شەریك بی!

بەڵێ ئەمانە کۆی بەڵگەکانی ئەوانەن، کە پێیان وایە: بەهیچ ڕەنگێك دروست نیە بەشداریی لەوجۆرە حکوومەتەدا بکرێ، بەڵام بێگومان هیچ کام لەوشتانە، بەبەڵگەی ئیسپاتی ئەو دەعوایە ناشێن، با بزانین چۆن؟!

## باسی دووەم

# بەرپەچدانەوەی بەڵگەکانی ئەوانەی بەشداریی کردن لە حکوومەتێک دا، کە بە شەریعەتەوە پابەند نیە، بە ناڕەوا دەزانن

## جۆری یەكەم: ئایەتەكان

بە نسبەت ئایەتەكانەوە، واتە هەموو ئایەتەكان كە هێنایاننەوە، ئێمە دەڵێین: بە تەئكید ئەو ئایەتانە واتاكانیان، هەموویان ڕاستن:

یەكەم: [وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَـٰفِرُونَ ...هُمُ ٱلظَّـٰلِمُونَ ...هُمُ ٱلْفَـٰسِقُونَ] هەركەسێ حوكم بە شەریعەتی خوا نەكات و، ڕەفزی حوكم و شەریعەتی خوا بكات، بە كافر لە قەڵەم دەدرێ و، بە ستەمكار لەقەڵەم دەدرێ و، بە فاسق و لاڕێ لە قەڵەم دەدرێ، ئنجا ئەوەش كە ئایا لە چ حاڵەتێك و، لە چ كاتێكدا، بە كافر لە قەڵەم دەدرێ و، لە چ كاتێكدا بە ستەمكارو، لە چ كاتێكدا بە فاسق دادەنرێ؟ تەفسیلُ هەیە لە نێو زانایاندا[1]، بەڵێ ئێمە بەگشتی دەڵێین: ئەوە ڕاستە، بەڵام ئەوە بۆ كەسێكە كە ڕازی بێ بەوە، واتە: ڕازی بێ كە بە شەریعەت حوكم نەكرێ، بەڵام ئیسلامییەك كە دەچێ بەشدار دەبێ لەو حكوومەتەدا، ئایا ڕازییە كە بەشەریعەت حوكم نەكرێ؟ نەخێر، بەڵكو ناڕازییەو، دەچێ بۆ ئەوەی كە ڕێگا بگرێ لە حوكم نەكردن بە شەریعەتی خوا، دەچێ كە دەستی ئەو خەڵكە بگرێ، كە حوكم بە شەریعەتی خوا ناكەن، واتە: بۆ ئەوە ناچێ بەشدار بێ، ئەگەرنا بێگومان هەركەسێ بەشدار بێ

---

(١) لە بەرگی چواری مەوسووعەی: (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی)، لە باسی ئیمان بە كتێبەكانی خوادا، ئەو بابەتەمان جوان توێژیوەتەوە.
هەروەها لە بەرگی دووەمی مەوسووعەی: [ئیسلام و دەوڵەتداریی]و، لە بەرگی چوارەمی: [تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز]یش دا، بە وردیی قسەمان لەبارەوە كردوە.

لە حكوومەتێكدا كە بە پێی شەریعەت بەڕێوە ناچێ و، ئیدارەی وڵات بەشێوەیەك كە پێچەوانەی شەریعەت بێ، دەكات و، پێشی ڕازیی بێ و، هاوكاربێ و دەست بارگربێ، بە تەئكید حوكمی ئەوانی هەیە، وەك خوای شارەزا لە ئایەتی ژمارە (٥١) سوورەتی (المائدة)دا، دەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلْيَهُودَ وَٱلنَّصَٰرَىٰٓ أَوْلِيَآءَۘ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُۥ مِنْهُمْۗ ... ﴿٥١﴾ المائدة ﴾.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! جوولەكەو نەسرانییەكان مەگرن بە دۆست، هەركەسێ لە ئێوە بەدۆست و پشتیوانیان بگرێ، ئەوە لەوانە، كەواتە: هەركەسێ بچێتە نێو قەوارەیەكەوەو، قەناعەتی پێبكاو پشتگیریی بكات، لەسەر ئەوكارانەی دەیانكات، كە پێچەوانەی شەریعەتن، بە تەئكید ئەوە حوكمی ئەوانی هەیە، بەڵام لێرەدا ئێمە قسە لە حاڵەتێك دەكەین كە كەسانێك دەچنە نێو حكوومەتەوە، نەك بۆ ئەوەی شەریعەت پیادە نەكرێ، بەڵكو بۆ ئەوەی شەریعەت پیادە بكرێ، كەواتە: دەڵێین: بەڵێ لە ئەسڵدا قەدەغەیە، بەڵام مادام ئەوكەسە، یان ئەو چەند كەسە، لە خۆیان ڕادەبینن كە دەچن لەوێ ناشەرعییان كەم بكەنەوە، كەم و زۆر شەریعەت پیادە بكرێ، ئەوە دروستە.

پاشان دەڵێین: ئەو بەشدارییكردنە لە حاڵەتی ناچارییدایەو، ئەگەر مسوڵمانان ناچار نەبن، ئەوە دروست نیەو هەرنابێ قسەی لێ بكرێ، واتە: ئەگەر بوارو دەرفەتیان هەبێ، بۆ خۆیان شەریعەتی خوا پیادە بكەن، ئەوكاتە ئەو مەسەلەیە هەرنابێ قسەی لێ بكرێ، بەڵام ئەوە بۆ كاتی ناچارییە، كە وەك دواییش باسی دەكەین:

لەکاتی ناچارییدا بەگشتی و بەتایبەت لە بواری هەڵسوکەوتەکاندا، حوکمە شەرعییەکان دەگۆڕێن و، چەندان بنچینەی شەرعیی هەن لەو بارەوە، کە دوایی باسیان دەکەین.

هەڵبەتە ئیمان و عەقیدە گۆڕانی بەسەردا نایەت و، مرۆڤ ئەگەر ناچاریش بێ، نابێ ئیمان و عەقیدەی خۆی بگۆڕێ، بەڵام بواری هەڵسوکەوتەکان جیایەو، لەکاتێکدا کە مرۆڤ، ئیمانی چەسپاوە، کە هەر ئایینی خوا حەق و ڕاستەو، هەرشتێ لەگەڵ شەریعەتدا تێك بگیرێ، ناڕاست و ناحەقە، بەڵام ئایا هەڵسوکەوتی لەگەڵ ئەو قەوارەیەدا چۆن بێ و، چۆن مامەڵە بکات، ئایا بەشداریی بکات، بۆ ئەوەی کە بەلای شەریعەتیدا بهێنێ و، کەم و کوڕیی و ناشەرعییانی تێدا کەم بکاتەوەو، زوڵمی تێدا کەم بکات و، عەدلی تێدا زیاد بکات، خراپەی تێدا کەم بکات و، چاکەی تێدا زیاد بکات، ئایا ئەوە دروستە، یان دروست نیە؟! ئەوە مەسەلەیەکی دیکەیە، بەڵام زۆرکەس لەوانەی کە گوتوویانە: بە موتڵەقیی دروست نیە، لایەنی ئیمانیی و عەقیدەیی و فیکرییان، لەگەڵ لایەنی هەڵسوکەوت و مامەڵە کردن، لێ تێکەڵ بووەو، پێیان وایە: کە هەرکات مرۆڤ چووە نێو واقیعێکەوە، مانای وایە قەناعەت و عەقیدەشی بەو واقیعە هەیە!! بەڵام بێگومان ئەوە وانیە، چونکە ئەگەر وابێ، دەبێ بڵێین: پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) کاتێ لە پەنای ئەبوو تاڵیبی مامیدابووە، دیارە لە بت پەرستییەکەی مامیشی ڕازیی بووە!! هەروەها کاتێ کە چۆتە پەنای موتعیمی کوڕی عەدیی، کاتێ کە لە تائیف دەگەڕێتەوە، وەك لە (تأريخ الطبري)دا هاتوە[1]، قوڕەیشییەکانی نێو مەکە دەڵێن: نابێ

163

---

(١) تأريخ الطبري، ج١، ص٥٥٥.

بێیەوە نێوشارو لێت قەدەغەیە، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) جواب دەنێرێ بۆ دووان لە سەرانی قورەیش و، دەڵێ: پەنام بدەن بێمەوە نێو شار، ئەوکاتە یاسایەك هەبووە، لەنێو عەرەبەکاندا بەناوی (الجوار) واتە: پەنادان، ئنجا پێغەمبەر لە ئەشکەوتی (حیرا) دەبێ و، نەفەر دەنێرێ بۆلای دووان لە زلەزلانی قورەیش، بەڵام هیچ کامیان بەئیجابیی وەڵامی نادەنەوە، هەریەکە بەبیانوویەك، دوایی وەڵام دەنێرێ بۆ (موتعیمی کوڕی عەدیی) کە موشریکەو یەکێکە لە سەرانی کوفر، دەڵێ: پەنام بدە، دێمەوە نێو شار، ئەویش دەڵێ: ئەوە پەنام دای، دوایی خۆی و کوڕەکانی چەك هەڵدەگرن و، خۆیان دەپێچنەوەو دەچنە دەوری کەعبەو دەڵێن: وەرە، ئنجا (مطعم بن عدي) ئیعلان دەکا دەڵێ: «لقد أَجَرْتُ محمـداً» ئەوە من موحەممەدم پەناداوە، ئنجا کاتێك ئەبوو جەهل لێی پرسی: (أَمُجيرٌ أنتَ أم تابِعٌ؟!)، واتە: ئایا تۆ پەنادەری، یاخود شوێنکەوتووی؟! (واتە: ئایا تەنیا موحەممەدت پەناداوە، یان بڕوات پێیهێناوەو شوێنی کەوتووی؟!) ئەویش دەڵێ: (بل مُجيـرٌ) من بەس پەنام داوە، ئەبوو جەهلیش دەڵێ: (قد أجَرْنا مَن أجَرْتَ)، واتە: ئێمەش پەنای ئەوکەسە دەدەین، کە تۆ پەنای دەدەی.

ئنجا ئایا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وەختێ دەچێتە پەنای موتعیمی کوڕی عەدییەوە، مانای وایە بە شیرك و کوفرەکەی ڕازییە؟! نەخێر، بەڵکو تەنیا ئەوەیە کە سوودی بینیوە لە یاسایەك لە عادەتێك، کە لە سیستمی سیاسیی و کۆمەڵایەتیی ئەو ڕۆژگارەدا هەبووە.

+ مامۆستا! پێت وانیە حاڵەتەکە جیاوازە، چونکە کاتێك ئیسلامییەك دەبێتە وەزیر لە حکوومەتێکی لەو جۆرەدا، یاسایەك جێبەجێ ئەکا،

کە لە پەرلەمانەوە بۆی هاتوە، یەعنی ناتوانێك ئیزا فەیەك یان زیادو کەمییەك لەو یاسایەدا بکا؟

- بەڵێ ئەوە دوایی باسی دەکەین، کە دێینە سەر بەڵگەکانی ئەو ڕایەی کە دەڵێ: هەرچەندە لە بناغەدا قەدەغەیە، بچیە نێو حکوومەتێکەوە کە حوکم بە شەریعەت ناکات، بەڵام لەکاتی ناچارییداو بۆ دابینکردنی هەندێ بەرژەوەندیی، مادام هەندێك مەرج لە بەرچاو گیرابن، دروستە، ئەوکاتە ئەم مەسەلەیە دەخەینەڕوو.

ئێستا با جارێکی دیکە سەرنجی ئایەتەکان بدەینەوە: ئایەتەکان بە ڕوون و ڕاشکاویی ڕایدەگەیەنن: کە هەرکەسێ حوکم نەکا بەو شەریعەتەی کە خوا ناردوویەتە خوار، ئەوە کافرە، ستەمکارە، فاسقە،



165 ئێمەش دەڵێین: ئەوە هیچ گومانی تێدانیە کە وایە، بەڵام ئایا کەسێك



کەدەچێ بۆ ئەوەی ڕێ لەو جۆرە حوکمە بگرێ، ئەویش هەمان حوکمی هەیە؟! بە تەئکید نەخێر.

ئنجا وەڵامی قسەکەی جەنابیشت بەکورتی دەدەمەوەو دەڵێم: بەڵێ دەسەڵاتی جێبەجێکردن، تەنیا بڕیارەکان جێبەجێ دەکا، بەڵام کاری دەسەڵاتی جێبەجێکردن، هەمووی هەر بریتی نیە لە جێبەجێکردنی یاساکانی پەرلەمان، بەڵکو دەسەڵاتی جێبەجێکردن دەستی زۆر کراوەیەو، کۆمەڵێکی زۆر کاری ئیداریی و ڕۆژانەو هەنووکەیی هەن، کە مەرج نیە بڕیاریان لەسەر درابێ و، یاسایان لە پەرلەمانەوە بۆ دەرچووبێ، چونکە دەسەڵاتی جێبەجێکردن، بۆخۆی دەستی کراوەیەو ئەگەر دەستی کراوەنەبێ، وڵاتی بۆ بەڕێوە ناچێ، ئایا حکوومەت دەگونجێ بۆ هەموو کاروبارەکانی چاوەڕێ بێ، پەرلەمان یاساو بڕیاری بۆ دەربکا؟! بێگومان نەخێر، چونکە هەرگیز وڵات وا

بەڕێوە ناچێ، بەڵکو پەرلەمان چوارچێوەیەکی گشتی و هێندێ یاسای گشتی دادەنێ، بەڵام لە بواری وردەکارییەکاندا، دەسەڵاتی جێبەجێکردن، دەستی کراوەیە‌و، ئەوکەسە کە دەچێتە نێو ئەو دەسەڵاتی جێبەجێکردنەوە، بۆیە دەچێ تاکو لەو وردەکارییانەدا، دەوری هەبێ و، جڵەوی ئەو وەزع و حکوومەتە وەربسووڕێنێ بەرەو شەریعەت و، یاخود بەلای کەمەوە: کۆمەڵێك سوودو قازانج بۆ خەڵکی مسوڵمان دابین بکات و، کۆمەڵێك زەرەرو زیانیان لێ دوور بخاتەوە، ئیدی مەرج نیە بیکات بە حکوومەتێکی ئیسلامیی، چونکە ئەگەر بوو بە حکوومەتێکی ئیسلامیی، ئەوکاتە کێشەو مشتومڕمان لەسەری نیە.

دووەم: هەروەها ئەوە کە حوکم تەنیا هی خوایە، ﴿...إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ...﴾ یوسف: ٤٠، باسمانکرد کە ئەوە شتێکی سەلمێنراوە.



سێیەم: هەروەها ئەوە کە دەبێ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بکرێتە دادوەر، هەروەها شەریعەت بکرێتە دادوەر، ئەگەرنا ئینسان نابێتە مسوڵمان،

﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ...﴾ النساء: ٦٥.

ئەوەش شتێکی سەلمێنراوە، بەڵام ئەوە وەك شتێکی فیکریی عەقیدەیی، بەڵام وەك کردەوەو هەڵسوکەوت و مامەڵە کردن لەگەڵ واقیعدا، کە تۆ هەوڵی هێنانەدی بەرژەوەندییەك یان زیاتر بدەی، بەهۆی ئەو بەشدارییەوە، کاتێ کەتۆ لایەنی فیکرو ئیمان و عەقیدەکەت چەسپاوە، ئایا مەجالی تێدا هەیە، یان نا؟! دەڵێین: بەڵێ: مەجالی تێدا هەیە وەك دوایی باسی دەکەین.

## دووەم: وەڵامی بەڵگە عەقڵییەکان

ئێستاش بێینە سەر وەڵامی بەڵگە عەقڵییەکانیان، ئەوان چەند بەڵگەیەکی عەقڵییان هێنایەوە، گوتیان: لەبەر ئەوشتانە دروست نیە.

١- بەڵگەیەکیان بریتی بوو لە: شەرعییەت پێدانی ئەو حکوومەت و قەوارە سیاسییە، کە حوکم بە شەریعەت ناکات! ئێمە دەڵێین: ئەوکەسە کە دەچێ بەشدار دەبێ، کاتێ بۆی هەیە بەشداربێ، کە بچێ لەوێ کەم و زۆر، بڕیاری شەریعەت جێبەجێ بکا، کەسێ کەدەکرێتە وەزیر لە حکوومەتداو، وەزارەتێکی پێدەسپێردرێ، دەبێ دەستی کراوەبێ و بەشێوەیك ئەو وەزارەتە بەڕێوە ببات، کە لەگەڵ پرەنسیپ و بنەماکانی شەریعەتدا دژ نەوەستێ، ئەگەرنا ئەگەر بەدەست بەستراویی بچێ، ئەوە دروست نیە بچێ و، ئەوکاتە بەشدارییکردنەکەی حەرامە، چونکە مانای وایە ئەو چووە پشتگیریی ئەو ناشەرعییانەی کردوە، بۆیە کە دەچێ، دەبێ دەستی کراوەبێ و لەجیاتی ئەوەی لە ناشەرعییدا پشتی بگرێ، بەرەو شەریعەتی بێنێ، لەو بوارەی خۆیداو لەو بازنەیەدا کە پێی دەسپێردرێ و دەستی دەڕوا، ئەگەرنا ئەگەر دەرفەتی ئەوەی نەبێ، ئەوکاتە مەرجی بەشداربوونەکەی نەهاتۆتە دی و، کە مەرجەکەش نەهاتە دی و، ئەوکاتە بەشداربوونەکەی قەدەغە دەبێ.

٢- بەڵگەیەکی دیکەیان: متمانە پێنەمانی جەماوەر بەو خەڵکە ئیسلامییەی کە لە حکوومەتێکی وادا بەشدار دەبێ! دەڵێین: ئەوە لە حاڵەتێکدایە کە ئەوانە دانەمەزراو بن و، تەنازول بکەن و، وەك

بازیچەیەك وابن، بەدەستی ئەو قەوارە سیاسییەوەو، خاوەنی ئیرادەو ڕای خۆیان نەبن و، پێداگیریی نەکەن لە بنەماکانی شەریعەت، ئنجا کە ئاواش بن، ئەوکاتە دروست نیە! بەڵام بێگومان ئەوکاتە خەلەل و کەم و کووڕییەکە، بەهۆی ئەوەوە پەیدا بووە، کە ئەوانە ئینسانی دامەزراو و قایم نەبوون، نەك لەبەر ئەوەی ئەسڵی بەشدارییکردنەکە ناڕەوایە.

٣- بەڵگەیەکی دیکە یان ئەوەبوو کە: فشار دەهێنرێتە سەر ئەو وەزیرانە، یاخود ئەو خەڵکە ئیسلامییە کە بەشدار دەبێ و، تەنازولیان پێدەکەن! لەوەڵامی ئەوەشدا دەڵێین: ئێمە ناڵێین: فەرزە دەبێ خەڵکی ئیسلامیی هەر بەشداربن لەو حکوومەت و قەوارە سیاسییانەدا، بەڵکو دەڵێین: دەبێ تەماشابکەن: ئەگەر بزانن دەستیان ئاوەڵادەبێ و بواریان پێدەدرێ: فەرمان بکەن بەچاکەو، نەهی بکەن لە خراپەو، بواریان پێدەدرێ، دادگەریی بچەسپێنن و، دژی ستەم و چەوساندنەوەبن و، چاکە بکەن و دژی خراپە بن، ئەگەر بزانن بۆ ئەوانە بواریان پێدەدرێ، ئەوە بۆیان هەیە بچن، بەڵام ئەگەر بواریان پێنەدرێ و، فشارێکیان بێتە سەر تەحەممولی نەکەن و...هتد، ئەوە بێگومان ئەوکاتە دروست نیە.

٤- بەڵگەی کۆتاییشیان دەڵێن: کە دەڵێ: بەشداربووان دەبنە بەشدارو شەریك لە کەم و کووڕییەکاندا! ئەوە لە لایەکەوەو بە ئیعتیبارێك وایە، چونکە ئەو دەچێتە نێو ئەو قەوارە سیاسییەوە، کە کەم یان زۆر حوکم بە شەریعەت ناکا و کەم و کووڕیی هەن، بەڵام لە لایەکی دیکەشەوە: مادام ئەو کەسە کە بەشدار دەبێ، ئنجا بەسیفەتی وەزیر بەشداربێ، یان بە سیفەتی بەڕێوەبەری گشتی، یان بە هەر سیفەتێکی دیکە،

مادام هەر لە سەرەتاوە دیارە کە بابایەکی پابەندە بە شەریعەتەوەو، بەو مەرجەش شەرع ڕێپێداوە، کە دەبێ دەستی کراوەو ئاوەڵابێ، کەواتە: ئەوکاتە لە کەم وکووڕییەکاندا بەشدار نابێت، چونکە ئەوکاتە هەموو ئەو کەم وکوڕییانەی کە لە وەزارەتەکانی دیکەدا دەکرێن و، لە سەر دەستی کەسانی دیکە ئەنجام دەدرێن، ئەو پێچەوانەکەیان دەکا، ئاشکراشە ئەگەر بواری پێچەوانەکەیانی نەبێ، هەر دروست نیە بەشدار بێ، ئنجا کە بواری هەبوو، پێچەوانەی ئەو کەم وکوڕییانە بجووڵێتەوە، بۆ وێنە: ئەگەر وەزارەتەکانی دیکە گەندەڵیی دەکەن، دزیی دەکەن، زوڵم دەکەن، خزم خزمێنەو مەحسوبییەت بەکار دێنن، مەنتیقە گەریی و حیزبایەتیی بەکار دێنن، ئەویش پێچەوانەی ئەوانەی کرد، کەواتە: لە جیاتی ئەوەی بەشدار بێ لە کەم و کووڕییەکاندا،


١٦٩


بە پێچەوانەوە: بازاڕێکی دیکە دێنێتە گۆڕێ، کە خەڵك ئەوکاتە دەڵێ: لەوێ گەندەڵیی هەیە، بەڵام لەوێ پاکیی هەیە! لەوێ ناوچەگەرێتیی هەیە، بەڵام لەوێ هاووڵاتێتیی هەیە! لەوێ ستەم هەیە، کەچی لەوێ دادگەریی هەیە! لەوێ خزم خزمێنە هەیە، بەڵام لەوێ بێ فەرق و جیاوازیی هەیە!

ئنجا وەك دوایی باسی دەکەین، ئێمە ناڵێین: بە ڕەهایی دروستە بەشداریی بکرێ، بەڵکو بۆیە بەشداریی دەکرێ، کە بەرژەوەندیی تەحقیق بکرێ و بەرژەوەندییش، وەدوورخستنی زیانەکانەو، هێنانە پێشی قازانجەکانە، ئنجا ئەگەر ئەوەی تێدانەبێ، دروست نیەو، کە ئەوەشی تێدا هەبوو، ئەوکاتە ناگونجێ بڵێین: ئەو وەزیرە یاخود، ئەو چەند وەزیرە، بەشدارن لە کەم وکووڕییەکان و، لە ناشەرعییەکان و ستەم و خراپەکانی ئەو قەوارە سیاسییەدا، هەرچەندە بەرواڵەت کە لە دەرەوە

سەرنج دەدەی: ئەندامێکە لەوێدا، بەڵام کە لێی ورد دەبیەوەو، لەسەر ئەرزی واقیع تەماشای دەکەی، کاروکردەوەی و پەرێزی و شوێنەواری، جیایە لە شوێنەوارو کارو پەرێزی ئەوانی دیکە، کە گوێنادەن بەشەریعەت و، بنەماکانی شەریعەت پێشێل دەکەن، ئەو کاتە دڵنیا دەبی: کە ئەو دوو جۆرە کەسانە، هەرچەندە لەیەك قەوارەو حکوومەتدان، بەڵام یەك نین و، هەرخوایان یەکەو، دوو بازاڕی زۆر جیاوازن.

+ مامۆستا! ئەو بەڵگانەی ئەوان دەیانهێننەوە، هەرچەندە وەك جەنابت خستتە ڕوو، بە بەڵگە ناشێن و ئیسپاتی ئەو دەعوایەی ئەوانیان پێناکرێ، بەڵام بۆچی مەسەلەکە، تاکو ئێستاش هەر بەکراوەیی ماوەتەوە حەسم و یەکلایی نەکراوەتەوە؟!

- هۆکاری ئەوە بەم شێوەیە! ئەم بابەتە لە بناغەدا بابەتێکی ئیجتهیادییەو ئێمەش دەڵێین: لە ئەسڵدا ڕەوانیە تۆ بەشداربی لە حکوومەتێکدا، کە حوکم بەشەریعەت ناکات و، پابەند نیە بە شەریعەتەوە، ئێمەش وا دەڵێین، بەڵام ئێمە دەڵێین: هەندێ حاڵەتی هەڵاوێردراو هەن حوکمەکەشیان تایبەتەو جیایە، لەکاتێکدا کە مسوڵمانان لە بەرامبەر واقیعێکدا قەرار دەگرن، کە بەسەریاندا فەرز کراوە، دەبێ چی بکەن؟! واقیعێکە قەوارەیەکی سیاسیی هەیە، حوکم بە شەریعەت ناکا، ئایا دەبێ چۆن مامەڵەی لەگەڵدا بکەن؟! وەك جاری دیکەش گوتوومە: بابای مسوڵمان لەو حاڵەتەدا چوار ئەگەر (إحتمال)ی لەپێشن:

١- لەگەڵی بەشەڕ بێ و هەوڵبدات بەهێز هەڵیتەکێنێ.

٢- یاخود لەبەری ڕابکات و خۆی بشارێتەوە، وەك هاوەڵانی ئەشکەوت.

٣- یاخود تەسلیمی بێ و، بە حەق و ناحەقی ڕازیبێ و، ملی بۆ کەچ بکا، یان گۆشەگیربێ و بێدەنگ بێ کە ئەوەش هەر جۆرێکە لە تەسلیمبوونی واقیع.

٤- یاخود بچێتە نێوی و مودارای لەگەڵدا بکات و، پلە پلەو حەکیمانە سەرگەرمی پاکسازیی و چاکسازیی تێداکردنی بێ!!

ئێمە دەڵێین: ئەوەی چوارەمیان بە مەرجێ ئومێدی ئەوەی هەبێ بیگۆڕێ، لە هەموویان لە شەریعەتەوە نزیکترە، چونکە ئەگەر تۆ تەماشای سیرەو ژیانی پێغەمبەران بکەی (سەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێ) دەبینی هەوڵیان نەداوە ئەو واقیعەی کەتێیدا ژیاون، بە زۆرو هێز لەگەڵیدا ڕووبەڕووی ببنەوەو هەڵیتەکێنن، من هیچ پێغەمبەرێکم نەبینیوە، کودەتای سەربازیی (انقلاب)ی کردبێ، هەروەها هیچ پێغەمبەرێکم نەبینیوە، هێزی کۆکردبێتەوەو گوتبێتی: با ئەم واقیعە بە هێز بگۆڕین! بەڵکو پێغەمبەران(سەلامی خوایان لەسەر بێ) بانگەوازیان کردوە، خەڵکیان تێگەیاندوە، جەماوەریان لە ناخەوە، لە عەقڵ و دڵەوە گۆڕیوە، ناشڵێم: پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێ بێ) لەکاتێکدا کە پێویست بووبێ، پەنایان نەبردوە بۆ هێز، بەڵام هەرگیز پەنایان نەبردوە بۆ هێز، بۆ گۆڕینی واقیع، بەڵکو هەموویان لە میانی بانگەوازو بانگکردنەوە، واقیعیان گۆڕیوە، بەڵام دوایی ئەگەر دەستدرێژیی کرابێتە سەر کیانێك کە ئەوان بەو جۆرو شێوازەی گوتمان، دروستیان کردوە، بێگومان بە هێز لەگەڵیدا ڕووبەڕوو بوونەتەوە، ئنجا ئاشکرایە کە مەسەلەی ڕاکردن لە واقیع، مەسەلەیەکی سەلبیی و خراپەو پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە چەندان فەرموودەدا ئاماژەی پێدەدا، بۆ نموونە: لە یەکێ لە


171


فەرموودەکاندا پێغەمبەر دەفەرموێ: ((المسلم الذی یخالِطُ الناس و یصبر علی أذاهم، خیر من الذي لا یخالطهم ولا یصبر علی أذاهم))[1]، واتە: ئەو مسوڵمانەی کە لەگەڵ خەڵك تێکەڵ دەبێ و، سەبر دەگرێ لەسەر ئەزییەتەکانیان، باشترە لەوەی کە تێکەڵ نابێ و سەبریش ناگرێ، لەسەر ئازارەکانیان.

هەڵبەتە تەسلیم بەواقیع بوونیش، یاخود گۆشە گیربوون، کە ئەویش هەرجۆرێکە لە تەسلیم بوون و خۆبەدەستەوەدان، ڕێبازی پێغەمبەران (سەلامی خوایان لەسەر بێ) نیە، کەواتە: دەمێنێتەوە مووداراکردن، بەڵام بۆ گۆڕین و چاکسازیی، نەك بۆئەوەی ببی بە بەشێك لەو واقیعە خراپە، بەڵکو بۆ گۆڕین و دەستکارییکردن، ئەویش بەشێوەیەك کە لە ڕێگای قەناعەت و ئیرادەی خەڵکەوە، گۆڕانەکە ببێ، نەك لە ڕێی خۆ بەسەر خەڵکدا فەرزکردنەوە، کە ئەوە چ عەلمانییەك بیکا، وەك وەختی خۆی مارکسییەکان بڕوایان بە دیکتاتۆریەتیی پڕۆلیتاریا هەبوو، چ ئیسلامییەك بیکا، بڵێ: من خۆم فەرزدەکەم بەسەر خەڵکدا بۆ ئەوەی شەریعەتی خوا جێبەجێ بکەم![2] هەر هەڵەیەو پێچەوانەی بەرنامەو ڕێبازی پێغەمبەرانە (سەلامی خوایان لێ بێ)، بە نسبەت ئەوانی دیکەشەوە: پێچەوانەی دیموکراسییە، بەڵکو دەبێ لە میانی قەناعەت پێکردنی خەڵك و جووڵاندنی ئیرادەی خەڵکەوە، ئەو گۆڕانکاریی و پاکسازیی و چاکسازییە ئەنجام بدرێ، تاکو سەرەنجام سەروبەر بگرێ و، مایەی دابینکردنی بەرژەوەندییەکانی خەڵك و بەختەوەرکردنیان بێ.

---

(١) أخرجه أحمد: ٥٠٢٣، والترمذي: ٢٥٠٧.

(٢) وەك گرووپە پەڕگیرە بەناو جیهادیەکان دەیانکرد،بۆ وێنە: داعش.

# باسی سێیەم

# بەڵگەکانی ئەوانەی بەشداریی کردن لە حکوومەتێکی پابەندنەبوو بە شەریعەت دا، بەچەند مەرجێکەوە، بە ڕەوا دەزانن

## پێشدەستی

بەڕێز مامۆستا!

+ لە ئاڵقەی پێشووی ئەم بابەتەدا، باسمان لەوەکرد کە زانایان سێ ڕایان هەن سەبارەت بە بەشدارییکردن لە حکوومەتێکدا، کە کار بە بنەماکانی ئیسلام نەکا، یان بەشێکی فەرامۆش دەکات، بەڕێزتان ڕوونکردنەوەتان لەسەر بۆچوونی ئەو زانایانەدا، کە بە ڕەهایی دژی بەشدارییکردنن لە حکوومەتێکی لەو جۆرەداو، ڕایەکەیانت هەڵسەنگاندو، دەریشت خست کە بەڵگەکانیان بایی ئەوە ناکەن، دەعواکەیان ئیسپات بکەن، ئێستاش لە بارەی ڕای دووەم و سێیەمەوە، کە نزیکن لە یەکەوە، دەپرسین: ئایا ئەو زانایانەی کە پێیان باشە: بەشداریی لە حکوومەتێکدا بکرێ کە کار بە بنەماکانی ئیسلام، یان بە بەشێك لە بنەماکانی ناکات، ئەو بەڵگانە چین، کە ئەوان پشتیان پێبەستوون؟!

- بەر لەوەی بچینە سەر ئەسڵی مەبەست، بە پێویستی دەزانم ئاماژە بە مەسەلەیەکی گرنگ بکەم، ئەویش بریتیە لەوە کە: ئەوە تێڕوانینی ئیسلامییەکانە بۆچۆنیەتیی و شێوازی گۆڕین و چاکسازیی کۆمەڵگا، کە ئەو ڕاجیاییە بەرهەم دەهێنێ، لەمەڕ هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ ئەو قەوارە سیاسییانەدا، کە شەریعەت پیادە ناکەن.

بەڵێ ڕیشەی ئەوە کە ئایا ڕەوایە بەشداریی بکرێ لە دامودەزگاکانی قەوارەیەکی سیاسییدا، کە شەریعەت پیادە ناکا؟ یاخود دەبێ بەشداریی نەکرێ و، دژایەتیی بکرێ؟ یاخود دەبێ مودارای لەگەڵ بکرێ؟

175

هەروەها ئایا بناغە لەو بەشداریی کردنەدا، ڕەواییە یان ناڕەواییە؟ واتە: ئایا بناغە ڕەواییەو هەڵاواردنی تێدایە؟ یاخود بناغە ناڕەواییەو، هەڵاواردنی تێدا نیە؟

بەڵێ ئەو ڕاجیاوازانە، دەرهاویشتەی جۆری بوونناسیی و تێڕوانینی لایەنە ئیسلامییەکان و تەوژمی ئیسلامیین، کە ئایا دەبێ گۆڕانکاریی و پاکسازیی و چاکسازیی و لە کۆمەڵگادا چۆن بکرێ؟ لە حاڵێکدا کە قەوارەیەکی سیاسیی هەیەو، شەریعەت پیادە ناکا لە نێو میللەت و کۆمەڵگایەکی مسوڵماندا؟!

پێشتریش ئاماژەمان پێدا: کە دوو بۆچوونی لەیەك جیاوازی سەرەکیی لەو بارەوە هەن:



١- بۆچوونێکیان دەڵێ: پێویستە وەك چۆن لە ڕابردوودا، پێغەمبەران صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێ، بەرگەی ئازارو ناڕەحەتیی خەڵك و گەلانی خۆیانیان گرتوەو، لە نێو کۆمەڵگاکانی خۆیاندا ماونەتەوەو، سەر قاڵی بانگەوازو هۆشیارکردنەوەو تێگەیاندنی خەڵك بوون و، لە میانی قەناعەت پێهێنانی خەڵك و هۆشیارکردنەوەیاندا، ویستوویانە کۆمەڵگا بگۆڕن و بەو ئاڕاستەیەدا کە پەیام و شەریعەتی خوا دەیخوازێ، پێویستە ئێمەش هەر ئەوشێوازو ڕێبازە بگرین و بەکاربێنین.

٢- بۆچوونێکی دیکەش دەڵێ: ئەو کۆمەڵگاو دەوروبەرەی کە حوکمڕان و دەسەڵاتدارەکەی شەریعەتی تێدا پیادە ناکا، پێویستە دژایەتیی بکرێ و سەنگەری لێ بگیرێ!

بەڵام ئەوەندەی من سەرنجی ژیانی پێغەمبەرانم داوە، پێغەمبەران (علیهم السلام) بەگشتیی و، پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد بەتایبەت

(صلی الله علیه وسلم) بەتایبەت، بۆم دەركەوتوە، كە پێغەمبەران بەرنامەیان بۆ چاكسازیی كۆمەڵگا، ئەوە نەبووە، كە بە گژ كۆمەڵگاداو بەگژ حوكمڕانانداا بچنەوەو سەنگەریان لێ بگرن، بەڵكو ڕێبازو شێوازیان ئەوە بووە كە بچنە نێو كۆمەڵگاو، هەوڵ بدەن قەناعەتیان پێبێنن و، كاریگەرییان بۆسەر عەقڵ و دڵ و ڕەوشت و ڕەفتاری خەڵك هەبێ و، لە نێوەوە گۆڕانیان بەسەردا بێنن، وەك خوای كاربەجێ دەفەرموێ:

﴿...إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوۡمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمۡۗ ...﴿١١﴾﴾ الرعد.

واتە: خوا واقیعی هیچ كۆمەڵگایەك ناگۆڕێ، هەتا ئەوان دەروونی خۆیان نەگۆڕن.



بەڵێ پێغەمبەران (علیهم الصلاه والسلام) هاتوون واقیعی كۆمەڵگاكان بگۆڕن، بەڵام بۆ ئەنجامدانی ئەو گۆڕین و پاكسازیی و چاكسازییە، سەرەتا ویستوویانە: دەروونی خەڵك بگۆڕن، دەروونی خەڵكیش، دابەش دەبێ بۆ سێ (٣) بەش:

یەكەم: بیروڕایەكان (الأفكار).

دووەم: هەست و نەستە دەروونییەكان (المشاعر).

سێیەم: هەڵوێست و هەڵسوكەوتەكان، (السلوك).

بەڵێ پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) لە سەرەتاوە ویستوویانە بیروڕای خەڵك بگۆڕن لە: شت پەرستیی و، شەخس پەرستییەوە، بۆ خوا پەرستیی، چونكە كۆمەڵگاكان بەگشتی، یان لە بازنەی شتەكاندا دەخولێنەوە، یان لە بازنەی شەخسەكاندا، یان لە بازنەی مەبدەء و بیروڕایەكان دا، ئنجا پێغەمبەران ویستوویانە: خەڵك لە

بازنەی شت و شەخس پەرستییەوە، بگوازنەوە بۆ بازنەی بووناسیی و ئیمانێك كە لە وەحیی خواوە سەرچاوە دەگرێ.

بەڵام بە پێچەوانەوە نەیارانی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) ویستوویانە بە زۆرو فشار، لە جیاتی دەروونی خەڵك، ڕواڵەتی خەڵك بگۆڕن و، زیاتر كاریان لەسەر ڕواڵەت و دیوی دەرەوەی خەڵك كردووە، بۆ ئەوەش هەرسێ هۆكاری:

١- ترساندن .

٢- برسیكردن .

٣- چەواشەكردنی خەڵكیان، هەڵبژاردوە.

هەر بۆیەش خوا (سبحانه وتعالی) لە زۆر شوێنی قورئاندا، باسی: سێكوچكەی: (فیرعەون و قارووون و هامان)مان بۆ دەكا، چونكە فیرعەون ڕەمزی سەركوتكردن و حوكمی تاكییەو، قارووون ڕەمزی ئیستیغلال و چەوساندنەوەی ئابوورییەو، هامانیش ڕەمزی چەواشەكردنی ڕاگەیاندنییە.

بەڵام پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام):

١- نەیانویستوە، خەڵك چەواشە بكەن بەهۆی بانگەشەی ناڕاست و فریودەرانەوە، وەك هامان دەیكرد.

٢- نەشیان ویستوە لەڕێی چەوساندنەوەی ئابووریی و بەناهەق دەست بەسەر سەروەت و سامانی خەڵك داگرتنەوە، برسییان بكەن، تاكو ناچاربن شوێنیان بكەون، وەك قارووون دەیكرد.

٣- هەروەها نەشیان ویستوە لەڕێی ستەم و چەوساندنەوەی سیاسییەوە، خەڵك بترسێنن، بۆئەوەی ناچاریان بكەن شوێنیان بكەون، وەك فیرعەون دەیكرد، بەڵكو ویستوویانە خەڵك ئازاد بكەن.

ئنجا دیارە ئەم جۆرە بیروبۆچوونە كە دەڵێ: دەبێ خەڵك لە نێوەوە گۆڕانی بەسەردا بێ و، دەبێ كۆمەڵگا لە بنچینەوە گۆڕانی بەسەردابێ، نەك لە هەڕەم و چڵە پۆپەوە، ئەو بیرو بۆچوونە، ئەوە بەرهەم دەهێنێ، كە پێویستە هەڵسوكەوت لەگەڵ ئەو قەوارەو دەوڵەتەو دام و دەزگایەكانیدا بكەی، كە لەنێویدا دەژی، دیارە بە ئەندازەی ئەوەی كە قازانجی تێدا بەدی دەكەی.

هەروەها بیروبۆچوونەكەی دیكە كە دەڵێ: نەخێر ئەم واقیعە هەمووی ڕەتكراوە، (مرفوض)یەو، پێویستە هەڵیوەشێنی و لایبەرێ، ئەمەش ئەوە بەرهەم دەهێنێ كە: دەبێ دابڕان لەگەڵ ئەو قەوارەو دام و دەزگایەكانی دا بكەی و، دژایەتیی بكەی و، لە سەرێ بۆ خوارێ زەربی بەسەردا بێنی و، بە هیچ جۆرێك نەچیتە نێوی!

هەڵبەتە ئەم مەسەلەی چۆنیەتی گۆڕین و چاككردنی واقیع و دەوروبەر[1]، بەگشتی مەسەلەیەكی ئیجتیهادییەو، بواری قسەو مشتومڕی تێدایە، هەر بۆیەش زانایانی ئیسلامیی هاوچەرخ، تێیدا یەكڕا نەبوون، ئەویش لەسۆنگەی ئەوەوە كە واقیعەكان جیاجیان، بۆ نموونە: لە هەندێك شوێن ڕێ دەدرێ، كە لە ڕێگای چوونە نێوی ئەو

---

(١) ئێمە كتێبی چوارەمی ئەم مەوسووعەیەمان بۆ شیكردنەوەی ئەم بابەتە تەرخانكردوە، بە ناوونیشانی: {چۆنیەتی گۆڕینی كۆمەڵگا و پاكسازیی و چاكسازیی تێداكردنی}.

دام و دەزگایانەوە، هەندێك ئامانج بە دەستبێنی، بەڵام لە جێیەكی دیكە بوار نادرێ، ئنجا دیارە ئەوەی كە بوار دەدرێ، بەشدارییكردن تێیدا دروستەو، ئەوەش كە بوار نادرێ، تەنانەت ئەوانەش كە دەڵێن: دروستە، دەڵێن: نابێ بەشداریی بكرێ، مادام ئامانجەكان بەدەست نایەن و، مەرجەكان نایەنەدی.

+ خاوەنی ئەو ڕایەی كە پێی وایە: لە ڕێگای بانگەوازو ڕاگەیاندن و بەدەستهێنانی دەنگی خەڵكەوە، ناتوانی ئامانجەكانت بە دەستبێنی، هەندێك نموونەی وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست، باس دەكەن، كە ئیسلامییەكان لەوڕێیەوە نەیانتوانیوە گۆڕانكاریی بكەن، بەهۆی ڕاست نەكردنی بانگەشەكارانی دیموكڕاسییەوە لەگەڵ دیموكڕاسییدا!.

- ڕاستە ئەو جۆرە واقیعانە شوبهەیان دروستكردوە، لە بەرانبەر ئەو ڕێڕەوەی دیكەدا كە دەڵێ: دروستە لەگەڵ واقیعێكی ناشەرعیی دا مامەڵە بكرێ و نزیكیی و هەڵسوكەوت بكرێ، بەڵام پێویستە بزانرێ: ئەو ڕایەش كە دەڵێ: دروستە، دەڵێ: بە مەرجەوە، نەك بە ڕەهایی و، ناڵێ هەرچۆن بێ، دەبێ هەر بەشداربی! بەڵكو دەڵێ: ئەگەر بزانی سوودی نیە، دروست نیە بەشداربی.

ئێستاش با بێینە سەر ئەسڵی مەبەست، كە بریتیە لە قسەكردن لەبارەی ئەو ڕایەوە كە دەڵێ: ڕەوایە بەشداریی بكرێ لە حكوومەتێكی پابەند نەبوو بە شەریعەتدا.

ئەم ڕایە - وەك پێشتریش گوتمان - تێكهەڵكێشە لە دوو ڕا، كە ڕایەكیان دەڵێ: بناغە لە بەشدارییكردن لەو حكوومەتەدا، كە شەریعەت پیادە ناكات، ڕەواییە، ڕایەكەی دیكەش دەڵێ: بناغە

ناڕەوایيە، بەڵام بە هەڵاواردن و وەك ناچاریی و بۆ بەدەستهێنانی هەندێك ئامانج، دروستە، ئنجا ئێمە هەردوو ڕایەکان بە تێکهەڵکێشی باس دەکەین، چونکە ئەو ڕایەی کە دەڵێ: بناغە لەومەسەلەیەدا، ڕەوا (مباح) نەبوونەو، وەك هەڵاواردن (إستثناء) دروستە، ئەو ڕایەش دەگرێتەوە، نێوخۆی کە دەڵێ: بناغە ڕەوابوونەو بەشداریی تێداکردنی ئەوجۆرە قەوارەو حکوومەتە (کە پابەند نابێ بە شەریعەتەوە) هیچ گرێ و گۆڵی تێدانیە! بۆیە ئێمە هەرکات ئەوەمان سەلماند کە لەکاتی پێویستیی و ناچارییداو، وەك هەڵاواردن، ڕەوایە مسوڵمانان بەشداریی حکوومەتێك بکەن، کە کەم یان زۆر، پابەند نابێ بەشەریعەتەوە، ئەوە لەپێش ئەوەشدا ئەو مەبەستەمان بەپێی ئەو ڕایەش کە دەڵێ: بناغە ڕەوایی بەشداربوونەو، بەشداریی تێداکردنی ئەو جۆرە قەوارەو حکوومەتە ڕەوایە، ئیسپات کردوە، چونکە هەرکات ئیسپاتی ڕەوایی بەشداربوونی مەرجدار کرا، ئەوە چاکترو پێشتر: ئیسپاتی ڕەوایی بەشداربوونی بێ مەرج کراوە!

181

ئێمە لەوبارەوە سێ (٣) جۆرە بەڵگە دێنینەوە:

## جۆری یەکەم: لە بەڵگەکان: شەش بنچینەی شەرعیی

بەڕێزان! ئەو شەش بنچینە شەرعییانە، سەرجەم زانایانی ئیسلام، یان زۆربەی زانایان، لەسەریان یەکدەنگن، دیارە هەندێکیان هەر واتاو مەفهوومی ئایەتەکانی قورئان و فەرمایشتەکانی پێغەمبەری ئیسلامن (علیه الصلاة والسلام)، هەندێکیشیان هەڵهێنجراوی کۆمەڵێك لە ئایەت و فەرمایشتەکانن، هەڵبەتە هەموو بنچینە شەرعییەکانیش هەروان:

١) یەکێك لەو بنچینانە ئەوەیە کە: [پلە پلەیی یاسای خوایە لە دروستکراوەکانی و لە فەرمانەکانیدا] (التدرج سنة الله في خَلْقِه و في أمره) یانی: ئەگەر تەماشای دروستکراوەکانی خوا بکەی، دەبینی: پلە پلە دروستی کردوون و دروستیان دەکات، بۆ نموونە: تەماشای دەنکە تۆوێك، یان نەمامێك بکە! کە دەڕوێن، هەروەها کۆرپە (جنین)، چ کۆرپەی مرۆڤ، چ هی ژیاندارانی دیکە، پلە پلە پێدەگا و هەراش دەبێ.

خواش - سبحانه وتعالى - کە باسی دروستکرانی ئاسمانەکان و زەوی دەکا، دەفەرموێ:

﴿هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِۚ ... ﴿٤﴾﴾الحديد.

واتە: (خوا) ئەو کەسەیە کە ئاسمانەکان و زەوی بە شەش (٦) ڕۆژ {واتە: بە (شەش) قۆناغ}دروست کردوون، پاشان چووەتە سەر عەرش «بەو شێوەیەی کە بۆ خوا شایستەیە».

کەواتە: یاسای خوا وایە، کە پلە پلەیی (التدرّج) لە دروستکراوەکانیدا هەیە.

هەروەها فەرمانەکی خواش بە هامان شێوەن، بۆ نموونە: ئێمە دەزانین: قورئان لە ماوەی بیست و سێ (٢٣) ساڵدا بۆ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دابەزیوە، کە دوو لەسەر سێی لە مەککەو، یەك لەسەر سێیشی لە مەدینە هاتوەو، یاساکانی شەریعەت لە ماوەی دە (١٠) ساڵی تەمەنی بەپیزی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) کە لە مەدینە گوزەراندوویەتی، هاتوون، نەك بەرۆژێك یان مانگێك یان ساڵێك!

ئنجا نەك هەر یاساکانی شەریعەت بەگشتی، بەڵکو تاك تاکی یاساکانیش بەهەمان شێوە، بۆ نموونە: ئەگەر تەماشای (نوێژ) بکەین: لە پێشدا بەیانیان دوو ڕکات و ئێواران دوو ڕکات بووە، (الغداة والعشي) دوایی لە ساڵی دەیەمین، یان یازدەیەمینی پێغەمبەرایەتییدا، ئەو کاتەی پێغەمبەر شەوڕۆیی (إسراء)ی کرد بۆ ئاسمان، لەو شەوەدا پێنج نوێژە فەرزەکان پێویست کران.

هەروەها (ڕۆژوو): لە پێشدا مانگی سێ (٣) ڕۆژ بووە، دوایی کراوە بە مانگی ڕەمەزان.

دیسان (زەکات): لە پێشدا هەر ماڵ بەخشین بووە بە گشتیی، دوایی زەکات دیاریی کراوە.

هەر وەها قەدەغە کردنی (شەڕاب): بە چوار قۆناغ قەدەغە کراوە.

دیسان قەدەغەکردنی (سوود) بە هەمانشێوە بە چەند قۆناغێك بووە، لە پێشدا زەمینەسازیی بۆ کراوەو دوایی قەدەغە کراوە.

تەنانەت لەچۆنیەتیی و شێوازی بانگەوازیشدا، پلەپلەیی ڕەچاوکراوە، وەك لە صەحیحی بوخاریی و موسلیمدا هاتوە کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کاتێك (معاذ بن جبل) دەنێرێ بۆ یەمەن پێی دەفەرموێ: با یەکەمین شتێك کە خەڵکی بۆ بانگ دەکەی، بریتیی بێ لە خوا بەیەکگرتن، ئنجا کاتێك وەڵامی خوا بەیەکگرتنەکەیان دایەوە، پێیان بڵێ: خوا لە شەو و ڕۆژێکدا پێنج نوێژی لەسەر فەرز کردوون، ئنجا ئەگەر ئەمەشیان بە قسەکردی، ئاگاداریان بکەوە، کە خوا زەکاتی لە ماڵەکانیاندا فەرزکردوە[1]، کەواتە: یەکەم ئیمان و عەقیدە، دوایی عیبادەت و، ئنجا دێتە سەر زەکات و لایەنی ئابووریی.



+ کەواتە مەبەستتە بڵێی: گۆڕانکاریی پێویستیی بەم پلە بەندییەیە؟

- مەبەستم ئەوەیە کە (پلە پلەیی) یاسای خوایە لە دروستکراوەکانی و لە فەرمانەکانیدا، بۆیە ئێمەش ئەگەر بمانەوێ واقیع و کۆمەڵگا بگۆڕین، یەك تەکان بۆمان ناگۆڕێ و، بەسەبرێك و دوو فووان ناگۆڕێ و، پێویستیی بە ئارامگریی و قۆناغبەندیی هەیە، ئایا

---

(١) (... لما بعث النبي (صلى الله عليه وسلم) معاذاً نحو اليمن، قال له: إنك تَقْدَمُ على قومٍ من أهل الكتاب، فليكن أول ماتدعوهم إلى أن يوحِّدوا الله تعالى، فإذا عرفوا ذلك، فأخبرهم أن الله فرض عليهم خمس صلوات في يومهم وليلتهم، فإذا صلّوا، فأخبـرهم أن الله افترض عليهم زكاةً في أموالهم...)، صحيح البخاري، رقم: ١٤٥٨، صحيح مسلم رقم: ٣١.

پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) دەوڵەتی ئیسلامیی و كۆمەڵگای ئیسلامیی بە شەوو ڕۆژێك دروستكرد؟ یان بە بیست و سێ (٢٣) ساڵ؟ بێگومان خشت خشت دایناوەو، قۆناغ قۆناغ دروستی كردوە، ئێمەش دەبێ چاو لە پێغەمبەری خۆمان بكەین، ئایا ئەوەی ئەو بە (٢٣) ساڵ كردی، ئێمە دەتوانین بە (٢٣) ڕۆژ بیكەین؟! بێگومان دەبێ زەمینەی ئەنجامدانی حوكمەكانی شەریعەت، ساز بكەین، ئەوجار حوكمەكان جێبەجێ بكەین، بۆ نموونە: بۆچی سزای زیناو داوێنپیسیی لە ساڵەكانی كۆتایی تەمەنی پێغەمبەردا (صلى الله علیه وسلم) پێویست كراوە؟ چونكە پێشتر كۆمەڵگا زەمینەی بۆ ساز نەكرابوو و پەروەردە نەبوو بوو، دەبێ سەرەتا خەڵك پەروەردە بكرێ لەسەر ئیمان و ئیسلام و ئەخلاق و، پاشان هۆكارەكان بڕەخسێنرێن

١٨٥

بۆ پێكەوەنانی خێزانێكی مسوڵمانانە، ئنجا ئەگەر خەڵكێك لە بواری جینسییەوە، لادانی كرد، بۆت هەیە سزای بدەی، هەروەها سزای دزیی كە (دەستبڕین)ە، بۆچی لەسەرەتاوە پێویست نەكراوە؟ چونكە دەبێ پێشێ پێداویستییەكانی خەڵك دابین بكرێن و، كۆمەڵگایەك هەبێ و دامەزراوەكان هەبن، تاكو خەڵك لە ناچارییدا دزیی نەكا، ئنجا بۆت هەیە، سزای دەستبڕین جێبەجێ بكەی، هەروەها سزای ڕێگریی و، سەرجەم سزا شەرعییەكانی دیكەش، بەهەمان شێوە.

كەواتە: ئێمە ناتوانین بەبێ ڕەچاوكردنی پلە پلەیی، كۆمەڵگاو قەوارەیەكی ئیسلامیی دروست بكەین، ئەویش بەوجۆرە كە مامەڵەو كارلێك (تعامل و تفاعل) لەگەڵ دەوروبەرت بكەی و، وردە وردە بەرەو شەریعەتی بهێنی و، بەرەو ئەو ئاڕاستەیەی كە خوای پەروەردگار دەیەوێ، وەری بچەرخێنی، بەڵام ئەوەی كە دەڵێ: یان

هەموو، یان هیچ، یان دەبێ ئێستا دەوڵەتیکی ئیسلامیی تەواو عەیار دابمەزرێنین، یاخود بڕوامان بە نیوە چارەسەرو نیوە هەنگاونان نیە! ئەوە لە ڕاستییدا خەیاڵ پڵاوەو، تەنانەت پێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم) بۆی نەکراوە، بەیەك ڕۆژ دەوڵەتی ئیسلامیی دابمەزرێنێ و، لەماوەی (٢٣) ساڵدا بنیاتی ناوە، بۆیە ئەوەی کە دەڵێ: دەبێ هەر ئێستا دەوڵەتی ئیسلامیی دابمەزرێنین، ئەوە لەو یاسایەی خوا حاڵی نەبووە، کە پلەپلەیی هەم بۆ دروستکراوەکانی خواو، هەم بۆ جێبەجێکردنی بەرنامەکەی و، بۆ گەشەکردنی کۆمەڵگاکان، پێویستەو، دەبێ ڕەچاو بکرێ.

٢) بنچینەیەکی دیکەی شەرعیی بۆ ئیسپاتی ئەوە کە ڕەوایەو دروستە، ئێمە بەشداریی ئەو حکوومەت و قەوارە سیاسییانە بکەین، کە شەریعەت پیادە ناکەن، بە مەرجێك تەماعمان هەبێ لە چاککردنیاندا، (چونکە دەبێ هەمیشە ئەو مەرجەمان لە پێش چاوبێ) ئەوەیە کە: [تەکلیفی شەرعیی، بە ئەندازەی توانایە]، (التكليف الشرعي على قدر الوسع) کە زانایانی شەرعزان بە زۆر شێوە تەعبیریان لێداوەتەوەو، ئەم بنچینە شەرعییەش زانایان لە چەندان دەقی شەریعەتیان وەرگرتوە، بۆ وێنە:

١- خوای بێهاوتا دەفەرموێ: ﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ مَا اسْتَطَعْتُمْ ... ﴿١٦﴾﴾ التغابن، واتە: ئەوەندەی لە تواناتاندایە، پارێز لە خوا بکەن.

٢- هەروەها لە سوورەتی البقرة ـ ٢٨٦ـ دەفەرموێ: ﴿لَا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ...﴾، واتە: خوا لەسەر هیچ نەفسێك شتێك پێویست ناکات، مەگەر ئەوەی لە توانایدا هەبێ.

٣- پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) لە فەرمایشتێکدا کە (بخاري) بە ژمارە (٦٨٥٨) لە صەحیحەکەیدا هێناویەتی دەفەرموێ: ((اذا أمرتكم بأمرٍ فأتوا منه ماستطعتم))، واتە: ئەگەر فەرمانم بە شتێك پێکردن، چەندتان لە توانادایە لێی ئەنجام بدەن.

کەواتە: کە ناتوانی یەکسەر شەریعەت پیادە بکەی و، یەکسەر دەوڵەت بنیات بنێی، ئەوەندەی لە تواناتدایە بیکە.

٣) بنچینەیەکی دیکە ئەوەیە کە: [کەمکردنەوەی خراپەو ستەم پێویستە] واتە: ئەگەر نەتوانی ستەم و خراپە ڕیشەکێش بکەی و، بە یەکجاریی لایبەری، لەسەرت پێویستە کەمی بکەیەوە، چونکە: زانایانی ئیسلام بۆ نموونە: (الغزالي والعز بن عبدالسلام وابن تيمية وابن القيم والشاطبي)، دەڵێن: شەریعەت بۆ هێنانەدی بەرژەوەندییەکان و لابردنی زیانەکان هاتوە، بۆ وێنە: (ابن تيمية)[(1)] دەڵێ: (الشريعة جائت لتحصيل المصالح وتكميلها، وتعطيل المفاسد وتقليلها، حسب الإمكان، ومطلوبٌ ترجيح خير الخيرين إذا لم يُمْكِنْ أن يجتمعا معاً، ودفع شرّ الشرّين، إذا لم يندفعا جميعاً)، واتە: شەریعەت هاتوە بۆ ئەوەی بەرژەوەندییەکان پەیدا بکا و تەواویان بکا، خراپەکانیش نەهێڵێ و کەمیان بکاتەوە بە پێی توانا، ئنجا پێویستە چاکترینی دوو چاکەکان هەڵبژێررێ، مادام نەگونجێ پێکەوە کۆببنەوە، هەروەها پێویستە خراپترینی دوو خراپەکان دووربخرێتەوە، مادام نەگونجێ هەردووکیان دوور بخرێنەوە.

---

(١) بڕوانە: (مجموع الفتاوى)، ج٢٣، ص٣٤٣.

یانی ئەگەر نەتوانی ناشەرعییەك ڕیشەكێش بكەی، بەڵام بتوانی نیوەی لابەری، مولزەمی بەوەی نیوەكەی لابەری، نەك بڵێی: یان هەمووی لادەبەم، یان هیچ!!

٤) بنچینەیەكی دیكەی شەرعیی بریتیە لە: [تەحەممولكردنی زیانی سووكترو، هێنانەدی بەرژەوەندیی گەورەتر] (إحتمال أخف الضررين، وجلب أعظم المصلحتين) مەبەست ئەوەیە كاتێك دوو زیان ڕووت تێدەكەن، خراپ و خراپتر، خراپەكە تەحەممول بكە، بۆئەوەی خراپترەكەت لەكۆڵ ببێتەوە، یان كاتێك دوو قازانج و بەرژەوەندییت لە پێشن و، هەردووكیانت بۆ بەدەست نایەن، وەك دەڵێن: (دوو كاڵەك بە دەستێك هەڵناگیرێن) دەبێ یەكیان هەڵبژێری، پێویستە ئەوەیان كە قازانجی زیاترە، هەڵیبژێری، ئەوە لە كاتی پێكەوە كۆبوونەوە (تزاحم)ی دوو قازانج، یان دوو زەرەردا، جاری واش هەیە قازانجێك و زەرەرێك پێكەوە كۆدەبنەوە، ئەوكاتە دەبێ تەماشا بكەی: ئایا خراپیی خراپەكە زیاترە؟ یان چاكیی چاكەكە؟ بۆیە لێرەدا ئیجتیهاد دێتە پێشەوە، یەكێك دەڵێ: خراپیی خراپەكە زێترەو یەكێكی دی دەڵێ: نەخێر چاكیی چاكەكە زیاترە، بۆیە لە پێناویدا تەحەممولی خراپەكە دەكەم، ئەوی دی دەڵێ: خراپیی خراپەكە زۆر زیاترە، لە چاكیی چاكەكە، بۆیە خوا دەكا خراپەكەم لەكۆڵ دەبێتەوە، قیرۆسیا لەو چاكەو بەرژەوەندییە.



بۆ ئەم مەبەستەش دەتوانین دوو وێنە لە قورئان و سوننەتدا بێنینەوە:

وێنەی یەكەم: لە قورئاندا خوا باسی مووساو ئەو بەندە ساڵحە دەكا، لە باسی كەشتییەكەدا، كە لەگەڵ مووسادا (عليه السلام)

سوار دەبن، کاتێك ئەو پیاوە صاڵحە کەشتییەکە خراپ دەکا، مووسا دەفەرموێ: ﴿... أَخَرَقۡتَهَا لِتُغۡرِقَ أَهۡلَهَا لَقَدۡ جِئۡتَ شَيۡـًٔا إِمۡرٗا ٧١﴾الكهف.

واتە: بۆچی کەشتییەکەت خراپکرد! تاکو خەڵکەکەی بخنکێنی؟! بەڕاستیی کارێکی خراپت کرد!

ئەو بەندە ساڵحەش پاساوی خراپکردنی کەشتییەکە بەوە دێنێتەوە دەڵێ: ﴿أَمَّا ٱلسَّفِينَةُ فَكَانَتۡ لِمَسَٰكِينَ يَعۡمَلُونَ فِي ٱلۡبَحۡرِ فَأَرَدتُّ أَنۡ أَعِيبَهَا وَكَانَ وَرَآءَهُم مَّلِكٞ يَأۡخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ غَصۡبٗا ٧٩﴾الكهف.

واتە: هەرچی کەشتییەکەیە، هی چەند نەدارێك بوو لە دەریادا کاریان دەکرد، ویستم عەیبداری بکەم، چونکە لە پشتیانەوە پادشایەك هەبوو، هەموو کەشتییەکی (نوێ و چاکی) داگیر دەکرد، واتە: لێرەدا دوو زەرەر هەبوون.



یەکەم: کەشتییەکە دەستکاریی نەکرێ و، زەوت بکرێ.

دووەم: عەیبدار بکرێ، بەڵام داگیرنەکرێ، بۆیە بەندە چاکەکە، زیانێکی کەمی لێدا، بۆئەوەی لە زیانێکی گەورەتری بپارێزێ.

وێنەی یەکەم: بۆ ئەوەش کە دەبێ بەرژەوەندیی گەورەتر دابین بکرێ و، چاوپۆشیی لە بەرژەوەندیی بچووکتر بکرێ، لە فەرمایشتێکدا کە (مسلم) بە ژمارە (١٣٣٣) هێناویەتی، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) قسە لەگەڵ عائیشەی خێزانیدا دەکات و، لە درێژەی فەرمایشتەکەدا دەفەرموێ: ((لولا أن قومك حديث عهد بشرك لَهَدَمْتُ الكعبة فَأَلْزَقْتُها بالأرض))، واتە: ئەگەر لەبەرئەوە نەبووایە کە گەلەکەت

(قورەیش) تازە لە شیرکەوە دەرباز بوون، کەعبەم دەڕووخاندو دەرگاکەیم بە زەوییەو دەنووساند، واتە: لێرەدا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) چاوپۆشیی دەکا لە ڕاستکردنەوەی کەعبە، بە پێی نەخشەی ئیبراهیم، لە پێناوی ئەوەدا کە دڵی خەڵك نەڕەنجێ، چونکە لە کوفرو شیرکەوە نزیك بوون، نەوەك گرفتێکیان بۆ دروست ببێ.

٥) بنچینەیەکی دیکە ئەوەیە کە: [ناچاریی حەرامەکان ڕەوا دەکا] (الضرورات تبیح المحظورات)، واتە: شتێك کە حەرامە، بەهۆی ناچارییەوە، بۆت ڕەوا دەبێ، ئەمیش ئەم ئایەتەی سووڕەتی (البقرة) بۆی دەبێتە بەڵگە:

﴿ إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ ٱلْمَيْتَةَ وَٱلدَّمَ وَلَحْمَ ٱلْخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ بِهِۦ لِغَيْرِ ٱللَّهِ ۖ فَمَنِ ٱضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَلَآ إِثْمَ عَلَيْهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٧٣﴾ ﴾ البقرة.

واتە: بێگومان تەنیا! مردارەوەبوو و خوێن و گۆشتی بەرازو سەربڕاو بۆ غەیری خوا (واتە: ناوی غەیری خوای لەسەر هاتبێ)، لێتان قەدەغە کراون، بەڵام ئەگەر کەسێك ناچاربوو، بەمەرجێك لە ئەندازەی پێویست تێنەپەڕێنێ و، بۆ بە ئارەزوو خواردن نەبێ، ئەوە بە گوناه لەسەری نانووسرێ، بێگومان خوا لێبووردەی بەبەزەییە.

کەواتە: کاتێك مرۆڤ ناچار دەبێ: شتی قەدەغەی بۆ ڕەوا دەبێ، بە ئەندازەی ئەوەی لەو ناچارییە خۆی قوتار دەکا.

لێرەدا مەبەست ئەوەیە: کەسێك کە بەشداریی دەکا لە حکوومەتێکدا کە ناچارەو، هەندێك بەرژەوەندیی، وا نەبێ، بۆی نایەنە دی و،

هەندێك زیان، وا نەبێ، لێی دوور ناکەونەوە، ئەوە بۆی هەیە بە مەبەستی دەستخستنی قازانجەکان و، دوورخستنەوەی زیانەکان، بەشداریی بکات لەو حکوومەتەدا، ئەگەر بزانێ ئەوەی بۆ دەکرێ، ئەگەرنا دروست نیە.

٦) بنچینەیەکی دیکە دەڵێ: [ئەوەی کە بە ئاسانیی بۆت دەکرێ، بەهۆی ئەوەوە کە بە زەحمەت نەبێ بۆت ناکرێ، یان هەر بۆت ناکرێ، لەسەرت لاناچێ] (لايَسْقُطُ الميسور بالمعسور)، واتە: ئەگەر ئێمە بتوانین قەوارەیەکی سیاسیی ئیسلامیی، دروست بکەین، ئەوە لەسەرمان پێویستە، بەڵام ئەگەر ئەوەمان پێنەکراو، تەنیا توانیمان زۆر ناشەرعیی و خراپەو ستەم، لەو قەوارە سیاسییەدا لابەرین و، چاکەی لە شوێندا دابنێین، نابێ بڵێین: مادام دەوڵەتمان پێ دانامەزرێ، واز لەو بەرژەوەندییانەش دێنین، کە پێمان دێنەدی!



## جۆری دووەم

## بەشداریی کردنی (یوسف) - علیه السلام-

## لە حکوومەتی میسردا

جۆری دووەم لە بەڵگەکانی بەشدارییکردن لە حکوومەتێکی پابەند نەبوو بە شەریعەتدا، بریتیە لە: بەشدارییکردنی (یوسف) پێغەمبەر (علیه السلام) لە حکوومەتی میسردا، لەسەردەمی ئەو پادشایەدا، کە پادشایەکی کافر بووە، هەروەها کۆمەڵگایەکەش کۆمەڵگایەکی کافر بووە، وەك لە بەسەرهاتی (یوسف)دا بە ڕوونیی هاتوە.

(یوسف) (علیه السلام) دوای ئەوەی پادشا بانگی دەکا، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ وَقَالَ ٱلْمَلِكُ ٱئْتُونِى بِهِۦٓ أَسْتَخْلِصْهُ لِنَفْسِى ۖ فَلَمَّا كَلَّمَهُۥ قَالَ إِنَّكَ ٱلْيَوْمَ لَدَيْنَا مَكِينٌ أَمِينٌ ﴿٥٤﴾ ﴾یوسف.

واتە: پادشا گوتی: بۆم بێنن، بۆخۆم هەڵیدەبژێرم، (دەیکەم بە ڕاوێژکاری خۆم و پشتی پێدەبەستم بۆ حوکمڕانیی)، ئنجا کاتێك دواندی، پێی گوت: تۆ ئەمڕۆ لە لای ئێمە بەرێزو متمانەپێکراوی.

(یوسف)یش (علیه السلام) ئاوا وەڵام دەداتەوە: ﴿ قَالَ ٱجْعَلْنِى عَلَىٰ خَزَآئِنِ ٱلْأَرْضِ ۖ إِنِّى حَفِيظٌ عَلِيمٌ ﴿٥٥﴾ ﴾یوسف.

واتە: گوتی: من لەسەر خەزێنەکانی وڵات دابنێ، چونکە من پارێزەری زانام، واتە دەتوانم ئەو کارە بکەم، چونکە هەم توانام هەیەو، هەم زاناشم.

لێرەدا (یوسف) -علیه السلام- داوای کارێك دەکات، لە پادشایەکی کافرو لەنێو کۆمەڵگایەکی کافردا، بەڵام خوا -سبحانه وتعالی- دەفەرموێ:

﴿وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي ٱلۡأَرۡضِ يَتَبَوَّأُ مِنۡهَا حَيۡثُ يَشَآءُۚ نُصِيبُ بِرَحۡمَتِنَا مَن نَّشَآءُۖ وَلَا نُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ٥٦ وَلَأَجۡرُ ٱلۡأٓخِرَةِ خَيۡرٞ لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ ٥٧﴾يوسف.

واتە: هەروەها بەوشێوەیە یوسفمان لەسەر زەویدا باڵادەست کردو توانامان پێدا، کە لە هەرجێیەکی بوێ، نیشتەجێ ببێ، بەو شێوەیە ڕەحمەت و سۆزی خۆمان دەدەین بە هەرکەسێك بمانەوێ، بێگومان خوا پاداشتی چاکەکاران زایە ناکات و، بە دڵنیاییەوە پاداشتی دوارِۆژیش باشترە، بۆ کەسانێ برِوایان هەیەو، پارێز لە خوا دەکەن.

خوا (عزوجل) وەك نیعمەتێك ئەم کار پێ سپاردنەی (یوسف) باس دەکا، کە لە جێی وەزیری ئابووریی ئێستایە.

(یوسف)یش لە کۆتایی بەسەرهاتەکەی خۆیدا دەفەرموێ: ﴿رَبِّ قَدۡ ءَاتَيۡتَنِي مِنَ ٱلۡمُلۡكِ وَعَلَّمۡتَنِي مِن تَأۡوِيلِ ٱلۡأَحَادِيثِۚ فَاطِرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ أَنتَ وَلِيِّۦ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۖ تَوَفَّنِي مُسۡلِمٗا وَأَلۡحِقۡنِي بِٱلصَّٰلِحِينَ ١٠١﴾يوسف.

یوسف لە مەقامی باسکردنی نیعمەتدا دەڵێ: پەروەردگارم! تۆ دەسەڵاتت بەمن داوەو، فێری لێکدانەوەی خەونانت کردم، ئەی بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی! هەرتۆ دۆست و پشتیوانمی لە دنیاو دوارِۆژدا، دەجا بە مسوڵمانیی بمرێنەو بەچاکانم بگەیەنە.

وەك دەبینین، (یوسف) -علیه السلام- ئەو ئەندازە حوكم و دەستەڵاتە كە لەژێر سایەی پادشایەكی كافرو سیستمێكی كوفردا، وەچنگی كەوتوە، بە چاكەو نیعمەتێكی گەورەی خوای دادەنێ! كەواتە: وەك چۆن بۆ پێغەمبەرێكی پایەبەرز، دروست (جائز) بووە، كە لەژێر دەسەڵاتی پادشایەكی كافرو، لەنێو كۆمەڵگایەكی كافرو، لە دام ودەزگایەكدا كە حوكم بە شەریعەت ناكا، كارێك وەئەستۆ بگرێ، بەمەبەستی هێنانەدی چەند بەرژەوەندییەك، كە هەندێكیان پەیوەندییان بە خەڵكی میسر بەگشتییەوە هەبووە، هەرچەندە تاكە مسوڵمانێكیشیان تێدا نەبووە، بەشێكیشیان پەیوەندییان بەخۆی و بنەماڵەكەیەوە هەبووە، كە بریتیی بووە لە نیشتەجێبوونیان لە میسردا، بەهەمان شێوە: بۆ غەیری ویش ئەو مەسەلەیە ڕەواو دروستە.



وەك (القرطبِي) لە تەفسیرەكەی خۆی: (الجامع لأحكام القرآن) دا، دەڵێ: (قال بعض أهل العلم في هذه الآية ما يُبيح للرجل الفاضل، أن يعمل لرجلٍ فاجرٍ وسلطانٍ كافرٍ، بشرط أن يعلم أنه يُفَوِّض إليه في فعلٍ لا يعارضه فيه، فَيُصْلِحُ منه ماشاء).[(١)]

واتە: هەندێك لە زانایان گوتوویانە: لەم ئایەتەدا بەڵگەی ڕەوایەتیی هەیە بۆ پیاوی باش، كە كار بكات لەلای پیاوێكی گوناهبار، یاخود دەسەڵاتدارێكی كافر، بە مەرجێ بزانێ كە: كارێكی پێ دەسپێرێ، دوایی ڕەخنەی لێ ناگرێ و، دەتوانێ چاكسازیی تێدا بكات.

---

(١) ج٩ ص٢١٥.

هەروەها (الآلوسي) لە تەفسیرەکەی خۆی: (روح المعاني)[1] و، (النسفي)[2] لە تەفسیرەکەی خۆیداو، (سعید حوّى)[3] لە: (الأساس في التفسیر)دا، هێناویانەو، سەیدقوتب و زانایانی دیکەش ئاماژەیان پێداوە، کە ئەمە [واتە: بەسەرهاتی (یوسف) -علیه السلام-] بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە مرۆڤی مسوڵمان، بە مەرجێ بزانێ دەتوانێ هەندێك چاکە بکات و، هەندێك خراپەش لابەرێ، بۆی هەیەو، بەڵکو جاری وایە لەسەری پێویستیشە، کە بەشداریی بکا لە حکوومەت و قەوارەیەکی نا ئیسلامییدا.

## دوو ڕەخنە لەم بەڵگەیەو وەڵامدانەوەیان:

195 **ڕەخنەی یەکەم:** دەڵێن: (یوسف) بە شەرعێك حوکمی کردوە، کە غەیری شەرعی ئێمەیەو، بچینەیەکی شەرعییش هەیە دەڵێ: (شَرْعُ مَنْ قَبْلَنا لیس شرعاً لنا)، واتە: بەرنامەی ئەوانەی پێش ئێمە، بەرنامەی ئێمە نیە!

وەڵامەکەی:

١- زانایان لەسەر ئەم بنچینەیە مشتومڕی زۆریان هەیەو، زۆرێکیان دەڵێن: (شرع من قبلنا شرعٌ لنا)، واتە: شەریعەتی ئەوانەی پێش ئێمە، هی ئێمەشە، مەگەر بەڵگەیەك هەبێ لەسەری کە پێچەوانەی ئایەت، یان فەرموودەیەك بێ، ئنجا بۆیەش خوا بەسەرهاتی پێغەمبەرانمان بۆ

---

(١) ج١٣ ص٥.

(٢) ج٢ ص١٩٤.

(٣) ج٥ ص ٢٦٧١.

دەگێڕێتەوە، کە سوود لە بەرنامەو هەڵوێستەکانیان وەربگرین،منیش ئەم ڕایە بەڕاست دەزانم.

٢- ئنجا ئەگەر گریمان واشبێ، دەڵێین: مەسەلەی حاکمبوونی خوای پەروەردگارو، ئەوە کە خوا حەڵاڵ و حەرام دادەنێ، بەشێکە لەئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی و، شتێك نیە لە لق و پۆپەکان (فروع) بێ، تاکو جیاوازیی تێدا هەبێ، پێغەمبەرانیش (علیهم الصلاة والسلام) لە ئیمان و عەقیدەدا یەکسان بوون و، هەر لە سووڕەتی (یوسف)دا، (یوسف) دەفەرموێ:

﴿... إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ ۚ أَمَرَ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّآ إِيَّاهُ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٤٠﴾﴾ يوسف.

واتە: حوکم (بەرنامە دانان) بەس هی خوایە، فەرمانی کردوە کە جگە لەوی نەپەرستن، ئائەوەیە بەرنامەی ڕاست، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن.

کەواتە: (یوسف) لەگەڵ ئەوەشدا کە زانیویەتی حوکم تەنها هی خوایە، بەشداریی کردوە لە حوکمێکی کوفردا، لەبەر ئەوەی هەندێك بەرژەوەندیی پەکیان لەسەر ئەوە کەوتوە!

ڕەخنەی دووەم: هەندێکی دیکە بە جۆرێکی دیکە، ڕەخنەیان لەم بەڵگەیە گرتوەو، گوتوویانە: (یوسف) بووەتە پادشای میسر، نەك لەژێر هەیمەنەی پادشایەکی کافردا بووبێ! وەڵامەکەی ئەوەیە کە ئەم قسەیە ڕاست نیە، بەم بەڵگانە:

١- (یوسف) گوتوویەتی: ﴿...ٱجۡعَلۡنِي عَلَىٰ خَزَآئِنِ ٱلۡأَرۡضِ... ﴿٥٥﴾﴾ یوسف.

واتە: لەسەر گەنجینەکانی زەوییم دابنێ! یانی: بمکە بە وەزیری دارایی، یان ئابووریی، کەواتە: پادشا ئەوی لەسەر ئەوکارە داناوەو، ئەو بەردەست بووە!

٢- پادشایەکە دەڵێ: ﴿... أَسۡتَخۡلِصۡهُ لِنَفۡسِيۖ... ﴿٥٤﴾﴾ یوسف.

واتە: بۆ خۆمی دادەنێم، واتە سوود لە حیکمەت و لێزانینەکەی وەردەگرم.

٣- ئەو شەریعەتەی حوکمی پێکراوە، غەیری شەریعەتی (یوسف) بووە، بە بەڵگەی ئەوە: کاتێك(یوسف) برایەکەی خۆی (بنیامین) گل دەداتەوە بە تۆمەتی ئەوەی کە دزیی کردوە، ئەو دەفرەی لە بارەکەی خۆیدا شاردۆتەوە، کە هی پادشا بووە، کە بێگومان ئەوەش فێڵێك بوو (یوسف) -علیه السلام- کردوویەتی بۆ ئەوەی برایەکەی لەلای خۆی گلبداتەوە، خوا دەفەرموێ:

﴿... مَا كَانَ لِيَأۡخُذَ أَخَاهُ فِي دِينِ ٱلۡمَلِكِ... ﴿٧٦﴾﴾ یوسف.

واتە: (یوسف) بۆی نەبووە بە پێی دینی پادشا، برایەکەی گل بداتەوە، بۆیە بۆ چۆنیەتی سزادانی لەکاتی ساغبوونەوەی تۆمەتەکەدا، کە ئاڕاستەی برایەکەی (بنیامین) کرابوو، ئەوانی سەرپشك کرد:

﴿قَالُواْ فَمَا جَزَٰٓؤُهُۥٓ... ﴿٧٤﴾﴾ یوسف.

واتە: گوتیان: سزای چییە ئەگەر لە بارەکەی ئەودا بوو؟

﴿قَالُواْ جَزَٰٓؤُهُۥ مَن وُجِدَ فِي رَحۡلِهِۦ فَهُوَ جَزَٰٓؤُهُۥۚ كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلظَّٰلِمِينَ ٧٥﴾ يوسف.

واتە: گوتیان: سزایەكەی ئەوەیە، هەركەسێك ئەوشتە لە بارەكەیدا دۆزرایەوە، دەبێ خۆی ببێتە بارمتەی، كەواتە: ئایینی پادشا جیاواز بووە لەهی یەعقووب و كوڕەكانی، كە دیارە (یوسف)یش كاری پێكردوە، (واتە: بەئایین و بەرنامەی مەلیك).

## جۆری سێیەم

## هەڵوێستی نەجاشیی، پادشای حەبەشە

لەو بەڵگانەی ئیسپاتی ڕەوایی بەشدارییکردن لەوجۆرە حکوومەتەدا دەکەن، هەڵوێستی نەجاشیی (أصحمة) پادشای حەبەشە بووە، کە لە قۆناغی مەککەدا، ژمارەیەك لە هاوەڵانی بەڕێز بە فەرمانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کۆچیان بۆ لای کردووە، پێغەمبەر لەبارەیەوە فەرموویەتی: لە حەبەشە پادشایەکی لێیە کەس لەلای ئەو ستەمی لێ ناکرێ، بچن بۆلای،[1] ئنجا ئەو نەجاشییە[2] ئیمان بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دێنێ و مسوڵمان دەبێ، بەڵام کار بە شەریعەتی پێغەمبەر ناکات و، لەگەڵ ئەوەشدا: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هەر بە مسوڵمان و بە برای ئیمانیی دایدەنێ، هۆکارەکەشی ئەوەبووە کە نەجاشیی بۆی نەکراوە حوکم بە شەریعەت بکات، کۆمەڵگایەکەی خۆی پێوە پابەند بکا، بەڵگەش لەسەر مسوڵمانبوونی نەجاشیی کە ناوی (ئەصحەمە) بووە، ئەوەیە کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە فەرمایشتێکدا کە (بخاري) بە ژمارە (٣٨٧٧) ڕیوایەتی کردوە، دەڵێ: ((مات اليوم رجل صالح، فقوموا فصلُّوا على أخيكم أصحمة))، واتە: ئەمڕۆ پیاوێکی چاك وەفاتی کردوە، دەجا هەستن نوێژ لەسەر (ئەصحەمە)ی براتان بکەن،

199

---

(1)) بڕوانە: (السيرة النبوية لابن هشام) ج١، ص٣٢١.

(2)) نَجاشي، نِجاشي، نِجّاشي، کە بەمانای (مَلِك) دێ، نازناوی پادشایەکانی حەبەشە بووە، بڕوانە: (المنجد في اللغة والأعلام)، ص٧٩١، ط٢١.

(ئیبنو تەیمییە) ڕەحمەتی خوای لێبێ، دەڵێ: (ونحن نعلم قطعاً أَنه لم يمكنه ان يحكم بينهم بحكم بالقرآن، فإِنَّ قومه لايُقِرُّونه على ذلك، والنجاشي وأمثاله مع ذلك سُعداء في الجنة، وإن كانوا لم يلتزموا من شرائع الإسلام، ما لا يقدرون على التزامه، بل كانوا يحكمون بالأحكام التي يمكنهم الحكم بها)[1]، واتە: بە دڵنیاییەوە ئێمە دەزانین، کە (نەجاشیی) بە حوکمی قورئان حوکمی نەکردوە لەسەر گەلەکەی خۆی، چونکە گەلەکەی ئامادەنەبوون دانی بۆ پێدا بێنن، بەڵام نەجاشیی و هاوڕێنەکانی، بەختەوەرن و لە بەهەشتدان، هەرچەندە ئەو یاسایانەی ئیسلام کە نەیانتوانیوە، پێیانەوە، پابەند نەبوون، بەڵکو بەس ئەوەی کە لە توانایاندا بووبێ، پێیەوە پابەند بوون.

کەواتە: ئەوکەسەی کە دەچێتە نێو حکوومەتێکەوەو، ناتوانێ هەموو یاساکانی بگۆڕێ و، هەموو بڕیارەکان وا لێبکات و، کە بە پێی شەریعەت بن، گوناهبار نابێ و، گرنگ ئەوەیە توانای خۆی وەگەڕ بخات، چونکە ئەوکاتە نەجاشیی پادشای وڵاتەکەش بووە، کەچی نەیتوانیوە، ئنجا کەسێك کە وەزیرە، لەوەش کەمتر تەکلیفی لەسەرە.

(العز بن عبدالسلام) لە کتێبی: (قواعد الأحكام في مصالح الأنام)[2]دا گوتوویەتی: (ولو استولى الكُفّار على إقليم عظيمٍ فَوَلَّواْ القضاءَ لمن يُقَدِّم مصالح المسلمين العامة، فالذي يظهر: إنفاذ ذلك كله جَلْباً للمصالح العامة ودفعاً للمفاسد الشاملة، إِذْ يبعد من رحمة الشرع

---

(١)مجموع الفتاوى، ج١٩ ص ٢١٨ ،٢١٩.

(٢) ج١ ص٧٤،٧٤.

ورعايتهِ لمصالح العباد، تعطيل المصالح العامة وتحمّل المفاسد الشاملة، لفوات الكمال فيمن يتعاطى توليتها، لمن هو أهل لها).

واتە: ئەگەر کافرەکان دەسەڵاتیان ڕانواند بەسەر وڵاتێکی گەورەی مسوڵمانان‌دا، لەکاتێکی وادا، ئەگەر داوا لە کەسێك بکەن بیکەن بە قازیی، یان هەر کارێکی دیکەی پێ بسپێرن، مادام بزانێ: دەتوانێ هەندێك بەرژەوەندیی بۆ خەڵك بهێنێتە دی و، هەندێك خراپەیان لێ دوور بخاتەوە، ئەوە بۆی هەیە، چونکە ئەوە زۆر لە ڕەحمەتی شەریعەتەوە دوورە کە بڵێ: لەبەر ئەوەی کەسێك کەشایستەیی بەرپرسیارێتیی هەیە، چونکە ناتوانێ هەموو بەرژەوەندییەکان بهێنێتەدی و، ناتوانێ هەموو زیانەکان دوور بخاتەوە، دروست نیە ئەوکارە بەئەستۆوە بگرێ.

ئێستاش بێینەسەر قسەی کۆتایی لەم مەسەلەیەدا:

زانایان وێڕای ئەو شتانەی باسمانکردن، چەند شتێکیشیان بە مەرج گرتوون، بۆ بەشداریی کردن لە حکوومەتێکی پابەندنەبوودا بەشەریعەتەوە.

## مەرجەکانی بەشداریی کردن
## لە حکوومەتێکی پابەندنەبوودا بە شەریعەتەوە

**مەرجی یەکەم:** دەبێ ئەو بەشدارییکردنە، بەرژەوەندیی تێدا هەبێ. یان بابای بەشدار، یەقینی هەبێ کە بەرژەوەندیی تێدایە، یان گومانی زاڵی وابێ کە بەرژەوەندیی تێدایە، بەڵام ئەگەر گومانی وابوو، کە هیچ بەرژەوەندییەکی تێدا نیە، ئەوە دروست نیە، چونکە ئەو بۆیە دەچێ کە بەرژەوەندیی (مصلحة) بەدەست بێنێ، بەرژەوەندییش دووشتە:

١- بەدەستخستنی سوودەکان (جلب المنافع).

٢- لابردنی زیانەکان (دفع المضار).

**مەرجی دووەم:** ئەوەیە کە نابێ ئەو ڕژێمە ڕژێمێکی دیکتاتۆریی قێزەونی وابێ، کە ئەو خەڵکە مسوڵمانەی تێیدا بەشدار دەبێ، پێی ناشیرین ببێ، وەك ڕژێمی سەددام و هەر ڕژێمێکی دیکەی لەو جۆرە.

**مەرجی سێیەم:** نابێ ناچار بکرێ، تەنازول لە پڕەنسیپ و مەبدەئەکانی ئیسلام بکات.

**مەرجی چوارەم:** دەبێ بابای وەزیر یاخود بەڕێوەبەری گشتیی، یاخود هەر پلەیەك کە بەشدار دەبێ، بواری ڕەخنەگرتنی هەبێ لەو شتانەی کە ناشەرعیین و بواری هەڵوەستەکردنی هەبێ، هەروەها دەستی کراوەبێ بۆ ئەو شتانەی کەبە شەرعیی و چاکیان دەزانێ و، بتوانێ بە پێی دەسەڵاتی خۆی، شتەکە بەرەو ئاڕاستەی شەریعەت بەرێ، بەڵام ئەگەر هیچی لەدەست نەیەت و، نەیتوانی ڕەخنەیەك

لە ناشەرعییەك بگرێ و، چاكەیەك ئەنجام بدا، كەواتە چوونەكەی بە بەلاشە.

**مەرجی پێنجەم:** دەبێ ئەو كەسەی بەشداریی دەكا، لە زاتی خۆیدا كەسێكی قایم و دامەزراو بێ و، بەڕاستیی مرۆڤی شل و پل و لاواز، كە بە ئاسانیی بخلیسكێ و، بكەوێتە ژێر زەخت و فشارو، تەنازول لە نەگۆڕەكانی شەریعەت و هەڵوێستەكانی خۆی بكات و، ببێتە پەڵەیەكی ڕەش بە نێوچاوانی مسوڵمانانەوە، ئەوە بۆی نیە بەشداریی بكاو نابێ كەسی وا بنێررێتە ئەوێ.

**مەرجی شەشەم:** دەبێ هەركاتێك دوای ئەوەش كە بەشداریی كرد، بۆی دەركەوت زیانی لە قازانجی زیاترە، واتە: لەسەرەتاوە بە ئومێدی قازانج چووە، بەڵام دوایی دەزانێ لەسەری قەرزدار دەبێتەوە، ئەوە دەبێ بكشێتەوە.


٢٠٣


ئنجا لێرەدا پێویستە ئاماژە بە مەسەلەیەك بكەین، مەسەلەی بەشداریی لە پەرلەماندا، لەگەڵ مەسەلەی بەشداریی لە حكوومەت و وەزارەتەكاندا، جیایە، جیاوازییەكەش ئەوەیە كە هەمیشە بەرژەوەندیی بەشداریی لە پەرلەماندا، دیارە: ئەو كەسە نوێنەری خەڵكە، خەڵك هەڵیدەبژێرێ و، بە ناوی خەڵكەوە قسەدەكا و، هەر نەبێ بانگەوازكردن بۆ ئیسلام و، فەرمانكردن بە چاكەو، ڕێگرتن لە خراپەو، دەرخستنی دەنگ و ڕای ئیسلام، هەمیشە مسۆگەرە. بەڵام بەشدارییكردن لە حكوومەتدا، وانیە، بۆیەش زانایان زۆر تێیدا كەوتوونەتە كێشەوە، لەكاتێكدا كە بۆ بەشداریی كردن لە ئەنجوومەنی ڕاوێژ (پەرلەمان) دا، زۆربەی زانایانی هاوچەرخ، ڕایان ئەرێنیی بووە، بەڵكو زۆرجار

بە پێویستیشیان زانیوە، كەچی بۆ حكوومەت ڕایان نەبووە، چونكە گوتوویانە: بۆ هەر شوێنە حوكمی تایبەتی خۆی هەیە: لە وڵاتێكدا وەزیر دەستی كراوەیەو، دەتوانێ ڕۆڵی خۆی ببینێ و، لە وڵاتێكی دیكەدا هەر دیكۆرە.

+ مامۆستا! تۆ باست لە پلەبەندیی كرد لە ئایینی ئیسلامدا، بەڵام هەندێك پێیان وایە: پاش هاتنەخوارەوەی ئایەتی:

﴿ ...ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗاۚ ...﴿٣﴾ ﴾المائدة. ئیدی پلەبەندیی نامێنێ!

- هەركەس وا دەڵێ: لە دین تێنەگەیشتوە، چونكە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) سەرمەشقی ئێمەیە، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿ لَّقَدۡ كَانَ لَكُمۡ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسۡوَةٌ حَسَنَةٞ ... ﴿٢١﴾ ﴾الأحزاب.

ئنجا ئایا ئەو پێغەمبەرە مەزنە، ئەم ئایینە كامڵەی پلەپلە نەهێناوە؟ بێگومان با، ئێمەش بە هەمانشێوە دەبێ چاو لە پێغەمبەری خۆمان بكەین، بەڵێ ئایینەكەمان كامڵە، بەڵام خۆمان كامڵ نین و، هەل ومەرجەكان گونجاوو یارمەتییدەر نین!

پێشتریش باسمان كرد: كە پلەپلەیی (تدرّج) یاسایەكی گشتی خوایە لە دروستكراوەكانی و، لەئایین و بەرنامەكەی و یاساكانیشیدا، ئنجا با نموونەیەكی سادەش بۆ زیاتر ڕوونكردنەوەی مەبەست بێنینەوە:

كەسێك كە بینایەك دروست دەكا، ئایا هەر یەكسەر بەتەواویی دروستی دەكات! یان لە بناغەوەو قۆناغ قۆناغ دروستی دەكات؟ بۆیە

ئەم پلەبەندییە پێویستەو، هەر دەبێ هەبێ و هەرکەس بڵێ: پێویست ناکات، هیچ لە کاری ئیسلامیی حاڵی نیەو، لە خەیاڵدا دەژی.

+ مامۆستا! تۆ زۆر باست لە بەرژەوەندیی (مصلحة)کرد، ئنجا ئایا ئەم بەرژەوەندییە، چۆن دیاریی دەکرێ؟

- زانایان ئاوا پێناسەی بەرژەوەندییان کردوە: پارزێگارییکردنی ئامانجی شەرعدانەر لە نێو شەرعەکەیدا (حفظ مقصود الشارع في شرعه)، ئامانجی شەرعدانەریش {خوا (سبحانه وتعالى)} بریتیە لە: پاراستنی ئەم حەوت شتەی خەڵك:

١- دین،

٢- ژین،

٣- عەقڵ،

٤- نەسل و وەچە،

٥- ماڵ،

٦- کەرامەت،

٧- هێمنیی و ئاسایش





کەواتە: بەرژەوەندیی (مصلحة) بریتیە لە پاراستنی هەرکام لەم حەوت (٧) شتە، ئەگەر هەبن و، ئەگەر نەبن پەیداکردنیان، بۆ وێنە: هێمنیی و ئاسایشی خەڵك، ئەگەر هەیە بپارێزرێ و، ئەگەر نیە پەیدا بکرێ، یان ماڵ و سامان، کەسێك نیەتی، بۆی دابین بکرێ و، ئەگەر هەشیەتی، بۆی بپارێزرێ.

+ ئایا کامیان لە پێشتربێ، دەگۆڕێ؟

- لەوەدا زانایان ڕاجیاییان هەیە، هەندێك دەڵێن: بەرژەوەندیی دین لە پێشەوەیە، هەندێك دەڵێن: ژین لە پێش هەموویانەوەیە، یانی: لە چۆنییەتیی ڕیزبەندییەکەیاندا، جیاوازیی لە نێوان زانایاندا هەیە، ئەوەی دەڵێ: ژین لە پێشەوەیە دەڵێ: ئەگەر ژین نەبوو دینیش نابێ، بەڵام دەگونجێ ژین هەبێ و، دین نەبێ، بەبۆچوونی بەندەش ڕیزبەندییەکە ئاوایە: ژین لە پێشەوەیە، ئنجا دین، پاشان نەسل و وەچە، دوایی هێمنیی و ئاسایش و، ئنجا کەرامەت و، دوایی عەقڵ و، پاشان ماڵ و سامان.

شایانی باسیشە بۆ هەرکام لەم حەوتە - کە دەگونجێ زیاتریش بن - بەڵگەی قورئان و سوننەت هەیە کە من لە بەرهەمەکانمدا ئاماژەم پێیان داوە، بۆ وێنە: نامیلکەی: (سیاسەتی ئیسلامیی و چەند ڕوونکردنەوەیەك)[1].



+ مامۆستا! زۆربەی جار جەنابت ئاماژەت بە پاشگری ئیسلامیی بە حکوومەتەوە، دەدا، ئەگەر چی ئەوە باسێکی فراوانەو زۆر هەڵدەگرێ، من ئەگەر وەڵامم لە بەرێزت بوێ: ئایا مەرجە حکوومەتەکەمان پاشگری ئیسلامیی لەگەڵ بێ؟!

- نەخێر مەرج نیە، وشەی [ئیسلامیی] پێوە بێ، گرنگ ئەوەیە نێوەڕۆکەکەی ئیسلامیی بێ و، بنەماکانی ئیسلام بەرجەستە بکا، واتە: لەسەر بناغەی عەقیدەی ئیسلامیی بنیات نرابێ و، لە ڕووی

---

(١) هەروەها لە بەرگی دووەم و چوارەمی مەوسووعەی: [ ئیسلام و دەوڵەتداریی] داو، لەکتێبی: [چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم] چاپی شەشەم/٢٠١٨ ز دا.

سیاسیی و، ئابووریی و، کۆمەڵایەتیی و هتدەوە، شەریعەت پیادە بکا و، لە چوارچێوەی شەریعەت دەرنەچێ، با ناویشی ئیسلامیی نەبێ، چونکە لە سیرەدا لەبارەی دەوڵەتەکەی پێغەمبەرەوە، نەنووسراوە: (الحكومة النبوية)، یان (الحكومة الإسلامية)، حکوومەتی ئیسلامیی حکوومەتێکی مەدەنییەو، بەو واتایەی ئێستا لە ڕۆژئاوا باوەو، باسی دەکەن: (ثیۆکراسیی) حکوومەتی ئایینی، کە قەشەو پاپا خۆیان بە وەکیلی خوا زانیوە، لە ئیسلامدا شتی وا نیەو نەبووە، بەڵکو ئەو کەسەی دەبێتە حوکمڕان، وەکیلی خەڵکە، خەڵك دایدەنێ و، هەر خەڵکیش چاودێریی دەکات و، لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکات و، دەشتوانێ لای بەرێ، کەواتە: لە ئیسلامدا حکوومەت مەدەنییە، بەو واتایە: کە خەڵك دایدەنێ و لایدەبات، بەڵام بەو ئیعتیبارەی کە بناغەکەی لەسەر وەحیی و شەریعەتی خوایی دانراوە، دەتوانرێ بوترێ: حکوومەتێکی ئایینییە، هەڵبەتە نەك بە تێگەیشتنە ڕۆژئاواییەکەی، بەڵکو بەو تێگەیشتنەی کە حکوومەتێکی بێ دین نیە، دینی هەیەو چوارچێوەکەی شەریعەتە، بەو ئیعتیبارەش کە خەڵك کاربەدەستەکانی هەڵدەبژێرێ و لایان دەبات، بە دڵنیاییەوە حکوومەتێکی مەدەنییە.

ئەگەر بشمانەوێ وردتربین دەبێ بڵێین: حکوومەتی ئیسلامیی، یان قەوارەیەکی سیاسیی کە ئیسلام بنیاتی دەنێ، حکوومەتێکی تایبەتەو، هیچ کام لەو پێناسانەی باون، پڕ بەپێستی نین و ناتوانن بە وردیی تەعبیری لێ بکەن.

+ ئەم بیروڕا جیاوازانەی کە لە نێو ئاییندا هەن، ئەگەر کەسێك توانای دیراسەو هەڵسەنگاندنی نەبێ، چۆن بتوانێ باشترینیان جیا بکاتەوە؟!

- لەو مەسەلانەدا کە جێگای مشتومڕن، ناتوانی بڵێی: لایەکیان جێگای یەقینەو، لایەکیشیان پێچەوانەی یەقینە، تەنیا ئەوەیە کە ئێمە دەڵێین: ڕای خۆمانمان پێ ڕاستەو، دەشگونجێ هەڵەبێ و، ڕای بەرانبەرمان پێ هەڵەیەو، دەشگونجێ ڕاست بێ، لەو شتانەدا کە بواری قسە لێکردن و ئیجتیهاد هەیە، بەڵام سەبارەت بەوبابەتەی کە ئێمە خەریکی توێژینەوەینی، دەڵێم: بە خوێندنەوەی واقیع، کەسێك بەم واقیعەی ئێستای خۆمان ئاشنابێ و لە شەریعەت شارەزابێ، دڵنیا دەبێ کە ئەم ڕایە نیشانە دەپێکێ و بەرژەوەندیی وەدەست دێنێ و، پێچەوانەی ئەوە هەڵەیە، چونکە واقیعی کوردستان و عێراق جیایە لە واقیعی شوێنەکانی دیکەو، ئەم واقیعەی ئێمە، تازە خەریکە شکڵ دەگرێ، بۆیە دەبێ هەوڵبدەین کاریگەرییمان لەسەری هەبێ، چ پەرلەمانەکەی، چ حکوومەتەکەی و دام ودەزگایەکانی، بەڵێ هەرکەسێك لەم واقیعی ئێستای عێراق و کوردستاندا ڕۆچووبێ و چاوکراوە بێ، دەزانێ ئەم ڕایە پەسەندەو، پێچەوانەی ئەم ڕایە هەڵەیە، چونکە بەدیلی ئەو ڕایە چییە؟

وەك پێشتریش چەند جارێك گوتمان:

١- یان سەری خۆکزکردن و خۆدزینەوەیە لە واقیع،یان تەسلیم بوونیەتی و،بێ هەڵوێستییەتی بەرانبەری، وەك هەندێك بە ناوی تەسەووف و سەلەفییەت و، هەر ناوێکی دیکەوە دەیکەن، کەسێك کە خۆی لە واقیعی کۆمەڵگا دەدزێتەوەو خۆی گۆشەگیر دەکا، بەڵام هەرگیز پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) خۆیان لە واقیعی کۆمەڵگاکانیان نەدزیوەتەوەو گۆشەگیر نەبوون.

٢- یان بەگژ واقیعدا چوونەوەیە، بەزەبری هێزو چەك، كە پاش چەندان ئەزموونی تاڵ، دەركەوت و سەلمێنرا، كە ئەو جۆرە بیركردنەوەیە هەڵەیەو، پێچەوانەی شێوازو ڕێبازی پێغەمبەرانیشە (علیهم الصلاة والسلام) كە فەرموویانە:

﴿... وَلَنَصۡبِرَنَّ عَلَىٰ مَآ ءَاذَيۡتُمُونَاۚ ... ١٢﴾ إبراهيم.

٣- یان ڕاكردن و هەڵاتنە، كە هیچ پێغەمبەرێكیش ئەوەی نەكردوە، جگە لە (یونس) -علیه السلام- كە ئەویش خوا سزایداو، هەڵوێستەكەیشی ڕاست كردەوەو، گەڕایەوە نێو خەڵك و كۆمەڵگایەكەی!

٤- كەواتە: ئەو ڕاوبۆچوونەی ئێمە هەڵمانبژاردوە بۆ مامەڵەكردن لەگەڵ واقیعی خەڵك و كۆمەڵگاكەماندا، ڕای ڕاست و دروستە و، هیچ بەدیلێكی شەرعیی ڕاست و بەڵگەداری نیە.

## دەستپێك

بەڕێـــزان!

بابەتی سیاسەتکردن بە ڕەوشتی بەرزو جوان، هەمیشە هەر بابەتێکی گرنگ و هەستیارەو، شایانی ئەوەیە، کە قسەو باسێکی زۆری لەسەر بکرێت، بەڵام بەتایبەت لەم هەل و مەرجەی ئێستای هەرێمی کوردستاندا، بەڵکو عێراق و، فراوانتریش، زیاتر دەیهێنێ، کە قسەی لەسەر بکەین، لەبەر ئەوەی بەداخەوە، کە سیاسەتکردن لە ئەنجامی لێکدابڕانی لەگەڵ ڕەوشت و بەها بەرزەکاندا، ڕەونەق و جوانیی خۆی لەدەست داوە، لەحاڵێکدا کە سیاسەتکردن لە ڕوانگەی شەریعەتەوە، پیشەی پێغەمبەران (صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێ)، بووە، وەك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:

(كانت بنو إسرائيل تسوسهم الأنبياء، كلّما هَلَكَ نبيٌّ خَلَفَه نبيٌّ) رواه البخاري:٣٢٦٨، و مسلم: ١٨٤٢.

واتە: گەلی بەنو ئیسرائیل، پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) سیاسەتیان دەکردن، هەرکات پێغەمبەرێك وەفاتی دەکرد، یەکێکی دی لە شوێنی دەبوو بە جێنشین.

سیاسەتیان دەکردن، واتە: سەرپەرشتییان دەکردن، لە ڕاستییدا وشەی (سیاسەت)، «وەك دواییش باسی دەکەین» سەرپەرشتییکردن و مشوور لێخواردن و کاروبار هەڵسووڕاندنە.

ئنجا لە حاڵێکدا، کە سیاسەتکردن لە ڕوانگەی شەریعەتەوە، پیشەی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بووە، بە دەقی فەرمایشتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، ئێستا وا ناشیرین کراوە، کە ژمارەیەك لە کەسە ناودارەکانی ئێمە - یانی جیهانی ئیسلام - بەشێوەیەکی خراپ باسیان کردوە، چەند نموونەیەکتان بۆ دێنمەوە:

١- یەکێك لەوانە: مامۆستا (سەعیدی نورسیی) ڕەحمەتی خوای لێ بێ، لە (رسائل النور) لە بەرگی (٩) (السیرة الذاتیة)دا گوتوویەتی: (أعوذ بالله من الشیطان والسیاسیة)، پەنا بەخوا دەگرم لە شەیتان و لە سیاسەت[1].

هەڵبەتە بۆخۆی دوایی دەڵێ: (لە سیاقێکدا ئەو قسەیەم کرد، کە ڕۆژێك تەماشام کرد، دوو کەس، کە هەردووکیان ئەهلی عیلم بوون، بوو بە مشت و مڕیان لەسەر کێشەیەکی سیاسیی، کە هەر کامیان لە حیزبێکی سیاسیی جیا لەوی دیکەیاندابوو، دوایی مشت و مڕەکەیان سەری بۆ ئەوە کێشا، کە یەکێکیان ئەوی دیکە بە کافرو گومڕا دابنێ، ئیدی لەوەوە من سڵەمینەوەیەك و ڕاچڵەکینێکم بۆ دروست بوو، گوتم: سیاسەتێك سەر بۆ ئەوە بکێشێ، ئینسان ڕەفیقەکەی خۆی بە کافر دابنێ، هەروا باشە، پەنای لێ بەخوا بگری و توخنی نەکەوی!).

هەڵبەتە من دوایی قسەی خۆمم لەو بارەوە هەیە.

---

(١) بڕوانە: کلیات رسائل النور، ٩، السیرة الذاتیة، ص٢٣٧، ط٧ / ٢٠١٣م.

٢- یەکێکی دیکە لەوانە، پیاوێکی ناوداری جیهانی ئیسلامە (شیخ محمد عبده)ی میصریی، کە لە کتێبی: (الإسلام والنصرانية والعلم والمدنية)[١] قسەیەك دەکات، ئەمە دەقی قسەکەیەتی:

(إن السياسة يضْطهِدُ الفكر والدين، أعوذ بالله من السياسة، ومن لفظ السياسة، ومن معنى السياسة، ومن كل حرف يلفظ من كلمة السياسة، ومن كل خيال يخطر ببالي من السياسة، ومن كل أرض تذكر فيها السياسة، من ساس يسوس وسائس ومسوس).

(شێخ محەممەد عەبدە) عالمێکی گەورەیە، موصلّیح و چاکسازییخوازێکی گەورەی جیهانی ئیسلامە، بەڵام دیارە زۆر هەستیاریی بەرامبەر بە سیاسەت بۆ پەیدا بووە، کە دوایی باسی دەکەم، ئەوە چ جۆرە سیاسەتێك بووە!



واتە: سیاسەت هەم بیرکردنەوەو هەم دینداریی دەچەوسێنێتەوە، پەنا بەخوا دەگرم لە سیاسەت و، لە وشەی سیاسەت و، لە مەعنای سیاسەت و، لەهەر پیتێك، کە گۆ دەکرێ لەوشەی سیاسەت و لەهەر خەیاڵێك، کە لەسیاسەت بەخەیاڵم دادێ و، لەهەر زەمینێك، کە باسی سیاسەتی تێدا دەکرێ و لە (ساس يسوس وسائس ومسوس).

٣- یەکی دیکە لەوانە، ئەدیبێکی ناودارە، کە ئەوانەی سەروکاریان لەگەڵ ئەدەبدا هەیە، حەتمەن ناویان بیستوە، ئەویش (مصطفى لطفي المنفلوطي)، کە ئەویش ئەدیبێکی مەشهووری میصرییە، لە کتێبێکی دا بەناوی: (النظرات)[٢]، ئەو زۆر توندتر باسی سیاسەت

---

(١) ص١٠١،١٠٠،ط١٩٥٤، القاهرة.

(٢) ج٢، ص٢٣،٢٢.

دەکا، دەڵێ: (لا فرق عندي بين السياسيين والجلاّدين إلا أن هؤلاء يقتلون الأفراد وهؤلاء يقتلون الأمم، يعلم الله أني أُبغِضُ السياسة وأهلَها بغضي للكذب والغِشِّ والخيانة والغدر، هل السياسي إلا رجل عَرَفَتْ أُمَّتُه أنه لا يوجد بين أفرادها من هو أقسى منه قَلْباً ولا أكثر كيداً، أيستطيع الرجل أن يكون سياسياً إلا اذا كان كاذباً في أقواله وأفعاله، يُبطِنُ خلاف ما يُظْهِرُ، ويُظْهِر خِلافَ ما يُبْطِنُ، وَيَبْتَسِمُم في مواطن البكاء، ويبكي في مواطن الإبتسام؟!).

واتە: لەلای من جیاوازیی نیە لە نێوان سیاسەتمەدارەکان و جەللادەکاندا، ئەوانەی کە لە خەڵك دەدەن، یان خەڵك دەکوژن، ئەوەندە هەیە، جەللادەکان تاك تاك خەڵك دەکوژن، بەڵام سیاسییەکان بە کۆمەڵ خەڵك دەکوژن و، کۆمەڵگاکان لە بەین دەبەن.



خوا دەزانێ، کە من ئەوەندە ڕقم لە سیاسەت و لە ئەهلی سیاسەتە، کە ڕقم لە درۆیەو لە غەش و خیانەت و پەیمان شکێنییە، ئایا سیاسیی هەر ئەو کەسە نیە، کە ئۆممەتەکەی، [کۆمەڵگاکەی] دەزانن، کە هیچ کەس لەو دڵ ڕەقتر نیە؟ ئایا مرۆڤ دەتوانێ سیاسیی بێ، مەگەر درۆزن بێ، لە قسەو لە کرداریداو، پێچەوانەی ئەوەی ئاشکرای دەکات پەنهانی بکات و، پێچەوانەی ئەوە دەربخات، کە لە دڵی دا هەبێ، هەروەها لە شوێنێك، کە پێویست بکا بگری، پێبکەنێ و، لە شوێنیك کە پێویست بکات پێبکەنێ، بگری؟

ئنجا لێرەدا دەمەوێ ئەوەتان پێ بڵێم: ئەوەی وای کردوە، کە مامۆستایەکی وەك (سەعید نورسیی)، کە بە تەئکید باش لە ئیسلام حاڵی بووە، هەروەها مامۆستا (شێخ موحەممەد عەبدە)، کە

زانایەکی گەورەبووەو، (مصطفی لطفي المنفلوطي)، کە ئەدیبێکی گەورەیە، ئاوا بە توندیی بەرامبەر بە سیاسەت قسە بکەن، ئەوەیە کە سیاسەتی چەواشەکارانەو بێ کەڵك و بەکارنەهاتوو، پڕ فرت و فێڵ و غەش و خیانەتیان زۆر بینیوە.

ئنجا من تێبینییم لەسەر قسەکانیان ئەوەیە، هەم مامۆستا نورسیی، هەم (شیخ محمد عبده)، هەم (مصطفی لطفي المنفلوطي)، نەدەبوو بە گشتی باسی سیاسەت بکەن، بەڵکو دەبوو بڵێن: سیاسەتێك، کە ڕەوشت و ئاکاری بەرزی لەگەڵدا نیە، یان سیاسەتێك، کە لەسەر بناغەی ئیمان و عەقیدە بنیات نانرێ.



بێگومان ئەو سێ کەسە، هەرسێکیان مسوڵمانن و، دەبوو قەیدێکی بخەنە سەرێ، نەك بە گشتیی و بە ڕەهایی زەمی سیاسەت بکەن، کە ئێستا خەڵکێك لە شوێنکەوتووانی مامۆستا سەعیدی نورسیی هەیە، هەستیاریی هەیە بەرامبەر بە سیاسەت و کاری حیزبیی و سیاسیی، لەبەر ئەو قسەیەی مامۆستا، هەرچەندە ئەو لە سیاقێکدا کردوویەتی، کە سیاقێکی تایبەت بووە «وەك پێشتر لەزمانی خۆیەوە نەقڵمان کرد» بەڵام قسەیەك کە تۆ نەتبەستۆتە بە قەیدێکەوەو، بە ڕەهایی کردۆتە، دوایی ئەو قسەیە، لە غەیری ئەو سیاقەدا، کە تۆ کردووتە، بەکاردەهێندرێت.





بەڕێزان! ئەم بابەتە[1] لە حەوت (٧) تەوەردا پێشکەش دەکەین:

**تەوەری یەکەم:** پێناسە، پێناسەی هەرکام لە وشەکانی: ڕەوشت، سیاسەت، ڕەوشتی سیاسیی، دەکەین.

**تەوەری دووەم:** تێکگیرانی ڕەوشتبەرزیی و کاری سیاسیی، کێشەیەکی لەمێژینەی بەشەرە.

باسی دەکەین، کە چ نەوعە سیاسەتێك، لەگەڵ ئاکاری پەسندا تێکدەگیرێ!

**تەوەری سێیەم:** ڕەوشتە بەرزە سیاسییە بنەڕەتییەکان، کە دوازدە (١٢) ڕەوشت و ئاکاری بنەڕەتیی، بواری حوکم و سیاسەت دەخەینە ڕوو.

**تەوەری چوارەم:** ڕەوشتە بەرزەکانی بەرپرسان لە بواری سیاسەت و حوکمڕانییدا.

لەم تەوەرەشدا، دوازدە (١٢) ڕەوشت و ئاکاری پەسندی، کە بۆبەرپرسان پێویستن، دەخەینەڕوو.

**تەوەری پێنجەم:** ڕەوشتە بەرزە سیاسییەکانی خەڵك و جەماوەر، لە مامەڵەیان لەگەڵ حوکمڕان و بەرپرساندا.

---

(١) - شایانی باسە: ئەم بابەتە لەئەسڵدا کۆی دوو وتاری بەندمیە بەناو و نیشانی: (سیاسەتکردنی ڕەوشت بەرزانە: چۆن و بۆچی؟) کە لەڕۆژی (٢٠١٨/١١/٣ز)دا لەسلێمانیی پێشکەشی کۆمەڵێکی بژاردە لە خوشك و برایانی مشوور خۆر کراون و، هەتا ئێستاش بەشێوەی کتێبێکی سەربەخۆو بەناو و نیشانی: (گرنگیی ڕەوشت لەسیاسەتدا) سێ جاران چاپ کراوە...

لەم تەوەرەیەشدا، شەش (٦) ڕەوشت و خەسڵەتی بەرز و جوانی خەڵك، لە مامەڵەیان لەگەڵ بەرپرساندا، دەخەینەڕوو.

**تەوەری شەشەم:** دارِترانی ڕەوشت و بەها بەرزەکان لە کاری سیاسیی، دەرهاویشتەی زۆر خراپ، بەڵکو کارەساتباری لێ دەکەونەوە.

**تەوەری حەوتەم:** بناغەو هۆکارەکانی ڕەوشت بەرزیی لە سیاسەتدا.

لە کۆتاییشدا: دەرەنجامێك کە گوشراو و خولاصەی هەموو بابەتەکەیە، دەخەینە ڕوو.








## گرنگیی و هەستیاریی ئەم بابەتە

خوێنەرە سەنگین و شیرینەکان!

پێم وانیە لەهیچکەس شێردراوە بێ کە لەم ڕۆژگارەدا مرۆڤایەتیی لەگەڵ گەلێك کێشەو قەیرانی جۆراوجۆردا دەستەو یەخەیە، لەهەموو بوارەکانی ژیاندا: فیکرو کلتوور، حوکم وسیاسەت، خێزانیی و کۆمەڵایەتیی، ئابووریی و گوزەران، جەنگ و ئاشتیی، ژینگەو دەوروبەر ...هتد.

بەڵام پێم وایە: قەیرانی ڕەوشت و ئاکار (الأخلاق والسلوك) بەگشتیی و، بەتایبەت لەبواری حوکمڕانیی و سیاسەتکردندا، لەهەموو ئەو قەیرانانەی دیکە گورچکبڕترو بەزەڕترەو، چارەسەریشی قورسترو بەمەسرەفترە.

قورسیی چارەسەری قەیرانی ڕەوشت و ئاکارو، تێچوون (خرجي)ی زۆریشی، بەتایبەت لەبواری حوکمڕانییدا، هۆکارەکەی ئەوەیە کەمرۆڤ «چ وەك تاك چ وەك کۆمەڵ» بۆی نالوێ بەڕەوشت و ئاکاری بەرزو پەسندەوە پابەندبێ و، دەستبەرداری خەسڵەتە جوان و چاکەکانی نەبێ، لەگەرمەی کاروچالاکی سیاسیی و ئیدارەدان و، حوکمڕانیی حیزب و حکوومەت ولاتدا، مەگەر:

١- خوای بەرزو مەزنی لەخۆی و خەڵك خۆشتر بوێ.

٢- دوارۆژ بەسەر دنیادا هەڵبژێرێ.

٣-ڕووح و لایەنی مەعنەویی، لەجەستەو لایەنی ماددیی، لەلا گرنگتر بێ.

٤- هەق و ڕاستیی و دادگەریی هێندە لەلا شیرین بن، کە بەهیچ شتێکیان نەگۆڕێتەوە، چ جای بۆناهەق و درۆو ستەم، نادیدەیان بگرآ و دەستیان لێ هەڵبگرێ .

ئنجا ئەمانەشی بۆ دەستەبەرنابن، مەگەر هەڵگری هەرکام لەمانە بێ:

١- بوونناسییەکی ڕاست و دروست.
٢- ئیمان و عەقیدەیەکی ساغ و پاك .
٣- خوا پەرستییەکی ڕێك و بێ خڵتە.
٤- ڕەوشت و ئاکارێکی بەرزو پەسند.


٢٢١


کە ئەمەش تەنیاو تەنیا لەوەحیی و پەیامی ڕاست و ساغ و دەستکاریی نەکراویی خوادا، چنگ دەکەوێ، کە ئیسلامی بەرجەستەیە لەقورئانی بەپێزو ڕێبازی پێغەمبەری بەڕێزدا «صلى الله عليه وسلم».

ئنجا لەبەردەم لە ئیسلام بەهرەمەندبوونی چینی سیاسەتمەدارو بەرپرس و حوکمڕاندا، سێ کۆسپ و لەمپەر هەن، کە ڕێی گەیشتن بەو ئامانجەیان لێدەگرن و، هەتا نەیانبڕن و هەڵیان نەبوێرن، دەستیان پێی ناگات:

یەکەم: لەحاڵێکدا کە وەحییو پەیامی خوا (ئیسلام) تەنیا لە قورئان و ڕێباز (سنة)ی پێغەمبەری خاتەم (محمد)دا بەرجەستەیە، ئێستاکە: ئیسلام وەك ئاوی ڕووبارێکی هەڵقوڵاو لەسەرچاوەیەکی ساف و سازگار، کەماوەی هەزارو چوارسەدو پەنجاو سێ (١٤٥٣) ساڵە بەڕێ کەوتوە، لەماوەی دوورو درێژی ئەو هەموو ساڵانەداو،

لەو هەموو ناوچە جوگرافییانەدا کە پێیاندا ڕەتبووە، خشپ و خاڵ و پووش و پەڵاش و لیتەو لاڵێکی زۆری تێکەڵ بووەو، بۆ کەسانێك شارەزای ئیسلام نەبن، لەدوو سەرچاوە ڕوون و بێ چەندو چوونەکەیدا (قورئان و سوننەت) ڕووی ڕاستەقینەی ئیسلام، تا ڕاددەیەکی زۆر ون و پەنهان بووە، بەتایبەت بۆ ئەو چین (طبقة)ە سیاسییەی کە لە سۆنگەی بێبەش (محروم) بوونیانەوەو، لە بوونناسیی (معرفة الوجود ـ ontdogy)و، ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی، هاندەرو پاڵنەرێکی جیددییان نەبووە بۆ هەوڵدان بۆ لێکۆڵینەوەیان لەبارەی ئیسلام و لێتێگەیشتنیەوە.

دووەم: ئەو چینە سیاسییە «زۆربەی» لەئەنجامی بەهرەمەند بوونیاندا لە کۆمەڵێك پلەو پێگەو ئیمتیازی ماددیی و مەعنەویی، پەردەیەکی ئەستووری لە خۆبایی بوون (غرور)و لەکەوڵی خۆ دەرچوون و، خۆ گەورە بینین، بەسەر عەقڵ و دڵیان هەڵکشاوەو، پێیان نەنگیی و کەمیی بووە، لەبارەی ئیسلامەوە پرسیار بکەن و، خۆیان هۆشیارو بەرچاو ڕوون بکەن و، بەزۆریی لەحاڵەتی نەزانیی ئاوێتە (الجهل المركّب)دا گیرۆدەو گرفتار بوون و، لە ئیسلام نەشارەزان و ناشزانن کە نە شارەزان.

سێیەم: لەسۆنگەی ئەوەوە کە ئایەتەکانی کتێبی بەرزو پیرۆزی خواو دەقەکانی ڕێبازی پێغەمبەری پێشەوا (صلى الله عليه وسلم)، زۆر بەڕوونیی و ڕاشکاویی و بێ پێچ و پەنا، لەبواری چۆنیەتی حوکمڕانیی کردندا، نوختەیان خستۆتە سەرپیت و، سەرەنجام پابەندیی بەئیسلامی بەرجەستە لەقورئان و سوننەتدا، دەبێتە کۆسپ و لەمپەرێکی مەحکەم لەبەردەم تێرکردنی ناشەرعییانەی غەریزەکانیان و، هێنانەدی

ناڕەوایانەی بەرژەوەندییەکانیانداو، بێگومان ئەوەش سڵەمینەرەوەیەکی گەورەی کەسانێکە لە ئیسلام، کە مرۆڤ تەنیا وەك جەستەو تۆپەڵێك حەزو غەریزەو، ژیانیش تەنیا وەك ماددە دەبینن!

بەڵێ خوێنەری بەڕێز!

بەبڕوای بەندەو بەپێی ئەزموون و شارەزایی چەندان ساڵەم، ئەو سێ کۆسپ و لەمپەرە، پەرچ و ئاستەنگی بەردەم زۆربەی ئەو چینە سیاسییەن، کەساڵانێکی دوورو درێژە، بەو شێوە سەقەتەو ناشەرعییانەو دواکەوتووانەیە، ئەم وڵاتە بەڕێوە دەبەن.

هیواداریشم ئەم بابەتە بەرچاو ڕوونییەکی باش بێ و، هاوکارێکی ساغ بێ، بۆ هەموو ئەو کەسانەی هەست بەمەترسیی دابڕینانی ڕەوشت و ئاکاری پەسند، لەکایەو کاری سیاسیی و حوکمڕانیی دەکەن، کە قۆڵی هیممەتی لێ هەڵماڵن، بۆ گێڕانەوەی ڕەوشت و خووی بەرزو جوان، بۆ کارو چالاکی سیاسیی، تاکو چیدیکە هەموولایەك ئەو هەموو باجە گرانانەی ئەو لێکدابڕانەی: (ڕەوشتی بەرزو کاری سیاسیی) نەدەین بەگشتیی و، بەتایبەتیش زۆربەی چینی سیاسیی و حوکمڕان و بڕیار بەدەست، زیاتر خۆی عەیبداری لای خەڵك و گوناهباری لای خەڵك نەکات.



بەڕێــزان!

ئێمە لەم تەوەرەی یەکەم دا، سێ وشە پێناسە دەکەین:

١- ڕەوشت (أخـــلاق).

٢- سیاسەت.

٣- ڕەوشتی سیاسیی.

## ١) ڕەوشــت (أخـلاق):



بە نسبەت ڕەوشت (أخلاق)ەوە، هەم (ابن فارس)[1] هەم (راغب الأصفهاني)[2]، هەم (ابن منظور) خاوەنی (لسان العرب)[3]، هەموویان لەسەر ئەوەکۆکن، کە دەڵێن: وشەی (أخلاق) لە ڕووی زمانەوانییەوە، کۆی (خُلُق)ە، (خُلُق)یش بریتیە لەو سروشتەی، کە مرۆڤ لەسەری دروستبووە، ئنجا «وشەی (خُلُق)» لەگەڵ (خَلْق) دا، یەك ڕیشەیان هەیە، لەبەر ئەوەی (خَلْق) واتە: ئەندازەگیریی کردن و، دروستکردنی شتێك بە ئەندازە، ئنجا ئەو (خلق)ەش، کە مرۆڤی لەسەر دروستکراوە، ئەویش شێوەو ئەندازەیەکی هەیەو، لێرەوە ڕیشەکەیان دەچێتەوە سەر یەك.

(راغب الأصفهاني) قسەیەکی جوان دەکا، دەڵێ: دوو وشەمان هەن: (خَلْق) و (خُلُق)، وشەی (خَلْق) بریتیە لە تەعبیرکردن لە ڕواڵەتی

---

(١) بڕوانە: مقاييس اللغة، ج٢، ص٢١٤.

(٢) بڕوانە: مفردات ألفاظ القرآن، ص١٧٣-١٧٤، المطبعة العصرية/٢٠١٢م.

(٣) بڕوانە: لسان العرب، ج٤،ص١٩٤.

مرۆڤ، لە جەستەی، (خُلُق)یش تەعبیرکردنە لە ناخی مرۆڤ و، لە ڕەوشت و ئاکارو دیوی پەنهانی مرۆڤ.

پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم)، وەك دایكمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) لێی دەگێڕێتەوە، دەڵێ: (كان رسول الله (صلى الله عليه وسلم) يقول: أَللَّهم كما حسَّنت خَلْقي، فأَحْسِنْ خُلقي) رواه أحمد في المسند، وابن حبان.

واتە: خوایە وەك چۆن جەستەو ڕواڵەتمت باش خوڵقاندوە، ڕەوشت و ئاكاریشم چاك و، جوان بكە.

## ٢) سیاسەت:



أ- وشەی سیاسەت، ئەگەر زۆر بە كورتیی پێناسەی بكەین، ماناكەی ئاوایە: (السياسة: هي القيام على الشيء بما يُصْلحه)[١]، واتە: سیاسەت بریتیە لە سەرپەرشتییكردنی شتێك، بە شێوەیەك كە چاكی بكا.

ب- (إمام عبدالرحمن التاج) لە كتێبی: (السياسة الشرعية والفقه الإسلامي)دا، تۆزێك درێژە دەداتە پێناسەكەی و، دەڵێ: (السياسة: إسمٌ للأحكام والتصرفات التي تُدَبَّرُ بها شؤونُ الأمة في حكومتها وتشريعها وقُضاتها، وفي جميع سلطاتها التنفيذية والإدارية، وفي علاقاتها الخارجية التي تربطها بغيرها من الأمم)[٢].

---

(١) لسان العرب لابن منظور، ج٦، ص١٠٧.

(٢) ص٨.

واتە: سیاسەت، ناوە بۆ ئەو یاسایانەو ئەو هەڵس و کەوتانە، کە کاروباری کۆمەڵگایان پێ بەڕێوە دەچێ، هەم لە حکوومەتیدا و، هەم لە یاسادانانی و، هەم لە دادوەرەکانیداو، لە هەموو پێگەکانی دەستەڵاتی جێ بەجێ کردن و بەڕێوە بردن و، لە پەیوەندییەکانیدا بەوڵاتان و نەتەوەکانی دیکەوە.

جـ- (ابن خلدون) پێناسەیەکی زۆر جوانی سیاسەت دەکات، هەڵبەتە ئەوە پێناسەی خیلافەت و جێنشینایەتیی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم)، کە هەر دەبێتەوە بە سیاسەت، دەڵێ: (حَمْلُ الكافة على مقتضى النظر الشرعي في مصالحهم الأخروية والدنيوية الراجعة إليها)[1] خیلافەت، یاخود سیاسەت، بریتیە لەوە، کە خەڵك وا دار بکرێ، بەپێی ئەوە کە شەریعەت دەیخوازێ، کە بەرژەوەندیی دواڕۆژیانی تێدا هەیەو، بەرژەوەندیی دنیاشیان، کە بەرژەوەندیی دنیاشیان هەر لە پێناو هێنانەدی بەرژەوەندیی دواڕۆژیاندایە، (کە ڕەزامەندیی خوای پەروەردگارە).

د- (الماوردي)یش ئاوا پێناسەی خیلافەت و حوکمڕانیی کردوە:

{الإمامة موضوعة لخلافة النبوة، في حراسة الدين وسياسة الدنيا}[2].

واتە: ئیمامەت بۆ جێنشینایەتیی پێغەمبەرایەتیی دانراوە، لەپاسەوانێتیی کردنی ئایین و مشوور لێخواردنی کاروباری دنیادا.

-----

(١) المقدمة، ص١٥١،١٥٠.

(٢) الأحكام السلطانية، ص٥.

## ٣- ڕەوشــتی سیاسیی:

براو خوشکانی بەڕێز! وشەی: ڕەوشتە سیاسییەکان، زۆر لە کتێبەکاندا گەڕام، پێناسەیەکی دیاریی کراوی نەبوو، بۆیە من ئاوام پێناسە کردوە: (الأخلاق السياسية عبارة عن الأخلاق الفاضلة والقيم الرفيعة التي يتحلّى بها المجتمع عامة والمسؤولون خاصة، في مجال الحكم والسياسة، كي يُحَقِّقوا من خلالها الأهداف الشرعية المبتغاةِ كالعدل وغيره).

واتە: ڕەوشتە سیاسییەکان بریتین لەو ئاکارو ڕەوشتە پەسندو جوانانە، کە کۆمەڵگا بە گشتیی و، سیاسەتمەداران و بەرپرسان بە تایبەت، خۆیانیان پێ دەڕازێننەوە، لە بواری حوکم و سیاسەتدا، تاکو لەمیانی ئەو ڕەوشتە بەرزانەدا، ئەو ئامانجە شەرعییانە، کە دەویسترێن، بهێندرێنە دی، وەك: دادگەریی و غەیری دادگەرییش.

ئێستاش دوای پێناسەکردنی هەرکام لەوشەکانی: ڕەوشت و سیاسەت و ڕەوشتی سیاسیی، کۆتایی بەتەوەری یەکەمی بابەتەکەمان دێنین و دەچینە سەر تەوەری دووەم:



# تەوەری دووەم

## تێکگیرانی ڕەوشتی بەرز و کاری سیاسیی،
## کێشەیەکی لە مێژینەی بەشەرە



بەرێـــــزان!

ئەمە ئەگەر هەر ئاوا بە ڕەهایی بیلێین[1]، وەك چۆن ڕەخنەمان گرت لە قسەكانی: (شیخ محمد عبده) و مامۆستا مەلا (سەعیدی نورسیی) و (مصطفى لطفي المنفلوطي)، كە بە ڕەهایی زەمی سیاسەتیان كردوە، قسەكەی ئێمەش دیسان هەڵە دەردەچێ.

براو خوشكە بەڕێزەكانم!

دەبێ بپرسین: ئایا ئەوە چ سیاسەتێكە، كە لەگەڵ ڕەوشت و بەهای بەرزدا، تێك دەگیرێ؟

ئایا هەموو كارێكی سیاسیی، لەگەڵ ڕەوشت و بەها بەرزەكاندا، تێك دەگیرێ؟!



ئنجا ئەگەر ئەوە ڕاست بێ، دەبێ ئەو خەڵكە هەمووی بایكۆتی سیاسەت بكاو، دەبێ بڵێین: با هیچ كەس كاری سیاسیی نەكا، چونكە ئەگەر سیاسەتت كرد، ڕەوشت و بەهای بەرزت نامێنێ! دەبێ هەموو وا بڕیار بدەین، وەك (نیكۆلا میكاڤیلی) «كە دوایی قسەكانی دێنم» دەڵێ: هەر كەسێ كاری سیاسیی بكا، دەبێ واز لە ڕەوشت و بەهای بەرز بێنێ، پەیمان و بەڵێن و ڕەوشتی جوان و ڕاستگۆیی و.. هتد، نابێ هیچی لە كاری سیاسیی دا بخوێندرێتەوە!

بەڵێ، ئەگەر ڕەوشتی بەرزو ئاكاری پەسندو بەهای جوان، لەگەڵ سیاسەتكردندا تێكبگیرێن، بە ڕەهایی و لە هەموو كات و شوێنێكدا،

---

(١) واتە: بەڕەهایی بڵێین: [ تێكگیرانی ڕەوشتی بەرزو كاری سیاسیی، كێشەیەكی لە مێژیینەی بەشەرە].

دەبێ ئینسان دەستبەرداری یەکێکیان بێ: یان دەستبەرداری کاری سیاسیی ببێ، یاخود دەستبەرداری ڕەوشت و بەهای بەرز بێ!

بەڵام بەدڵنیاییەوە ئەوە ڕاست نیە، کە لە هەموو کات و شوێنێکداو، هەموو جۆرە سیاسەتکردنێك، لەگەڵ ڕەوشت و بەها بەرزەکاندا تێکبگیرێ، بەڵکو سیاسەتێك، کە ئامانجی خراپ و ستەمکارانەی هەبێ و، ئامرازو شێوازی ناشەرعییانە بگرێتە بەر، ئەو سیاسەتەیە، کە لەگەڵ ڕەوشت و بەها بەرزەکاندا دژ دەوەستێ، چونکە: بیکەن بە نیشانە! هەمیشە ئامانجت چۆن بێ، ئامرازیش و شێوازیش و ڕێبازیشت، کە بۆ هێنانەدی ئەو ئامانجە دەیگریە بەر، هەروا دەبێ.

هەر کەسێك ئامانجی چاك و بەرزی هەبێ، دەخەفتێ و، چاو دەگێڕێ بۆ ئامراز پاك و بەرزیش و، بەپێچەوانەوە: هەر کەسێ ئامانجی نزم و خراپی هەبێ، بێگومان هەوڵی دابینکردنی ئامرازو ڕێبازی خراپ و ناشەرعییش دەدات، چونکە: ئامانجی خراپ و ناشەرعیی، بە ئامرازی ناشەرعیی نەبێ، نایەتەدی، ئنجا دەڵێین: بەداخەوە بەدرێژایی مێژووی بەشەر، بەزۆریی ئەوانەی، کە سیاسەتیان کردوە، ڕەوشت و بەها بەرزەکانیان ڕەچاو نەکردوون، جگە لە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)و، تاکە تاکەیەك، کە لەژێر ڕۆشنایی و ڕێنمایی وەحییدا حوکمڕانیی و سیاسەتیان کردوە.

بۆ وێنە: باسی (حامورابی) دەکرێ و، باسی (ئەنۆشیروانی عادل) و، باسی فڵان کەسێك دەکرێ، تاك تاك، ئەویش مەرج نیە لە هەموو شتێکدا، بەڵام وەك گوتراوە: (لە چاو شلان پەیتە)، ئەوانیش لەچاو ناشیرینان جوان بوون، ئەگەرنا پابەندبوون بە ڕەوشت و بەهای بەرزەوە لە کاری سیاسییدا، کاتێك مەیسەر دەبێ، کە ئەو کەسە

ئامانجەکانی لە کاری سیاسییدا، ئامانجی بەرز بن و، ئامانجی شەخسیی و بنەماڵەیی نەبێ و، ئامانجی حیزبیی نەبێ و، ئامانجی ناشەرعیی نەبێ، چاوی لە فرت و فێڵ نەبێ، چاوی لە زوڵم و ستەم نەبێ، چاوی لە قۆرخکاریی نەبێ، دەبێ ئامانجی زۆر بەرزو جوانی هەبن، ئەوجار ئەو ئامانجە بەرزو باشانەی، ئامرازی باش پەلکێش دەکەن، وەك زانایانی ئیسلامیش گوتوویانە: (للوسائل حکم المقاصد) ئامرازەکان هەمان حوکمی ئامانجەکانیان هەیە، هەمیشە ئینسان، کە ئامانجی بەرزو باشی هەبوون، چاو دەگێڕێ بۆ ئامرازو شێوازی باشیش، بۆ هێنانەدی ئەو ئامانجانە.





کەواتە: ئەوە زۆر گرنگە ئێمە بیزانین، ئەگەر بەڕەهایی بگوترێ: ئەخلاق و سیاسەت تێکدەگیرێن، دەبێ بڵێین: نا، بەڵکو سیاسەتی چەوت و ستەمکارانەی ناشەرعیی، لەگەڵ ئەخلاقی پەسندو ڕەوشت و بەهای بەرزدا تێك دەگیرێن، ئەگەرنا وەرە سیاسەتی شەرعییانە بکە، هەرگیز پێویستیت بە درۆ نیە، پێویستیت بە خەڵك هەڵخەڵەتاندن نیە، پێویستیت بە فرت و فێڵ و چاوبەستەکێ نیە، پێویستیت بە پەیمان شکێنیی نیە، چونکە تۆ ئامانجێکێت نیە، پەکی لەسەر ئەو وەسیلە خراپانە کەوتبێ، بەڵگەشمان، ئەوەیە، کە ئایا پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) کەسێك دەتوانێ لە مێژووی پێغەمبەراندا، لەسەر یەکێکیانی ساغ بکاتەوە، کە بەڵێن و پەیمانێکی شکاندوە، قسەیەکی کردوە وانەبووە؟ نەخێر، ئنجا نەك هەر ئەوان، بەڵکو چوار خەلیفە ڕاشیدەکان (خوا لێیان ڕازی بێ)، هەروەها ئەو حوکمڕانانەی دیکە، کە کەم و زۆر، بەدوای ڕووناکیی و هیدایەتی پێغەمبەرایەتیی کەوتوون، لە هەموو سیفەتە نزمانە (رذائل)ە دوور

بوون، پیاوانێکی وەك: (عمر بن عبدالعزیز) و (عمادالدین زنكي) و (محمود زنكي) و (صلاح الدین)ی ئەییوبیی و سوڵتان مەحموودی غەزنەویی و...هتد، ژمارەیەکی باشیان باس دەکرێن، لەبەر ئەوەی پەیوەست بوون بە ئیمان و ئیسلام و شەریعەتەوە، بۆیە: دادگەربوون، دڵسۆزبوون، زاهید بوون، دڵرەق نەبوون، بەرامبەر بە خەڵك لێبوردە بوون، چاوپۆشییکار بوون و، ڕازاوە بوون بە ڕەوشت و سیفەتە جوانەکان.

ئنجا تەماشا بکەن براو خوشکانی بەڕێزم!

پێغەمبەری خاتەم (صلی الله علیه وسلم) چۆن بە نووری وەحیی، ئایندەی ئۆممەتەکەی بینیوە، ئایندەی دنیای بینیوە، تەماشای ئەو فەرمایشتە بکەن، کە باسی ئەو جۆرە سیاسەتە دەکا، کە لە ئەخلاق و ڕەوشت و بەها بەرزەکان دادەبڕێ، دەفەرموێ:

(سيأتي على الناس سنوات خدّاعات، يُصَدَّق فيها الكاذب، ويُكَذَّب فيها الصادق، و يُؤتمن فيها الخائن، ويُخَوَّن فيها الأمين، وينطق فيها الرويبضة، قيل: ومن الرويبضة؟ قال: الرجل التافِهُ يتكلّم (يَنْطق) في أمر العامة).

ئەم فەرمووودەیە فەرموودەیەکی صەحیحە، (حاكم) لە (المستدرك) دا هێناویەتی و بە صەحیحی داناوەو (ابن ماجه) هێناویەتی و (الألباني) لە (صحيح ابن ماجه)دا بە ژمارە (٣٧٧٧) هێناویەتی هەروەها (الترمذي) هێناویەتی و (الألباني) لە (صحيح الجامع) دا بە ژمارە (٣٦٥٠) بە صەحیحی داناوە، هەروەها (أحمد شاكر) بە صەحیحی داناوەو لە (السلسلة الصحيحة)دا هاتوەو (الهيثمي) لە: (مجمع الزوائد)دا گوتوویەتی: فەرموودەیەکە هیچ ئیشکالێکی

لەسەر نیە، كە ڕاستە (سنداً ومتناً)، واتە: لەڕووی زنجیرەی ڕاوییەكانی و لەڕووی نێوەڕۆكیشەوە.

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: ساڵانێك بەسەر خەڵكدا دێن، ساڵانێكی فریودەر، هەڵخەڵەتێنەر، كە تێیاندا، بابای درۆزن بە ڕاستگۆ دەزاندرێ و، هی ڕاستگۆ بە درۆزن دەزانرێ، هەروەها ئینسانی خائین، بە ئەمیندار دادەندرێ و، ئینسانی ئەمینداریش بە خائین دادەندرێ، (رويبضة)[1] قسەی تێدا دەكا [یانی: ئەمرو نەهی تێدا دەكا] گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! (صلى الله عليه وسلم) (رويبضة) چییە؟

فەرمووی: (الرجل التافه) پیاوی هیچ، پیاوی بێ نێوەڕۆك، قسە لەكارو باری خەڵكدا دەكا.



بەڕێـــزان!

هەر ئاوا بە واقیعی دنیای حوكم و سیاسەتدا چاو بگێڕن! چەند پیاوی پووچ و بوودەڵە (الرجل التافه) دەبینن! پیاوی پووچ و بوودەڵە كێیە؟

كەسێك خوا نەناسێ، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نەناسێ، حەڵاڵ و حەڕام نەزانێ، فەرق بە ڕاست و درۆ نەكا، فەرق بە ڕاست و چەوت نەكا، بەرژەوەندیی چۆنی بوێ وابكا، ئامادە بێ هەموو خەڵك بە قوربانی بەرژەوەندییەكی خۆی، هی خزمێكی، هی

---

(١) الرُّويبضة: الرجل المقيم العاجز، المعجم الوسيط، ص٣٢٣.
واتە: ڕوەیبیزە: پیاوی دانیشتوو (هەڵخزاو)ی دەستەپاچە.

حیزبەکەی بکا، هی دەوروبەری بکا، ئەگەر ئەمە (الرجل التافه) نەبێ کێیە؟

کەسێك دارنرابێ لە هەموو ئەو ڕەوشت و بەها بەرزانەی، کە هەموو مرۆڤێك دەبێ خۆییان پێ برازێنێتەوە، چ جای کەسێك کە سەرپەرشتیی خەڵك دەکات و، ئەمرو نەهی مرۆڤەکانی بەدەستە، ئەگەر ئەوە پووچ و بوودەڵە نەبێ، دەبێ کێ بێ؟!

ئەمە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، هەواڵی پێداوین، کە ڕۆژگارێك دێ، کۆمەڵگا بەو شێوەیەی لێدێت، لە ئەنجامی ئەوەدا، کە پێوەرەکان هەڵدەگێڕدرێنەوە، چونکە: کە دەفەرموێ: درۆزن تێیدا بە ڕاستگۆ دادەندرێ و، ڕاستگۆ بە درۆزن دادەنرێ و، خائین بە ئەمیندارو، ئەمیندار بە خائین، مەبەست ئەوەیە، کە پێوەرەکانی خەڵك، تێك چوون، واتە: ئەوە کە دەبێ ڕەوشتی بەرز لەسەرووی هەموو شتێکەوە بێ و، دەبێ ڕەوشتی جوان هەوێنی هەموو شتێك بێت: کەسابەت دەبێ بە ڕەوشتەوە بکرێ، سیاسەت دەبێ بە ڕەوشتەوە بکرێ، خزمایەتیی دەبێ بە ڕەوشتەوە بکرێ، بەڵکو کە زانیاریی فێری خەڵك دەکەی، دەبێ ڕەوشت و ئەخلاقی لەگەڵدا بێ، کە هاموشۆی مزگەوت دەکەی، کە خواردن دەخۆی...هتد، هەموو شتێك دەبێ بە ئاکارو ڕەوشتی پەسندەوە بێ، ئەگەرنا لەسەری قەرزدار دەبیەوە! ئنجا فەرموودەکە فەرموویەتی: ڕۆژگارێك دێ، کە خەڵك ئەو پێوەرانەی لێ تێك دەچن.

ئنجا با تەماشای فەرمایشتێکی دیکەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بکەین، هەر دەربارەی لێك دابڕانی ڕەوشت و سیاسەت، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:

(لَتُنتقضَنَّ الإسلامُ عروةً عروةً، فكلّما انتقضت عروةٌ، تشبَّث الناس بالتي تليها، وأولهن نقضاً الحكم، وآخرهن الصلاة). رواه (أحمد و الطبراني) وقال الهيثمي في (مجمع الزوائد) برقم: ١١٧٤٤ رجالهما رجال الصحيح.

واتە: گرێ و قوڵفەکانی ئیسلام، گرێ گرێ قوڵفە قوڵفە، هەڵدەوەشێنەوە {(عروة) یانی: دەسك، یان هەنگڵی شتێك، هەنگڵی گۆزە، کە دەستی تێدەگرێ} هەر کە قوڵفەیەك هەڵدەوەشێتەوە، خەڵك دەست بە ئەوی دیکە دەگرێ، یەکەمین گرێ و قوڵفە، کە لە ئیسلام هەڵدەوەشێتەوە، بریتیە لە حوکمڕانیی و، دوا قوڵفەشی بریتیە لە نوێژ.

واتە: وەختێك نوێژ نامێنێ، مانای وایە: ئیسلامەتیی بوونی نامێنێ.

٢٣٩ ئێستا لەم ڕۆژگارەدا کاری زۆر لەدژی ئیسلام دەکرێ، تەماشا بکەن! زۆرێك لەو وڵاتانەی، کە حوکمێکی بنەماڵەیی و میراتییشیان هەیە، کە لە ئەسڵدا بە تام و بۆنێکی دینیی، دروست بوون، ئەوانەش دژی تەوژمی ئیسلامیی: ئیسلامی سیاسیین [ئیسلامی سیاسیی! ئێمە یەك ئیسلامەمان هەیەو بەشێك لەو ئیسلامە سیاسەتەو حوکمڕانییەو، بەشێکی عیلم و فیکرەو، بەشێکی تەقوایە، بەڵام ئەوە بە حیساب وەك ناوو ناتۆرەیەو بۆ ناشیرین کردنە: ئیسلامی سیاسیی، یان ئیسلامی توندڕەو، یان ئیسلامی ئوصووڵیی!] بەڵێ، تەنانەت ئەوانیش بوون بە تیپێك و ئەو دەهۆڵە دەکوتن، لە دژی ئەو کۆمەڵ و جموجۆڵە ئیسلامییانەی، لەدژی ئەو تەوژمە ئیسلامییەی کە:

١) دەیەوێ مسوڵمانان هەڵسێنێتەوە.

٢) دەیەوێ چی دیکە خێرو بێری وڵاتی مسوڵمانان بە تاڵان نەبردرێ.

٣) دەیەوێ چی دیکە مسوڵمانان کەسانێك حوکمیان بەسەردا نەکەن، وەك مەڕو ماڵ تەماشایان بکەن، ئاخر بۆ زانیارییتان! حوکمی بنەماڵەیی و میراتیی، یانی: ئەو خەڵکە وەك مەڕو ماڵ تەماشا کراوە، کابرایەکی مەڕدار، ئەگەر بۆخۆی مرد، مەڕو ماڵەکەی کێ دەبێتە خاوەنی؟ کوڕەکەی، خزمەکانی، ئەوانەش (عباد و بلاد) بە هی خۆیان دەزانن و خۆیان بە خاوەن و، وڵات و خەڵکەکەش بە موڵك دەزانن، بۆیە کاتی خۆی ڕاپەڕیوێکی میصریی[1]، لە (خدێوی) پادشای میصر ڕادەپەڕێ، دەڵێ: (إنّ الله تعالى خَلقنا أحراراً ولم يَخلقْنا عَقاراً، والله لا نُوَرَّث بعد اليوم)، واتە: خوا ئێمەی بە ئازاد خوڵقاندوە، ئێمەی وەك زەوی و زار دروست نەکردوە (بە میراتمان بگرن)، بەخوا لەمەودوا، نابێ بە میرات بگیرێین.

مەبەستم ئەوەیە: پرۆسەی هەڵوەشاندنەوەی ئیسلام و دوور خستنەوەو داڕنینی حوکم و سیاسەت و، دەستەڵات و ئەمرو نەهی لە ئیسلام، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: یەکەمین شتە، کە لە ئیسلامدا هەڵدەوەشێندرێتەوە، ئنجا وردە وردە، هەتاکو دواجار دەگاتە نوێژ.

ئێستا تەماشا دەکەی: تەنانەت هەندێك لەو قەوارانەش، کە بەبیانووی جێبجێکردنی شەریعەتەوەو بەناوی ئیسلامەوە، دروستبوون، ئەوانەش کەوتوونە دەهۆڵ کوتان لەگەڵ ئەو زلهێزو دەوڵەتانەدا، کە هەر کەسێ خۆی بجووڵێنێ، هەر کەسێ بڵێ: پێویستە شەریعەت حاکم بێ، هەر کەسێ باسی قورئان و سوننەت بکات، دەڵێن: ئەوەش

---

(١) پێم وایە: (أحمد عرابي باشا) بووە، کە سەرکردەیەکی شۆڕشگێڕی ناوداری میصریی بووە.

توندڕەو و پەڕگیرە، ئەوەش [فەندە مینتا لیست - Fandementalist] (أصولي) و، تیرۆریستە! بە تەئکید دەزانین بەناوی ئیسلامەوەو لەژێر پەردەی ئیسلامدا کاری توندوتیژیی کراوە، بەڵام ئاشکرایە ئەو تەوژمە ئیسلامییەی، کە دەیەوێ و دەڵێ: دەبێ وڵاتی مسوڵمانان بە ئیسلام ئیدارە بدرێ، داوایەکی هەیە، هیچ حەقێك لەوە حەقتر نیە، با خەڵکی ڕۆژئاوای نەصرانییش، وڵاتی خۆیان بە ئایینی خۆیان ئیدارە بدەن، هەروەها با خەڵکی هیندو چینیش و، خەڵکی ڕۆژهەڵاتی ئاسیاش، ئیلهام لە دینەکانی خۆیان وەربگرن، بەڵام مسوڵمانانیش حەقی خۆیانە، وڵاتی خۆیان بە پێی بەرنامەو دینی خۆیان بەڕێوە بەرن، هیچ شتێك لەوە حەقتر نیە، بۆیە زۆر ستەم و ناهەقییە، ناحەزو دوژمنێکی ئیسلام، ئەو حەقە بکاتە بەرچەسپێك و تۆمەتێك، هەرکەسێك باسی حوکمی ئیسلام و باسی حوکمی شەریعەتی کرد، بڵێ: ئەوە توندڕەو و پەڕگیرە، ئنجا ئەوە ئەگەر وڵاتانی ئەورووپا و ئەمریکاو جوولەکە و زلهێزانی دنیا بیڵێن، بەهەرحاڵ، بەڵام حەیفە وڵاتانێکیش بیڵێن، کە لە ئەسڵدا حوکمەکەیان لەسەر ئەساسی ئیسلام دامەزراوە، هەڵبەتە بەشێوەیەکی لادەرانە (تحريفي)، چونکە لە ئیسلامدا حوکمی بنەماڵەیی و میراتیی، بوونی نیە، لە ئیسلامدا بناغەی حوکم بریتیە لە:

﴿ وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ﴾ الشورى: ٣٨.

واتە: کاروبار بەڕێوەبردنیان بەڕاوێژە، بەڵام ئەوانە دەیانەوێ: (أمرهم شوربة بينهم) بێ، نەك ﴿ وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ﴾، بۆیە لەهەر شوێنێك جموجۆڵێکی ئیسلامیی هەبێ، هەندێك لەو دەوڵەتانە، پێی

قەڵسن، کەچی لەگەڵ جوولەکەو نەصرانیی و دەوڵەتانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا، باشترین پەیوەندییان هەیە!

بەرێـــزان!

ئایا ئێمە هەروا بە قسەی ڕووت دەڵێین: ئیسلام کۆمەڵێك ئاکارو ڕەوشتی سیاسیی دیاریی کردوون، یاخود بە ڕاستیی ئیسلام: ئایەتەکانی خوای پەروەردگارو، فەرمایشتەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەو بوارەشدا نوختەیان خستۆتە سەر پیت؟!

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە بە (بەڵێ) خوا پشتیوان بێ لە سێ تەوەردا، سی (٣٠) ڕەوشت دێنین، هەڵبەتە، بەکورتیی و، بەخێرایی:

١- دوازدە (١٢)یان ڕەوشتە سیاسییە بەرزە بنەڕەتییەکان، ئەوانە چ کۆمەڵگا، چ سیاسەتمەداران و حوکمڕانان، هەموویان پێویستە بەو ڕەوشتە بەرزانە ڕازاوە بن.

٢٤٥

٢- دوازدە (١٢)شیان ئەو ڕەوشتە بەرزانەن، کە پێویستە حوکمڕان و بەرپرسان ڕەچاویان بکەن.

٣- شەش (٦)یشیان، دەبێ خەڵك و جەماوەر، مامەڵەیان پێ لەگەڵ حوکمڕان و بەرپرساندا بکەن، هەموویان دەبن بە سی (٣٠) ڕەوشت و ئاکاری پەسند.

ئێستا نۆرەی دوازدە (١٢) ڕەوشت و ئاکارە سیاسییەکان پەسندە بنەڕەتییەکانە:

## ١) ڕاستیی (الصدق):

یەکەمین ڕەوشتی بەرزی سیاسیی بنەڕەتیی بۆ هەموو لایەك، بریتیە لە، ڕاستیی، ڕاستیی لەگەڵ کێدا؟ ڕاستیی مرۆڤ لەگەڵ

خۆیدا، لەگەڵ خوادا، لەگەڵ خەڵکدا، چونکە زۆر کەس وشەی (صدق) تەنیا بە ڕاستگۆیی تەفسیر دەکا، بەڵام لە ڕاستییدا (صدق) یانی ڕاستیی و، ڕاستگۆیی بەشێکە لە ڕاستیی، ڕاستگۆیی ئەوەیە زمانت ڕاست بێ و، لەگەڵ خەڵکدا ڕاستگۆبی، بەڵام ڕاستیی ئەوەیە، کە پێشتر دڵت ڕاست بێ و، لەگەڵ خۆتدا ڕاست بی، شتێك بەزمان نەڵێی، لەدڵتدا نەبێ، هەروەها بەدڵ و زمان و کردەوە، لەگەڵ خەڵکدا ڕاست بی و، لەگەڵ خوای پەروەردگاردا ڕاست بی.

لەزۆر ئایەت و فەرمایشتدا خوای بێ وێنەو هاوەڵ و پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم)، باسی ڕاستیی (صدق)یان کردوە، بۆ وێنە:

١- ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَكُونُواْ مَعَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿١١٩﴾ ﴾ (التوبة). ٢٤٦

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! پارێز لە خوا بکەن و لەگەڵ ڕاستاندابن.

٢- هەروەها لەسووڕەتی (الأحزاب)دا خوا مەدحی ڕاستانی کردوەو فەرموویەتی: ﴿ وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلصَّٰدِقَٰتِ ﴾ الأحزاب: ٣٥.

واتە: پیاوانی ڕاست و ئافرەتانی ڕاست لەخوا بەڵێنی لێبوردن و پاداشتی پێداون.

٣- پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ: (إن الصدق يهدي إلى البِرِّ، وإن البِرَّ يهدي إلى الجنة، وإن الرجل يَصْدُقُ، حتى يكتب عند الله صدِّيقاً، وإن الكذب يهدي إلى الفجور، وإن الفجور يهدي إلى

النار، وان الرجل يَكْذِبُ يُكْتُبَ حتى عندالله كذّاباً)، رواه البخاري: ٦٠٩٤، ومسلم: ٢٥٧١.

واتە: ڕاستیی دەبێتە هۆی چاکەکاریی و، چاکەکاریی هۆکاری چوونە بەهەشتە، هەروەها مرۆڤ لەسەر ڕاستیی بەردەوام دەبێت، تاکو لەلای خوا بە زۆر ڕاستبێژتر (صديق) دەنووسرێ، [هەربۆیەش (صديق) نازناوی ئەبووبەکری صیددیقە (خوا لێی ڕازی بێ)].

هەروەها درۆ سەردەکێشێ بۆ خراپەکاریی و، خراپەکارییش هۆکاری چوونە ئاگری دۆزەخەو، (جاری وایە) مرۆڤ لەسەر درۆکردن بەردەوام دەبێ، هەتا لەلای خودا بەدرۆزن دەنووسرێ.

براو خوشکانی بەڕێز! بێگومان ڕاستیی لە سیاسەتکردندا، لە کاری سیاسییدا، زۆر زۆر گرنگە، بەڵام وەك گوتمان: دەبێ لەگەڵ خوا ڕاست بی، لەگەڵ خۆت ڕاست بی، لەگەڵ خەڵك ڕاست بی، زمانت ڕاست بێ، دڵت ڕاست بێ، کردەوەو هەڵوێستەکانت ڕاست بن.



## ٢) دڵسـۆزیی (النصیحـة):

(نصیحة) بریتیە لەوەی: بەرامبەرەکەت چۆنی بۆ چاکە، ئەوەت بۆ بوێ و، هەوڵ بدەی ئەوەی بۆ بێنیە دی، پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)، وایان فەرمووە، بۆ نموونە:

أ- خوای بەرزی مەزن، لەسەر زمانی (نووح) ڕوو بەگەلەکەی دەفەرموێ: ﴿وَأَنصَحُ لَكُمْ﴾ الأعراف: ٦٢. واتە: دڵسۆزییتان بۆ دەنوێنم.

ب- هەروەها خوا لەسەر زمانی (هوود) ڕووبەگەلی (عاد) دەفەرمویٚ:

﴿ وَأَنَا۠ لَكُمۡ نَاصِحٌ أَمِينٌ ﴾ الأعراف: ٦٨. واتە: من بۆ ئێوە دڵسۆزێکی ئەمیندارم.

ج- پێغەمبەری کۆتاییش (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (الدِّين: النَّصيحَةُ، قُلْنا: لِمَنْ؟ قال: لِلَّهِ، وَلِكتَابهِ، وَلِرَسولِه، وَلأَئِمَّةِ المُسْلِمينَ، وَعَامَّتِهِم) مسلم:٥٥.

واتە: دینداریی دڵسۆزییە، گوتمان: بۆکێ؟

فەرمووی: بۆ خواو، بۆ کتێبەکەی و، بۆ پێغەمبەرەکەی و، بۆ پێشەوایانی مسوڵمانان و، بۆ مسوڵمانان بەتێکڕا.



د- (عن جرير بن عبدالله قال: بَايَعْتُ رسول الله "صلى الله عليه وسلم" على إقام الصلاة وإيتاء الزكاة والنُّصْحُ لِكُلِّ مسلم) رواه البخاري: ٥٧، ومسلم: ٥٦.

واتە: (جرير بن عبدالله) گوتوویەتی: پەیمانم لەگەڵ پێغەمبەری خوادا بەست، لەسەر بەرپاکردنی نوێژو زەکات دان و، دڵسۆزیی بۆ هەموو مسوڵمانێك.

(الدين: النصيحة)، دینداریی و مسوڵمانەتیی: دڵسۆزییە، (النصح) واتە: دڵسۆزیی، بەرانبەرەکەت چۆنی بۆ چاکە، تۆ ئەوەی بۆ بکەی و، ئەوەی پێ بڵێی و، ئەوەت بۆ بویٚ.

ئنجا ئایا دەبیٚ لە تاقیکردنەوەی ڕاستیی (صدق)و، لە دڵسۆزیی (نصح)دا چەند سیاسەتمەدارمان دەربچن؟!

هەیە جگە لە خۆی و بنەماڵەکەی و عەشیرەتەکەی و خزمی و حیزبی، دڵسۆزی کەسی دیکە نیەو، ئەوانیشی بۆخۆی دەوێ!.

## ٣) دادگـەریی (العـدل):

دادگەریی ماناو مەفهوومێکی زۆر فراوانی هەیە، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) باسی کردوە، کە ئاسمانەکان و زەوی بە دادگەریی ڕاوەستاون.

خوا لە قورئاندا لە زۆر شوێندا باسی (عَدْل) دەکا:



١- ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُ بِٱلْعَدْلِ ﴾ النحل: ٩٠.



واتە: خوا فەرمان بەدادگەریی دەکات...



٢- ﴿ وَأُمِرْتُ لِأَعْدِلَ بَيْنَكُمُ ﴾ الشوری: ١٥.

واتە: (ئەی موحەممەد بڵێ:) فەرمانم پێکراوە، کە دادگەرییتان لەنێودا بەرپا بکەم...

٣- ﴿ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَهُمَا بِٱلْعَدْلِ وَأَقْسِطُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴾ الحجرات: ٩.

واتە: (دوولایەنی ناکۆك) دادگەرانە ئاشتەواییان لەبەیندا بکەن و دادگەربن! بێگومان خوا دادگەرانی خۆشدەوێن.

٤- پێغەمبەری خوا (محمد)یش فەرموویەتی: (إِنَّ الْمُقسِطِينَ عِنْدَاللَّهِ عَلَى مَنَابر مِنْ نُور، الَّذين يَعْدِلُونَ فِي حُكْمِهِمْ وَأَهْلِيهم وَماوَلوا) مسلم: ١٨٢٧.

واتە: بێگومان دادگەران لەخزمەت خوادا، لەسەر چەند دوانگەیەکی نوورین، ئەوانەی لەحوکمڕانییاندا، لەگەڵ نێزیکانیان و، لەگەڵ ئەوانەی لەژێر بەرپرسیاریتییان دان، دادگەریی دەکەن.

دادگەریی (عدل)یش ئەوەیە، کە وەك چۆن مافی خۆت داوا دەکەی، هی خەڵکیش بدەی: (أخذ مالَكَ، وإعطاء ما عليك)[1].

## ٤) ڕاوێـژکردن (الشـورى):

أ- خوای پەروەردگار ڕاوێژکردنی خستۆتە نێوان نوێژو زەکاتەوە:

﴿ وَٱلَّذِينَ ٱسۡتَجَابُواْ لِرَبِّهِمۡ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ﴿٣٨﴾ ﴾ الشورى: ٣٨.



واتە: ئەو (بڕوادار)انەی وەڵامی پەروەردگاریان دایەوەو، نوێژیان بەرپاکردو، کاروباریان لەنێویاندا بەڕاوێژەو، لەوەی پێمان داون دەبەخشن.

تەماشا بکەن! حیکمەتی خوا ئەوپەڕی نیە، بۆ ئەوەی ئێمە لێمان تێك نەچێ، کە شووڕاو کاروبار بەڕاوێژ بەڕێوەبردنیش، بەشێکە لەدین، خوا بۆی خستووینە نێوان نوێژو ماڵ بەخشینەوە، نوێژو زەکات، چونکە هەموو کەس دەزانێ: دین دەبێ نوێژی تێدا بێ و، دەبێ زەکات و ماڵ بەخشینیشی تێدا بێ، کەواتە: ئەگەر نوێژ پایەی مەعنەوییەو، زەکات پایەی ئابوورییە، ڕاوێژیش پایەی سیاسیی و ئیداریی کۆمەڵگایە.

---

(١) المعجم الوسيط، ص٥٨٨.

ب- (أنس بن مالك) لەبارەی زۆر پرس و ڕا وەرگرتن و ڕاوێژكردنی پێغەمبەری خوا "صلی الله علیه وسلم" بەهاوەڵانییەوە، گوتوویەتی:

(مارأیت أحداً أكثر مشورة بأصحابه من رسول الله) رواه الترمذي: ۱۷٦۷.

واتە: هیچ كەسم نەدیوە لە پێغەمبەری خوا زیاتر، ڕاوێژ بە هاوەڵانی بكات.

## ٥) مشـوورخۆریی (الموالاة):

ڕەوشتێكی دیكەی بنەڕەتیی لەبواری كارو چالاكیی سیاسییدا، كە لەسەر هەموولایەك پێویستە، بریتیە لە:

۲٥۱ بە تەنگەوە بوون و مشوورخۆریی، وەك خوای كارزان و میهرەبان فەرموویەتی:

﴿ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ ﴾ التوبة -۷۱-.

واتە: بڕوادارانی پیاو و بڕوادارانی ئافرەت، دۆست و پشتیوان و مشوور خۆری یەكدیین...

بەڕێزان! بۆ زانیارییتان ئەم ڕستەی: ﴿بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖ﴾ ئەوە دەگەیەنێ، كە دەبێ بڕوادارانی پیاو و ئافرەت: دۆستی یەكدی بن، دڵسۆزو مشوورخۆری یەكدی بن و، سەرپەرشتیی یەكدی بكەن و، پشتی یەكدی بگرن و...هتد، چونكە وشەی (موالاة) زۆر چەمك و واتای لێ وەردەگیرێن[1] و، ئەم دۆستایەتیی نێوان پیاوانی ئیماندارو

---

(۱) بڕوانە: مفردات ألفاظ القرآن، راغب الأصفهاني، ص٥٦٦.

ئا فرەتانی ئیماندار، چەمك و واتایەكی فراوانی هەیە، دوایش خوای پەروەردگار شەش (٦) موفرەدە باس دەكا، كە ئەو دۆستایەتی و هاوكارییەی نێوانیان، بۆ جێ بەجێ كردنی ئەو شەش (٦) ئەركەیە:

﴿ ..يَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَيُطِيعُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ ۚ أُوْلَـٰٓئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ ٱللَّهُ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٧١﴾ ﴾ التوبة.

واتە: فەرمان بەپەسند دەكەن و، ڕێگریی لە ناپەسند دەكەن و، نوێژ بەرپا دەكەن و، زەكات دەدەن و، فەرمانبەریی خواو پێغەمبەرەكەی دەكەن، ئا ئەوانە خوا بەزەیی پێیان دادێ، بێگومان خوا زاڵی كارزانە.





## ٦) فەرمان بە پەسەندو ڕێگریی لە ناپەسەند (الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر):

ئایەت و فەرموودە لەوبارەوە زۆر زۆرن، بۆ نموونە:

أ- خوای دادگەر دەفەرموێ:

﴿ كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ ۗ ... ﴾ آل عمران: ١١٠.

واتە: ئێوە چاكترین كۆمەڵن بۆ خەڵكی (مرۆڤایەتیی) ڕەخسێنراون، فەرمان پەسند دەكەن و، ڕێگریی لە ناپەسند دەكەن و، بڕوا بەخوا دێنن...

ب- پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (والذي نفسي بيده، لتأمرنّ بالمعروف، ولتنهون عن المنكر، أو ليوشكنَّ الله أن يبعثَ عليكم عقاباً منه، ثم تدعونه فلا يُستجاب لكم)، رواه الترمذي: ٢١٦٩ وقال حديث حسن.

واتە: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە: دەبێ فەرمان بە پەسند بکەن و ڕێگریی لە ناپەسند بکەن، ئەگەرنا نیزیکە خوا لەلایەن خۆیەوە، سزایەکتان بۆ بنێرێ، ئنجا هەرچەندە داوای لێ بکەن - لایبەرێ- وەڵامتان نەداتەوە.

## ٧) خوا پێ مەبەست بوون و نیاز پاکیی (الإخلاص):



أ- خوا "عز وجل" دەفەرموێ:

﴿ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ ﴾ البینة: ٥.

واتە: تەنیا فەرمانیان بەوە پێکرابوو، کە خوا بپەرستن: ملکەچیی و فەرمانبەریی بۆ ساغ بکەنەوە...

ب- پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (إنما الأعمال بالنيات...) (البخاري:١، ومسلم: ١٩٠٧.

واتە: بێگومان کردەوەکان تەنیا بەگوێرەی نیازو مەبەستەکان وەردەگیرێن.

بەڕێــزان!

بیکەن بە نیشانە، هەر کاتێك ئینسان دڵەکەی بەرەو خێرو حەق وەرچەرخا، جەستەو ئەندامەکانیشی هەموویان لەگەڵ خۆی دەبات، بەڵام ئەگەر لێرەوە ئینسان تێکچوو، هەموو شتێکی لێ تێك دەچێ.

جارێك لەساڵی: (١٩٩٨)ز دا لە کەشتییەکدا سوار بووبووین، لەنێوان: دوورگەی (ماڵتا) و شاری (بنغازیی)دا، شەو بوو، شەپۆلی زۆر گەورە گەورە دەهاتن، چوومە لای کابرای کەشتییوان، گوتم: مەترسیی ئەو بایە، تا چەندە؟ ئاماژەی کرد بۆ کۆمپیوتەرێك و گوتی: ئا ئەوە دەبینی؟

گوتم: بەڵێ.

گوتی: تاکو ئەوەمان لێ تێك نەچێ، زۆر خەتەر نیە.

گوتم: ئەوە چییە؟

گوتی: ئەوە ئەو کۆمپیوتەرەیە، کە ڕێمان پێشان دەدات و هەرکات وەستا، ئەو کاتە ئێمە نازانین بۆ کوێ دەچین!

ئنجا نیازساغیی (إخلاص)، ئەو قیبلەنومایەیە، کە ڕێڕەو (إتجاه)ت بۆ دیاریی دەکاو، ئەگەر دڵت بەخواوە پەیوەست بێ، ڕێت لێ ون نابێ، بۆیەش کاتێك کەسێك دەبینم لاڕێ (منحرف) دەبێ، هەرکەسێك بێ، خەڵکی ئیسلامیی بێ، یان هی دیکە بێ، بە تەصەووری خۆم، نیشانەی پرسیار دەخەمە سەر نیەت و دڵەکەی، چونکە دەڵێم: ئەگەر لەدڵەوە لەگەڵ خوا ڕاست بکا، ڕێ دەردەکات و سەری لێ ناشێوێ، چونکە خوا فەرموویەتی:

﴿ وَالَّذِينَ جَاهَدُوا فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا ﴾ العنكبوت: ٦٩.

واتە: ئەوانەی لە پێناوی ئێمەدا تێبکۆشن، ڕێبازەکانی خۆمانیان نیشان دەدەین و، بەرەو خۆمان پەلکێشیان دەکەین.

خوای پەروەردگار بە لوتفە لەگەڵ بەندەی خۆیدا، بەشەرتێك دڵەكەی لەگەڵ خوادا ڕاست و ساغ بێ.

ئنجا ئێمە، كە باسی كاری سیاسیی دەكەین، پێم وایە هەڵەی سیاسیی، پێش ئەوەی بیگێڕیەوە بۆ ناهۆشیاریی سیاسیی، بەنسبەت خەڵكی مسوڵمانەوە، دەبێ بیگێڕیەوە بۆ دڵ و دەروونەكەی، ڕەنگە لەوێوە تەواو نەبێ و، شەیتان فێڵی لێ كردبێ، قیبلەنومایەكەی تێك چووبێ، بۆیە ڕێڕەوەكەی لێ تێك چووەو، نازانێ بەرەو كوێ دەچێ!

## ٨) ئامانج بەرزیی (سمو الغاية):

خوا «سبحانه وتعالى» دەفەرموێ:

﴿ تِلْكَ ٱلدَّارُ ٱلْءَاخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فَسَادًا ۚ وَٱلْعَٰقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴿٨٣﴾ ﴾ القصص: ٨٣.

واتە: ئەم مەنزڵگای دوارِۆژە، تەنیا بۆ كەسانێكی دادەنێین، كە بەرزییان ناوێ لە زەویداو، خراپەكارییان ناوێ، (واتە: بۆئەوە نایانەوێ حوكمڕان و دەسەڵاتداربن، تاكو خۆیان بەسەر خەڵكدا فەرز بكەن و، خراپەكاریی بكەن لە زەوی دا)، سەرەنجامیش بۆ پارێزكارانە.

واتە: مەنزڵگای دوارِۆژ، خوا تایبەتی دەكات بە پارێزكارانەوە، كە بەهەشتە.

ئەمەش ئەوەی لێ وەردەگیرێ: كە ئەگەر ئامانجمان بەرز بوو، مەبەستمان پاك و چاك بوو، بە تەئكید هیدایەتی خواو، تەوفیقی خواو یارمەتیی خوا، لە ئێمەوە نزیكتر دەبێ.

## ٩) بوێریی و ئـازایەتیی (الجرأة والشجـاعـة):

خوا (تبارك وتعالى) لەبـارەی بوێریی و دلێریی و ئـازایەتیی بـڕوادارانی خۆشویستراویەوە، فەرموویەتی:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَن يَرۡتَدَّ مِنكُمۡ عَن دِينِهِۦ فَسَوۡفَ يَأۡتِي ٱللَّهُ بِقَوۡمٖ يُحِبُّهُمۡ وَيُحِبُّونَهُۥٓ أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ يُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوۡمَةَ لَآئِمٖ ﴾ المائدة: ٥٤.

واتە: ئەی بڕوادارینە! هەرکامێکتان لەئایینەکەی پاشگەز بێتەوە (خوا پەکی ناکەوێ و) لەمەودوا کۆمەڵێك دێنێ: خۆشیدەوێن و خۆشیان دەوێ و، لەسەر بڕواداران نەرم و نیان و میهرەبان و، لەسەر بێبڕوایان (لەحاڵەتی جەنگدا) زبرو توندن و، لەڕێی خوادا تێدەکۆشن و، لەلۆمەی سەرکۆنەکاران بێباکن...

بەڵێ، بێ باکیی و نەترسان لە لۆمەی ناهەقی خەڵك، لە ڕەخنەو توانج و پلاری خەڵك، ڕەوشت و ئاکارێکی سیاسیی بنەڕەتیی بەرزو پەسندە، چونکە: زۆر کەس لەوەدا کاری سیاسیی لێ تێك دەچێ، کە تەماشا دەکات: خەڵك دەڵێ چی؟ گوێی هەڵخستوە، داخۆ خەڵك دەڵێ چی؟ ئایا ئەگەر وا بکەم، خەڵك لێم ڕازی دەبن؟ ئەگەر وا بکەم دەنگم پێ دەدەن؟ ئایا ئەگەر وا نەکەم، گلەییم لێدەکەن؟! کە ئەمە زۆر هەڵەیە، تۆ دەبێ هێندە بوێریی و ئازایەتییت هەبێ، کە ئایین و بەرنامەی خۆت بەشانازییەوە بخەیە ڕوو و، بەپێی تواناشت جێبەجێی بکەی.

سەرەتا دەبێ تۆ مەبدەئو پرەنسیپەکانی خۆت چاك بزانی و، لەبەرنامەو ڕێیەکەی خۆتدا بەرچاو ڕوون بی، ئنجا ڕێی خۆت بگرە بە لێزانیی و، کارامەیی، بەڵێ، دڵی خەڵك ڕابگرە، بەڵام ڕێ لەخۆت تێك مەدە، بۆ ڕازیی کردنی خەڵك، چونکە ئەو کاتە خواش لە خۆت تووڕە دەکەی و، خەڵکەکەش هەر لێت تووڕە دەبێتەوەو دەڵێن: نەتزانی!

بۆیەش پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پەنای بەخوا گرتوە، لە دوو سیفەتی زۆر خراپ و فەرموویەتی:

(أللهم إني أعوذ بك مِنَ الْجُبْنِ وَالْبُخْلِ)، رواه البخاري: ٦٣٦٥.

واتە: ئەی خوایە! پەنا بەتۆ دەگرم لە ترسنۆکیی و لە چرووکیی.



ترسنۆکیی بریتیە لە نەبەخشینی ڕووح، لە کاتێکدا پێویست بکات و، چرووکییش بریتیە لە نەبەخشینی ماڵ و سامان، هەردووکیان هەر نەبەخشینن، هەروەك بەخشندەیی و ئازایەتییش، پێکەوەن، ئەغلەب وایە، هەرکەس سەخیی بێ، ئازاشەو هەرکەسیش چرووك بێ، ترسنۆکیشە، پێکەوەن، سیفەتە خراپەکان بەزۆریی پێکەوەدن و، سیفەتە چاکەکانیش بەزۆریی پێکەوە دەبن.

## ١٠) ڕوونیی و ڕاشکاویی (الوضوح والصراحة):

خوای تاك و پاك فەرموویەتی:

﴿ قُلْ هَٰذِهِۦ سَبِيلِىٓ أَدْعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِى... ﴾ يوسف: ١٠٨.

واتە: بڵێ: ئەمە ڕێبازمە: خۆم و ئەوانەی شوێنم کەوتوون، لەبەر ڕۆشناییدا بانگەواز بۆلای خوا دەکەین.

بەڕێزان! ئینسانی سیاسیی، کە بیەوێ سیاسەتێکی ڕەوشت بەرزانە بکا، دەبێ ڕوون و ڕاشکاو بێ، دەبێ بێ پەردە بێ و، تەم و مژاویی و پێچراوەو بەقۆرت و پێچ نەبێ، کە خەڵك سەری لێ دەرنەکات، کاتێك قسە دەکەی، قسەی ڕوون بۆ خەڵك بکە، هەڵوێست دەنوێنی، هەڵوێستی ڕوونت هەبێ، چونکە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) وابوون، ئەوەتا خوا بە پێغەمبەری خاتەم (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ:

﴿ قُلۡ هَٰذِهِۦ سَبِيلِيٓ أَدۡعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِي... ﴾ یوسف: ١٠٨.

(علی بصیرة) لەبەر ڕۆشناییدا، یانی: کە خەڵك بزانن بۆ کوێیان دەبەم و، خەڵك بزانن چییان پێ دەڵێم و، چیم لێیان دەوێ و، چیم پێ چاکەو، چیم پێ خراپە!



پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هەر کاتێ زانیبی هاوەڵانی (خوا لێیان ڕازی بێ) ئیشکالێك، گرێ و گۆتاڵێکیان بۆ دروست بووە، یەکسەر بۆی ڕوون کردوونەوە.

بۆ وێنە: لە (صحیح البخاري: ٣١٤٧، وصحیح مسلم: ١٠٥٩) دا هاتوە، کە دوای جەنگی فەتحی مەککەو، جەنگی حونەین، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەخششی دا بە هەندێك، لە سەرۆك عەشیرەتەکان، بۆ ئەوەی دڵیان بۆ ئیمان هێنان نەرم بێ و سەرنجیان ڕابکێشێ، ئنجا بەهۆی ئەوەوە ئەنصارییەکان مشت و مڕیان لە بەیندا پەیدا بوو، گوتیان: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەهۆی خزمەکانیەوە ئێمەی لەبیرچووەو، ئێمە شایستەتر بووین بەو دیاریی و بەخشینانە! پێغەمبەریش (صلی الله علیه

وسلم) کۆی کردنەوە وتاری بۆدان، بەسەرهاتەکە هەمووی باس ناکەم، لەنێو قسەکانیدا فەرمووی: ئایا ئەوە ئەنصارییەکان! هەر بەوەندە دڵتان گۆڕا، کە هەندێك لە چڵکی دنیا، ویستم ئەوانی پێ سەرنج ڕابکێشم، ئێوەشم حەواڵەی ئیمانەکەتان کرد، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! وامانزانی بە یەکجاریی ماڵەکەشت دێنیەوە ئێرە! فەرمووی: بەڵکو ژیانم لەگەڵ ئێوەیەو، مردنم لەگەڵ ئێوەیە.

کاتێك زانی: شتیان لە دڵدا پەیدا بووە، یەکسەر بۆی ڕوون کردنەوەو ئیشکالەکەی بۆ ڕەواندنەوە، ئەوە کارێکی زۆر گرنگە، ئێمە کە زانیمان برایەك، خوشکێك، کەسێك، هی خۆمان، هی غەیری خۆمان، بە هەڵە لێمان تێدەگا، با ئەوەندەی بتوانین، بۆی ڕوونبکەینەوە، کە حەقیقەتی وەزعەکە، چۆنەو چییە!



## ١١) وەفـاداریی (الوفاء):

مەبەستمان لە وەفاداریی (وفاء) پابەندییە بە بەڵێن (وعد)و پەیمان (عهد)ەوە، وەفاداریی زۆر دەقی لەسەرن، کە دەبێ بەڵێن و پەیمان پارێزگارییان لێ بکرێ، بۆ وێنە:

١- ﴿ وَأَوۡفُواْ بِٱلۡعَهۡدِۖ إِنَّ ٱلۡعَهۡدَ كَانَ مَسۡـُٔولٗا ﴾ الإسراء: ٣٤.

واتە: پابەندبن بە پەیمانەوە، بێگومان پەیمان لێپرسینەوەی لەسەرە.

٢- ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَوۡفُواْ بِٱلۡعُقُودِۚ ﴾ المائدة: ١.

واتە: ئەی بڕوادارینە! گرێبەستان بەرنەسەر (پێیانەوە پابەند بن).

٣- پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم)، پەیمان شکێنیی و بێ بەڵێنیی، بە یەکێك لە سێ نیشانەکانی بابای دەغەڵ داناوە، وەك دەفەرموێ:

(آيةُ المنافِقِ ثَلَاثٌ: إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ، وَإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ، وَإِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ - وفِي روايةٍ لِمُسْلِمٍ: وَإِنْ صَلَّىَ وَصَامَ وَزَعَمَ أَنَّهُ مُسْلِمٌ-) رواه البخاري:٣٤، ومسلم:٥٨.

واتە: مونافیق سێ نیشانەی هەن: هەرکات قسەی کرد درۆ بکات و، هەرکات گفتیدا بیشکێنێ و، هەرکات سپاردەی پێ سپێردراو بەئەمیندار دانرا، خیانەت بکات.

لەڕیواتێکی (مسلم)دا هاتوە: هەرچەندە نوێژبکات و ڕۆژووش بگرێ و، گومانیشی وابێ، کە مسوڵمانە!

بەڵێ، مرۆڤی سیاسیی ئیماندار، دەبێ خاوەن بەڵێن بێ، خاوەن پەیمان بێ، ڕاست و ساغ بێ لەگەڵ خەڵکدا.

## ١٢) ئەمانەتپارێزیی (الأمـانة):

لەوبارەوەش ئایەتی کتێبی بەپێزی خواو، دەقی سوننەتی پێغەمبەری بەڕێزی خوا «صلى الله عليه وسلم» زۆرن، بۆ نموونە:

١- ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤَدُّواْ ٱلْأَمَـٰنَـٰتِ إِلَىٰٓ أَهْلِهَا ﴾ النساء: ٥٨.

واتە: خوا فەرمانتان پێدەکات، کە سپاردەکان بەخەڵکی (شایستەی) خۆیان بسپێرن...

بەڵێ، خەڵك لەسەری فەرزە، ئەمانەتی حوكمڕانیی بپارێزێ و، بە كەسانێكی شایستەی بسپێرێ، چونكە لێرەدا مەبەست لە (أمانات) كاروباری حوكمڕانیی و بەرپرسیارێتییە، وەك لەكتێبی دووەمی: مەوسووعەی (ئیسلام و دەوڵەتداریی) بەدرێژیی باسمان كردوە.

٢- هەروەها واجبی بەرپرسەكانیشە، ئەوانیش ئەوەی، كە لەبەردەستیاندا هەیە، ئەو ئەمانەتی حوكمڕانییەی، كە دەكەوێتە بەردەستیان، بە خەڵكی شایستەی بسپێرن، وەك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی:

(مَن اسْتَعمَلَ رَجُلاً مِنْ عِصابَةٍ وَفِي تِلْكَ العِصَابَة مَنْ هُوَ أَرْضَى لِلَّهِ مِنْهُ، فَقَدْ خَانَ اللَّهَ وَخَانَ رَسُولَهُ وَخَانَ الْمُؤْمِنِينَ). رواه الحاكم في مستدركه: (١٠٤/٤)، والطبراني في الكبير: (١١٤/١١)، عن ابن عباس.

واتە: هەر كەسێك، كەسێك بكاتە بەرپرس بەسەر كۆمەڵێكەوە، كە لەو باشتریان تێدابێ و زیاتر جێی ڕەزامەندیی خواو بێ، ئەوە خیانەتی كردوە بە خواو بە پێغەمبەری خواو، بە بڕواداران.

٣- هەروەها پێغەمبەری ڕەوشت مەزن فەرموویەتی: (إذا ضُيعَتِ الأَمانَةُ فَانْتَظِر السَّاعَةَ، قَالَ: كَيفَ إِضَاعَتُها يا رَسولَ اللَّه؟ قال: إِذَا أُسْنِدَ الأَمْرُ إِلى غَيرِ أَهْلِهِ فَانْتَظِرِ السَّاعَة)، رواه البخاري: ٥٩.

واتە: هەركات سپاردە زایەكرا، چاوەڕێی ئاخیر زەمان بكە، (هاوەڵێك) گوتی: زایەكردنی (سپاردە) چۆنە؟!

فەرمووی: هەركات كاروبار بە جگە لەخەڵكی شایستەی سپێردرا، چاوەڕێی كۆتایی (ئەو كارە) بكە -كە بەخەڵكی ناشایستە سپێردراوە-.

هەڵبەتە ئەمانەت پارێزیی چەمکەکەی زۆر فراوانە، بۆ وێنە: کەسێك کە دەبێتە بەرپرسی وڵاتێك، سەروەت و سامانی ئەو وڵاتەی دەکەوێتە بەردەست، ئەمرو نەهی، عەرزو بەرزی، لایەنی مەعنەویی، لایەنی ماددیی...هتد، ئەوە هەمووی ئەمانەتە لەبەر دەستیداو، دەبێ ئەو ئەمانەتە بپارێزێ، ئەگەر بیەوێ یەکێك لە ڕەوشتە بنەڕەتییە بەرزەکانی کاری سیاسیی، کە لە ئیسلامدا، بە مەرج گیراون، لەخۆیدا بهێنێتە دی.

بەڕێـــزان!

ئەو دوازدە ڕەوشتە سیاسییە بنەڕەتییەی پێشوو، گشتیی بوون، بەڵام ئایا كار بەوەندە تەواو دەبێ؟ نەخێر، بەڵكو بەرپرسان بەتایبەت، دەبێ كۆمەڵێك ڕەوشت و بەهای بەرزیان هەبن، كە ئێمە دوازدە (١٢)شمان لەوان هێناون:

## ١) بـەزەیی و پـەرۆش:

پێشتر هێنامان كە: (مصطفى لطفي المنفلوطي) گوتوویەتی: (كەمتر وا هەبووە، خەڵكی سیاسیی بەڕەحم بێ)، بەڵكو دوایی باسی دەكەم، كە میكافیلیی دەڵێ: (سیاسیی و حوكمڕان، نابێ ڕەحم هەربزانێ، ئەگەر ڕەحم و شەفەقەت بزانێ، سیاسەتی بۆ ناكرێ!)، بەڵام بێگومان ئەوە سیاسەتی شەیطانییەو، سیاسەتی ڕەببانیی دەڵێ: ئەگەر بەڕەحم و سۆزو شەفەقەت نەبی، شایستەی حوكمڕانیی و بەرپرسیارێتی، نی!





با سەرنجی چەند دەقێك بدەین:

١- خوا بە پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:

﴿ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ ۖ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّوا۟ مِنْ حَوْلِكَ ۖ ﴾ آل عمران: ١٥٩.

واتە: بەهۆی ڕەحمەتی خواوە بۆیان نەرم و نیان بووی و، ئەگەر قسە ڕەق و دڵ ڕەق بووای، لە دەورت دەپڕژان.

کێ لە دەوری کێ دەپرژا؟ بێگومان هاوەڵان (رضي الله عنهم) لە دەوری پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەپرژان.

یانی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کە: ﴿رَحۡمَةً لِّلۡعَٰلَمِينَ﴾ و سەروەری پێغەمبەرانە و، هاوەڵانیش، کە گەورەترین مرۆڤ و چاکترین مرۆڤ بوون لەدوای پێغەمبەران، کەچی ئەو چاکترین مرۆڤانە، لە دەوری ئەو سەروەری پێغەمبەرانە دەپرژان، ئەگەر قسە رەق و دڵرەق بووایە!

ئەدی من و تۆی داماو، ئەگەر بە گفت و لفتی شیرین و، بە سەرو رووی خۆش و، بە رەحم و شەفەقەتەوە نەبێ، چۆن دەتوانین خەڵك بەدەوری خۆمانەوە بئاڵێنین و بیانهێڵینەوە؟!

٢- پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: (إن شرَّ الرِّعاءِ الحُطمة). صحيح مسلم: ١٨٣٠. ٢٦٦

واتە: خراپترینی چاودێران و بەرپرسان، ئەوانەن کە خەڵك تێکدەشکێنن.

ئنجا خەڵك تێکشکاندن، چ لەرووی جەستەییەوە تێکیان بشکێنن، چ لە رووی ماڵ و سامانەوە، چ لە رووی نەفسییەوە، چ لە رووی کۆمەڵایەتییەوە، لەهەر روویەکەوەو هەر جۆرە شکاندنێك بیانشکێنێ، ئەو جۆرە بەرپرسانە، خراپترینی بەرپرسانن لە تەرازووی خواو پێغەمبەرەکەی «صلى الله عليه وسلم»دا.

## ٢) نـەرم و نیـانیی:

١- خوای تاك و پاك فەرموویەتی: ﴿أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ المائدة: ٥٤.

واتە: بڕوادارانی خۆشەویستراوی خوا، لەسەر بڕواداران میهرەبان و نەرم و نیانن.

٢- پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: (أَللَّهم من وَلِيَ من أمتي شيئاً فَرَفق بهم، فارفُقْ به، وَمن شَقَّ عليهم، فَشُقَّ عليه) رواه أحمد: ٢٦٢٤٢، وشعيب الأرناؤط، وقال: صحيح على شرط مسلم.

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دوعای کردوە: ئەی خوایە! هەر کەسێك کارێکی ئۆممەتی منی کەوتە بەردەست و، لەگەڵیان نەرم بوو، تۆش لەگەڵی نەرم و میهرەبان بەو، ئەگەر لەگەڵیان ڕەق و زبر بوو، تۆش لەگەڵی زبرو توند بە.

بەدڵنیایی دوعای پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) قبووڵە.

## ٣) لێبوردەیی و چاوپۆشیی:

١- خوا "عز وجل" فەرموویەتی: ﴿وَلَا يَأْتَلِ أُوْلُواْ ٱلْفَضْلِ مِنكُمْ وَٱلسَّعَةِ أَن يُؤْتُوٓاْ أُوْلِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينَ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ وَلْيَعْفُواْ وَلْيَصْفَحُوٓاْ ۗ أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٢﴾﴾ النور: ٢٢.

واتە: با خاوەن چاکەو دەسترۆیشتووەکانتان، سوێند نەخۆن لەسەر هاوکاریی نەکردنی کەسانی خزم و نەدارو کۆچکەر لەڕێی خوادا، با

لێیان ببوورن و چاوپۆشیی بکەن، ئایا حەزناکەن خوا لێتان ببووریٚ؟ خواش لێبوردەی میهرەبانە.

هۆی دابەزینی ئەم ئایەتەش «وەك سەرجەم تەفسیرەکان هێناویانە» ئەوەبووە، کە (أبو بكر الصديق) خوا لێی ڕازی بێ، پاش بەشداریی کردنی (مِسطح بن أثاثة)ی خزمی، لە بوختان پێکردنی عائیشەی کچیدا، (خوا لێیان ڕازی بێ)، سوێند دەخوات، کە چیدیکە هاوکاریی نەکات.

بەڵام خوای لێبوردەی بەبەزەیی، ئامۆژگاریی ئەبوو بەکر دەکات، کە لەقسەو سوێندەکەی ژیوان بێتەوەو، بگەڕێتەوە سەر چاکەو هاوکارییەکەی، ئەویش ئامۆژگاریی و فەرمانی خوا جێ بەجێ دەکات و بۆشی زیاد دەکات.[1]



٢- پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (أَللَّهم إنك عفوٌ تحبُّ العفو فاْعفُ عنِّي] الترمذي: ٣٥١٣. وقال حسن صحيح.

واتە: ئەی خوایە! تۆ لێبوردەی و لێبوردنت حەز لێیە، لێم ببوورە.

بەڕێـــزان!

بەرپرسیارێتیی بەبێ چاوپۆشیی ناکرێ گوتراوە: (آلة الرئاسة سعة الصَّدر)، مرۆڤ بەبێ سینە فراوانیی و لێبوردن، بەبێ چاوپۆشیی، حوکمڕانیی بۆ ناکرێ، لەماڵەوەدا بتەوێ گەورەی خێزانەکەت بی، لەگەڕەکدا، لە دێدا، لە وڵاتدا، دەبێ لێبوردن و چاوپۆشییت هەبێ، بێگومان ئەوییش لە سنووری خۆیداو لەشوێنی خۆیدا.

---

(١) صحيح البخاري: ٣٩١٠.

## ٤) خاكیی بوون و خۆ بەكەمگریی (التواضع):

١- خـــوای باڵادەســـت و زاڵ فەرمـــوویەتـــی: ﴿ وَٱخۡفِضۡ جَنَاحَكَ لِلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾ الحجر: ٨٨.

واتە: (ئەی موحەممەد!) باڵت بۆ بڕواداران شۆڕبكە، بیانخە ژێر باڵت...

٢- پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (ما نَقَصتْ صدقة من مالٍ، وما زاد الله عبداً بعفوٍ إلاّ عِزّاً، وما تواضَعَ أَحَدٌ لِلَّهِ إلاَّ رَفَعَهُ اللَّه) مسلم: ٥٥٤.

واتە: بەخشین لەسامان كەم ناكات و، بەهۆی لێبوردنەوە خوا عیززەت و بەرزیی بۆ بەندەكەی زیاد دەكات و، هەركەس لەبەر خوا خۆی بەكەم بگرێ، خوا بەرزی دەكاتەوە.

بەڕێزان! ئەمانە ئەو ڕەوشتە ڕەببانییانەن، كە سیاسەتێكی ڕەشیدیان پێ بەڕێوە دەچێ، كە یەكێكیان بریتیە لە: خاكیی بوون و خۆ بەكەمگریی! دەچیە ئەو وڵاتە نا مسوڵمانانە، بەرپرسانیان دەبینی، حوكمڕانەكانیان دەبینی، خاكیی و خۆ بەكەمگرن، دێیەوە بۆ وڵاتی مسوڵماننشین، هەر كەسێك تۆزێك بەرپرسیارێتیی دەكەوێتە دەست، هەوایەكی فیرعەونایەتیی دەكەوێتە كەللەی، برادەر! ئەو ڕەفتارەت لەكوێ هێنا؟ ئەوە كەی ڕەوشتی مسوڵمانانە؟! تۆ كە بووی بە بەرپرس، خەڵك لەسەر ئەو كورسییەیان داناوی، بۆ ئەوەی سەرپەرشتییان بكەی، بۆ ئەوەیان دانەناوی، خۆتیان لەسەر بكەی بە فیرعەون!

## ٥) خۆڕاگریی لە بەرانبەر نەفامیی نەفامان دا:

ئەمیش یەکی دیکەیە لە ڕەوشتە سیاسییە پەسندەکانی بەرپرسان، وەك خوای بەرز فەرموویەتی:

١- ﴿ خُذِ ٱلۡعَفۡوَ وَأۡمُرۡ بِٱلۡعُرۡفِ وَأَعۡرِضۡ عَنِ ٱلۡجَٰهِلِينَ ﴾ الأعراف: ١٩٩.

واتە: ئاسانیی وەربگرەو، فەرمان بە پەسند بکەو، ڕوو لە نەفامان وەرچەرخێنە..

٢- هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلۡجَٰهِلُونَ قَالُواْ سَلَٰمًا ﴾ الفرقان: ٦٣.

واتە: (بەندە بژاردەکانی خوای بەبەزەیی) کاتێك نەفامان بیاندوێنن دەڵێن: سەلامتان لێ بێ...

٢- (أنس بن مالك) گێڕاویەتەوە، کە ڕۆژێکیان لەکاتێکدا پێغەمبەری خوا "صلى الله عليه وسلم" ماڵ و سامانێکی دابەش دەکردو، لەو حاڵەتەشدا پۆشاکێکی نەجرانیی لەبەردابوو، کە قەراغەکانی زبرو ڕەق بوون، عەرەبێکی خێڵەکیی بیابانشین، لەپشتەوە پۆشاکەکەی بەتوندیی ڕاکێشا، کە گەردنی بەهۆیەوە سوور بۆوەو، داوای هاوکاریی لێکرد... ئەویش "صلى الله عليه وسلم" ئاوڕی لێدایەوەو پێکەنیی و، فەرمانیکرد هاوکاریی بکەن...، صحيح البخاري: ٧٨٥، وصحيح مسلم: ٦٧٤.

ئینسان هەمیشە دەبێ وریابێ و، کاتێك کەسێك نەفامیی لەبەرامبەردا دەکات و بەشێوەیەکی ناشایست و بێ نەزاکەت دەیدوێنێ، دەبێ خۆڕاگر بێ و، بەدڵی گەورەو ڕەوشتی پەسندەوە مامەڵە بکات و وەك بەرانبەرەکانی نەکات و، خۆی نەخاتە تەرازووی ئەوانەوەو، خۆی لەگەڵ واندا یەکسان نەکات.

## ٦) فێرکردن و ڕێنمایی کردن:

ئەمیش ڕەوشتێکی دیکەی سیاسیی بەرزو پەسندی پێویستە لەسەر بەرپرسان، بە بەڵگەی ئەوە، کە خوای کاربەجێ و زانا، ئەو خەسڵەتەی لەچوار ئایەتی قورئانی بەرزو بەپێزدا، کردۆتە ئەرکی پێغەمبەری کۆتایی خۆی (محمد) (صلی الله علیه وسلم) وەك فەرموویەتی:

١- ﴿يَتْلُواْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَيُزَكِّيهِمْ ﴾ (البقرة: ١٢٩ و ١٥٣، آل عمران: ١٦٤، الجمعة:٣).

واتە: ئایەتەکانیتان بەسەردا دەخوێنێتەوە و کتێب (یاساکانی شەریعەت) و حیکمەت (ڕەوشت و بەها بەرزەکان)یان فێردەکات و تەزکیەیان دەکات...

٢- هەروەها لەوبارەوە دەقی سوننەتیش زۆرن، بۆ نموونە: (عن عمر بن أبي سلمة قال: كنت غلاماً في حَجْر رسول الله، وكانت يدي تطيش في الصفحة، فقال لي رسول الله: ياغلامُ ! سَمِّ الله، وكلْ بيمينيك، وكل مما يليك) البخاري:٥٣٧٦، ومسلم: ٢٠٢٢.

واتە: (عمر بن أبـي سَلَمَة) دەڵێ: من کوڕێکی تازە پێگەیشتوو بووم، لەماڵ و لەژێر چاودێریی پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم)، عادەتم وابوو، لەکاتی نانخواردندا، دەستم لەدەفرەکەدا دەگێڕا، ئەویش فەرمووی: ڕۆڵە! ناوی خوا بێنەو، بەدەستی ڕاست بخۆو، لەپێش خۆتەوە بخۆ.

بەڵێ، بەرپرس و حوکمڕانی ڕەشید، یەکێك لە ڕەوشتە بەرزەکانی ئەوەیە، کە دەبێ خەڵك فێر بکا، خەڵك ڕێنمایی بکا، بەرچاویان ڕوون بکاتەوە، جاری دیکەش گوتوومە: زۆربەی بەرپرسانی بڕیار بەدەستی ئەم وڵاتە، ئەوە بیست و حەوت (٢٧) ساڵە، گوێ بیست نەبووم خەڵك ڕێنمایی بکەن[١]، نەك هەر بەلای خوادا، بەلای دینداریی و خواپەرستییدا، بەڵکو بۆ دنیادارییش ڕێنماییان بکەن !

هەر لەو خەڵکە گەڕاون، ئەو گەنج و لاوانە چی دەکەن: مەیخۆریی، قومارکردن...هتد، ئایا وڵات بەڕێوە بردن و خەڵك سەرپەرشتییکردن ئاوا دەبێ؟! نەخێر، بەڵکو بەرپرسان دەبێ خەڵك ڕێنمایی بکەن، پەروەردەیان بکەن و، چاکەیان فێر بکەن و، لە هەموو ڕوویەکەوە هەوڵبدەن گەشەیان پێ بدەن.

## ٧) چاوپێداگێڕان و پشکنینی حاڵ و باڵی خەڵک:

ئەمیش یەکی دیکەیە لە ڕەوشتە سیاسییە بەرزو پەسندەکانی بەرپرس و حوکمڕانان و، بەڵگەی قورئان و سوننەتیش لەوبارەوە زۆرن، بۆ وێنە:

---

(١) ئەگەر بووبێش من گوێ بیستی نەبووم و، پێم نەزانیوە.

١- خوا "سبحانه وتعالى" له سوورەتی (النمل) لەباسی (داود و سليمان)دا "عليهما السلام" دوای ئەوەی باسی سوپایەکەی سولەیمان دەکات، کە لە جند و مرۆڤ و باڵندان پێکهاتوە:

﴿ وَحُشِرَ لِسُلَيْمَـٰنَ جُنُودُهُۥ مِنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ وَٱلطَّيْرِ فَهُمْ يُوزَعُونَ ﴿١٧﴾ ﴾ النمل.

ئەوجار باسی پشکنینی سولەیمان (عليه السلام) بۆ سوپایەکەی دەکات:

﴿وَتَفَقَّدَ ٱلطَّيْرَ فَقَالَ مَا لِىَ لَآ أَرَى ٱلْهُدْهُدَ أَمْ كَانَ مِنَ ٱلْغَآئِبِينَ ﴿٢٠﴾﴾ النمل.





واتە: باڵندەکانی بەسەر کردنەوە، فەرمووی: ئەوە بۆچی (هود هود) نابینم؟ واتە: کە نایبینم، ئایا بە عوزرێك، پاساوێك لێرە ئامادە نیە، یاخود کەمتەرخەمیی کردوە؟! دوایی باس دەکا، کە دەبێ بەپێی تاوانەکەی سزای بدا.

یانی: سولەیمان (عليه الصلاة والسلام) تەنانەت باڵندەیەکی لێ ون نەبووەو، ئیهمال نەکردوە، کە مشووری لێ نەخوات و ئاگاداری لێی نەبێ!.

٢- پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) عادەتی وابوو کە نوێژی بەیانیانی دەکرد، یان ئەگەر کەسێك لە هاوەڵانی (خوا لێیان ڕازی بێ) دیار نەبووایە لێی دەپرسین: فڵان کەس بۆ دیار نیە؟ ئەگەر لە سەفەر بووایە، یان نەخۆشیی هەبووایە، لێی دەپێچایەوە[1].

---

(١) بڕوانە: (رياض الصالحين) {٧٠- باب فضل الإختلاط بالناس...} ص٢٤٨، کە (النووي) گوتوویەتی: (إعلم أن الإختلاط بالناس على الوجه الذي ذكرته،

٣- نەك هەر ئەوەندە، بەڵكو پێویستە بەرپرس لە بازاڕ بپێچێتەوە، لە کەسابەت و کاروباری خەڵك، لە دوکانداران، لەو بارەوەش ئەم فەرموودەیە هەیە:

ئەبو هورەیرە دەگێڕێتەوە دەڵێ: ڕۆژێك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) چووە بازاڕ، کابرایەك کۆگەنمێکی هەڵدابوویەوە، پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) دەستی بردە نێو، گەنمی تەڕی دەرهێنا، فەرمووی: ئەوە بۆچی وایە؟ گوتی: ئەوە باران لێیداوەو تەڕ بووە،

فەرمووی: ئەوەی تەڕ بووە، بۆچی نەتخستۆتە دەرێ، بۆ ئەوەی کڕیار ببیبینێ؟ ئنجا لەوبارەوە فەرمووی:

(مَنْ غشَّ فَلَيْسَ مِنّا)، رواه مسلم: ١٠٢.

واتە: هەرکەسێك غەش و فێڵ بکا، لە ئێمە نیە.

واتە: لەو ڕەوشتەدا لە ئێمە نیە، نەك هەر کەسێك فێڵ و غەشێکی کرد، بەیەکجاریی مسوڵمان نەمابێ! یانی: لەو ڕەوشتەدا لە ئێمە نیە، وەك ئێمە نیە، چونکە ئێمەی ئەهلی ئیسلام، غەش و فێڵ ناکەین، مەبەستم ئەوەیە، کە بەرپرس، کەسێك کە کاروبارێك لەنێو مسوڵماناندا بە ئەستۆوە دەگرێ، پێویستە لە کاروباریان بکۆڵێتەوەو، پشکنینی هەبێ و، بەدواداچوونی هەبێ.

هو المختار الذي كان عليه رسول الله «صلى الله عليه وسلم» وسائر الأنبياء «صلوات الله وسلامه عليهم...»).

٨) سووربوون لەسەر پاراستنی ماڵ و سامانی گشتی:

ئەمیش ڕەوشتێکی سیاسیی بەرزی دیکەی ئەو کەسانەیە، کاتێك بەرپرسیارێتییان دەکەوێتە ئەستۆ: ماڵ و سامانی گشتی بە هی خەڵك بزانن و، بە هی خۆیانی نەزانن! تەراتێنی تێدا بکەن!

با لەوبارەوە سەرنجی دوو نموونە، لە ئایەتەکانی قورئان و دەقەکانی سوننەت بدەین:

١- خوای پەروەردگار لە سووڕەتی (الشعرا)دا، لەسەر زمانی (صالح) پێغەمبەر "علیه الصلاة والسلام" بە گەلەکەی دەفەرمویّ:

٢٧٥ ﴿ وَلَا تُطِيعُوٓاْ أَمْرَ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴿١٥١﴾ ٱلَّذِينَ يُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ ﴿١٥٢﴾ ﴾ الشعراء: ١٥١ - ١٥٢.

واتە: فەرمانبەریی فەرمانی زێدەڕۆیی کاران مەکەن، ئەوانەی، کە خراپە لە زەویدا دەکەن و چاکسازیی ناکەن.

واتە: بەرپرسانی زێدەڕۆییکاری تێکدەرو خراپەکار، نابێ فەرمانبەرییان بکرێ، ئنجا مەبەستم لێرەدا ئەوەیە، کە کەسانێك ڕازاوە نەبن بەو ڕەوشتە سیاسییە بەرزانەی لە بەرپرساندا، بەمەرج گیراون، ڕەوایەتیی حوکمڕانیی لەدەست دەدەن، چونکە ڕازاوە نین بەو ڕەوشتانەی، کە خوای پەروەردگارو پێغەمبەری سەرودر (صلی الله علیه وسلم) بە مەرجیان گرتوون، بۆ کەسانێك کە سەرپەرشتیی کاروباری کۆمەڵگاو خەڵك بەئەستۆوە دەگرن.

٢- فەرمایشتێکی پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) هەیە، کە زۆر لە بەرپرسانی ئەم ڕۆژگارە، بەتایبەت لە عێراق و هەرێمی کوردستاندا، دەگرێتەوە، کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ: (من أخون الخيانة: تجارة الوالي في عَمَلِهِ) رواه الطبراني في مُسند الشاميين، وحَسَّنه: ١٣٢٣.

واتە: گەورەترین جۆری خیانەت، بازرگانیی کردنی بەرپرسە لە کارەکەیدا.

(والــي) ئەو کاتە، وەك ســەرۆك کۆمــاری ئێســتا وابووە، بەرپرسیاریەتییەکی گەورەی بە دەستەوە بووە، ئنجا مەبەست ئەوەیە، کە هەر کاتێك بابای بەرپرس لەپەنای کارە ئیدارییەکەیداو، بەهۆی حوکمڕانیی و بەرپرسیارێتییەکەیەوە، مامەڵەو بازرگانیی کرد، ئەوە خراپترین جۆری خیانەتی کردوە! ٢٧٦

(ابن خلدون) ڕەحمەتی خوای لێ بێ، لە (المقدمة)ی خۆیدا، دەڵێ: {هەر کاتێ بەرپرس و حوکمڕانان بوونە بازرگان، وڵات کاول دەبێ}، چونکە بواری کەسابەت بۆ کەس ناهێڵێ و هەموو سوڵتەی سیاسیی خۆی بەکاردێنێ، تاکو هەرچی بازرگانیی و سەوداو مامەڵەیە، بۆخۆی قۆرخی بکات، وەك ئێستا لە عێراق و هەرێمی کوردستانیش، ئەو حاڵەتە زۆر بەزەقیی دەبینرێ!

## ٩) تێکەڵیی لەگەڵ خەڵک و خۆ لێ نەشاردنەوەیان:

ئەمیش یەکی دیکەیە، لە ڕەوشتە سیاسییە گرنگەکانی بەرپرسان، با لەوبارەوە ئایەتێك و فەرمووددەیەك بە نموونە بێنینەوە، وەك بەڵگەی شەرعیی:

١- پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەوەندە تێکەڵ بووە، لەگەڵ خەڵك و لەگەڵ هاوەڵاندا، خوا (سبحانه وتعالى) بە پێویستی زانیوە هۆشداریی بداتە مسوڵمانان:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَدْخُلُوا۟ بُيُوتَ ٱلنَّبِىِّ إِلَّآ أَن يُؤْذَنَ لَكُمْ إِلَىٰ طَعَامٍ غَيْرَ نَـٰظِرِينَ إِنَىٰهُ وَلَـٰكِنْ إِذَا دُعِيتُمْ فَٱدْخُلُوا۟ فَإِذَا طَعِمْتُمْ فَٱنتَشِرُوا۟ وَلَا مُسْتَـْٔنِسِينَ لِحَدِيثٍ ۚ إِنَّ ذَٰلِكُمْ كَانَ يُؤْذِى ٱلنَّبِىَّ فَيَسْتَحْىِۦ مِنكُمْ .. ﴾ الأحزاب: ٥٣ .

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! مەچنە ماڵەکانی پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) مەگەر مۆڵەتتان بدرێ، کە بۆ خواردنێك دەعوەت دەکرێن، بۆ خواردنەکەش، پێگەیشتن و چاوەڕێی پێگەیشتن کوڵانی مەکەن، (ئەگەر خواردنەکە پێگەیشتبوو). هەرکات بانگکران بچنە ژوورو، دوای خواردنیشتان، بڵاوەی لێبکەن و بەقسانەوە مەخافڵێن، ئا ئەوە پێغەمبەر ئازار دەدات و شەرمیشتان لێ دەکات، پێتان بڵێ....

دیارە ماڵی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وابووە، کاتێك زانیویانە لە ماڵی یەکێك لە هاوسەرەکانیدا خواردنێك هەیە، خەڵکێك

چوون، بۆیە خوا فەرموویەتی: لەناوەختداو بەبێ لە دەرگادان و مۆڵەت وەرگرتن، مەچن.

ماڵەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەرگایان هەر ئاوەڵاو کراوە بووەو خەڵك چووە، نەك وەك ئەو بەرپرسانەی ئێستا، بە چەند بازگەو پرسگەیەکدا، ئەگەر خەڵك بیانگاتێ، پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم)، کە لەسەر ئاستی بەشەرییەت، هەڵبژاردەیەو ئەو کاتەش «پێگەو پایەو مەقامی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە ڕووی مەعنەویی و خوایی، هەر خوا دەزانێ» بەڵام لەبواری دنیایەتییشدا، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، چ پلەو پایەیەکی بەرزی هەبووە: دەوڵەتی فارس و ڕۆم لە سوپاو دەوڵەتەکەی ترساون، کەچی هەمیشە دەرگای ماڵەکانی لەسەر پشت بووە، ئنجا وادیارە کەسانێکیش ڕەچاوی هەندێك ئەدەبی تایبەتییان نەکردوە، کە بۆ هەر ماڵێك پێویستە ڕەچاوبکرێن. بۆ وێنە: کە بەبێ ئاگادارکردنەوەو مۆڵەت وەرگرتن نەچنە ژوورێ و، ئیسراحەتیان لێ تێك نەدرێ و...هتد، بۆیە خوای کارزان و پەنهانزان، بەپێویستی زانیوە مسوڵمانان ئاگادار بکاتەوەو، لەوبارەوە هۆشداریی (تنبیه)یان بداتێ، تاکو پێغەمبەری خوا «صلى الله عليه وسلم»و ماڵ و حاڵ و خێزانی سەغڵەت نەکرێن! ٢٧٨

٢- پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرمایشتێکی هەیە، کە زۆر جێی سەرنجەو، ئێمە هەموومان دەبێ دەرسی لێ وەربگرین، دەفەرموێ:

(مَنْ ولاّه الله شيئاً من أمور المسلمين، فاحتجب دونه حاجتهم وخَلَّتهم وفقرهم، احتجب الله دون حاجته وخلّته وفقره، يوم القيامة) رواه أبو داود: ٢٩٤٨، والترمذي: ١٣٣٢.

واتە: هەرکەسێك، خوا کارێکی لە کاری مسوڵمانان پێ بسپێرێ و بکەوێتە دەستی، بەڵام خۆی بشارێتەوە، لەکاتی ئاتاجیی، یان نەداریی، یان گرفتێکیاندا، خوای پەروەردگاریش لە ڕۆژی دواییدا، لەکاتی پێویستیی و نەداریی و گرفتی دا، ئیهمالی دەکاو گوێی پێ نادات.

یانی: سزایەکەی ئەوەیە: کە بێگومان ئەوە زۆر سزایەکی سەخت و ترسناکە.

## ١٠) داخستنی دەرگای جاسووسیی و قسە هێنان و بردن:

بەڕێـــزان!

ئێستا ئەو حیزبانەی، کە لەم وڵاتەی ئێمەدا حوکمڕانن، مەگەر چۆن، ئەگەرنا هەموویان دەزگای سیخوڕییان هەیە، ئنجا وا دەزانن، ئێمەش هەر واین، ڕۆژێك یەکێك لە بەرپرسانی دەزگا هەواڵگرییەکان هاتبوو بۆ لام، گوتی: مامۆستا! پێم خۆشە لەگەڵ ئەو دەزگا هەواڵگرییەی ئێوەدا هاوکارییمان هەبێ، گوتم: کامە دەزگای هەواڵگریی؟

گوتی: ئێوەش هەتانە، هەموو حیزبێك هەیەتی.

گوتم: نەخێر، ئێمە نیمانە، مەگەر کەسێك بەخێری خۆی قسەیەکی خێرمان بۆ بێنێ، ئەگەرنا ئێمە نیمانە.

گوتی: ئاخر چۆن؟

گوتم: ئێمە بۆ نێو حیزب، سیقەمان بە براو خوشکانی خۆمان هەیەو، دەرگاشمان ئاوەڵایەو، دڵیشمان کراوەیە، ڕەخنەمان لێدەگرن

و قسە دەکەن، تێبینیی و سەرنج و ئامۆژگاریی...هتد، بۆ خەڵکی دیکەش ئێمە ئەو دەزگایەمان نیەو، ئێمە خۆشمان بە دەوڵەت و قەوارەی سیاسیی دانانێین و، ئەو دامەزراوانەش هی دەوڵەتن، نابێ هی حیزب و شەخس بن!

ئنجا با لەوبارەوەش، ئاماژە بەچەند فەرمایشتێکی خوای بەرزو مەزن و پێغەمبەرەکەی بکەین:

١- خوای پەروەردگار ئامۆژگاریی مسوڵمانان دەکاو دەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن جَآءَكُمۡ فَاسِقُۢ بِنَبَإٖ فَتَبَيَّنُوٓاْ .. ﴾ الحجرات: ٦.

واتە: ئەی بڕوادارینە! هەرکات لادەر (فاسق)ێك هەواڵێکی بۆ هێنان، ڕوون و ساغی بکەنەوە...

ئەم ڕەوشتەش زۆر گرنگە، براو خوشکەکانم! جاری وابووە بینیومە بەرپرسێکلە ئاستێکی بەرزدا تووشی بڕیارێکی هەڵە بووە، لەسەر بناغەی مەعلووماتی نادروست و هەواڵی نادروست.

زۆرجاران برایەك، خوشکێك، دڵی لە کەسێك دەڕەنجێ، لەسەر بناغەی هەواڵێکی نادروست، یاخود بەوهۆیەوە کەسێك غەیبەتێك دەکا، بۆیە پێویستە دەرگای جاسووسیی و غەیبەت و قسە هێنان و بردن، دابخرێ.

بەرپرس نابێ گوێ کلۆر بکاو، گوێ شل بکا بۆ کەسێك، باسی خەڵکی لەلا بکات و غەیبەتی خەڵکی بۆ بکات، چ جای بوختان و تۆمەت!

باشترین شت ئەوەیە، کە تۆ ئەو گلەییەی هەتە لە فلان کەس، بچیٚ بۆ لای خۆی، یاخود ئەگەر گلەییەکت لێی هەیە، با بیهێننە بەرەو ڕووت، بەرەو ڕووت دابنیشیٚ.

بەرپرس دەبیٚ خەڵك ڕا نەهێنیٚ لەسەر باس و غەیبەتی یەکدی، بەتایبەتی هی بەرپرسان، چونکە ئەو کەسەی دەکرێتە بەرپرس، باری قورسترە، هەڵبەتە بەرپرسیش دەبیٚ لە خۆی وریابیٚ و، لە خەڵك بە تەقوا تر بیٚ و، لەوان دڵسۆزتر بیٚ، بەڵام کاتێك، کە ئەوان باریشیان گرانترو بەزەحمەتترە، کەچی ڕیٚ بدریٚ بە خراپە باسیان بکریٚ و، بکرێنە بنێشتی سەرزارو، لە هەیبەت و ویقاریان بێتە خوار، بێگومان ئەوە ستەمە.


281


هەڵبەتە ئەگەر کەسێکیش ڕەخنەی هەقی لە کەسێك هەبوو، ئەوە دەبیٚ هەمووومان لەبەرامبەر حەقێدا، ملمان لە موو باریکتر بیٚ، بەڵام نابیٚ بەناحەق باسی کەس بکریٚ، نە بەرپرس و نە غەیری بەرپرس، بەڵام بەزۆریی باسی بەرپرسان دەکریٚ، بۆیە بەتایبەت باسی ئەوانمان کرد.

٢- پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) لەوبارەوە دەفەرمویٚ: (إِنَّكَ إِنِ اتَّبَعْتَ عَوْرَاتَ أَوْ عَثَرَاتَ النَّاسِ، أَفْسَدْتَّهُمْ أَوْكِدْتَ أَنْ تُفْسِدَهُمْ) رواه أبو داود: ٤٨٩٠ ابن حبان: ٥٧٦٠ والطبراني: ٨٩٠، ورجاله ثقات، كما قال الهيثمي في مجمع الزوائد.

واتە: هەرکات تۆ بەدوای عەیب و عار، یان هەڵەکانی خەڵکی کەوتی، تێکیان دەدەی، یان خەریکی تێکیان بدەی.

بـەڕێــزان!

ئێستا زۆر لە دەوڵەتان، خەڵکیان هەموو بەسەریەکەوە کردۆتە جاسووس، بەڵام بۆ زانیارییتان! ئەو قەوارەو ڕژێم و حیزبانە، زیاتر پێویستییان بە سیخوڕو جاسووس و، خەڵك لەسەر یەککردنە هەواڵگر (مُخْبِر) هەیە، کە حوکمی ناحەق دەکەن، بەڵام ئەگەر حوکمێکی حەقت هەبێ، پێویستیت بەوە نیەو، کەسێك ئامانجی شەرعیی هەبێ، پێویستیی بە ئامرازی ناشەرعیی ناکات، کاتی خۆی لە یەکێتی سۆڤیەتی پێشوودا، ئێستا لە ئەمریکادا، کاتی خۆی لەسەردەمی ڕژێمی بەعسداو...هتد، ئەو ڕژێمانەی خۆسەپێنن، پێویستییان بەوە هەیە، هەموو خەڵك چاو و گوێیان بێ، بۆ ئەوەی هیچ کەس نەوێرێ لە کەوڵی خۆیدا بجووڵێ، چونکە (الخائن خائف) {ئەوەی خیانەتکاربێ، دەترسێ}، بەڵام {ئەوەی کە پەرێزی پاکە، بێ باکە} کەسێکیش پەرێزی پیس بێ، بە تەئکید هەمیشە لەخۆی لە گومان دایە.

## ١١ و ١٢: لێپرسینەوەو سزادانی خراپەکاران و، ڕێزلێگرتن و هـاندانی کەسـانی دڵسـۆزو شـایستـە:

ئەم دوو ڕەوشتە سیاسییە پەسندەی بەرپرس و حوکمڕانم، بە تێکهەڵکێشیی هێناون.

بەڕێزان! ئەم ژیانی دنیای ئێمە، دنیای هۆکارەکان. (عالم الأسباب)ە، بەشەریش وایە، هەم پێویستیی بەوە هەیە، ئەگەر خوار بوو، ڕاست بکرێتەوەو، ئەگەر ڕاست ڕۆیی، پاداشت بدرێتەوە، بەشەر وایە، خوای کاربەجێ لە قوڕئاندا هەمیشە پاداشت و سزا (ثواب و

عقاب)ی خۆی پێکەوە باسی دەکات و، باسی بەهەشت و دۆزەخ پێکەوە دێنێ، بۆ نموونە:

١- ﴿ ..نَبِّئْ عِبَادِيٓ أَنِّيٓ أَنَا ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٤٩﴾ وَأَنَّ عَذَابِي هُوَ ٱلْعَذَابُ ٱلْأَلِيمُ ﴿٥٠﴾ ﴾ الحجر.

واتە: هەواڵ بە بەندەکانم بدە کە لەدڵنیایی من لێبوردەی بەبەزەییم. هەروەها کە: هەر سزاو ئازاردانی من، سزاو ئازاری بە ئێشە.

٢- ﴿ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٣﴾ مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ ﴿٤﴾ ﴾ الفاتحة.

واتە: (خوا) بەبەزەیی بەخشندەیە. خاوەنی ڕۆژی سزاو پاداشتە.

خوای کاربەجێ پێکەوەو وێکڕا، هەم سزای خۆی و هەم پاداشتی خۆی، پیشان دەدا.

هەڵبەتە لەوبارەشەوە بەڵگەی قورئان و سوننەت زۆرن، بۆ نموونە:

١- با سەرەتا تەماشای ئەو ئایەتانە بکەین، کە خوا (سبحانه وتعالى) لە مەقامی مەدحدا، باسی (ذوالقرنين) دەکا، دەفەرموێ:

﴿ قُلْنَا يَٰذَا ٱلْقَرْنَيْنِ إِمَّآ أَن تُعَذِّبَ وَإِمَّآ أَن تَتَّخِذَ فِيهِمْ حُسْنًا ﴿٨٦﴾ قَالَ أَمَّا مَن ظَلَمَ فَسَوْفَ نُعَذِّبُهُۥ ثُمَّ يُرَدُّ إِلَىٰ رَبِّهِۦ فَيُعَذِّبُهُۥ عَذَابًا نُّكْرًا ﴿٨٧﴾ وَأَمَّا مَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَلَهُۥ جَزَآءً ٱلْحُسْنَىٰ ۖ وَسَنَقُولُ لَهُۥ مِنْ أَمْرِنَا يُسْرًا ﴿٨٨﴾ ﴾ الكهف: ٨٦ - ٨٨.

واتە: گوتمان ئەی (ذوالقرنين)! سەرپشکی، بۆت هەیە خەڵک سزا بدەی، بۆشت هەیە چاکەیان لەگەڵ بکەی.

یانی: هەم دەستی سزادانت کراوەیە، بۆ کەسانی خراپەکار، هەم دەستی پاداشتدانەوەشت کراوەیە بۆ کەسانی چاکەکار.

دەبێ ئاوا لە ئایەتەکانی خوای زاناو توانا تێ بگەین، چونکە خوای بەرزو مەزن بەکورتیی و پوختیی فەرمایشت دەکات، لێرەدا کەسێك لێی وردنەبێتەوە، دەڵێ: دیارە هەر لە گۆترە خوا فەرموویەتی: کێت پێ خۆشە، سزای بدەو، کێش پێت خۆشە، چاکەی لەگەڵ بکە! بەڵام وانیەو گۆترەکاریی نیە، بەڵکو یانی: ئەی (ذو القرنین)! تۆ دەستت کراوەیە بۆ هەرکام لە:

أ- سزادانی خراپەکاران، بەو شێوەیە، کە بە گونجاوی دەزانی.

ب- پاداشتدانەوەی چاکەکارانیش، هەرکەسە بەپێی خۆی.

ئنجا ئایا (ذو القرنین) دەڵێ چی؟! ﴿قَالَ أَمَّا مَن ظَلَمَ فَسَوْفَ نُعَذِّبُهُۥ ثُمَّ يُرَدُّ إِلَىٰ رَبِّهِۦ فَيُعَذِّبُهُۥ عَذَابًا نُّكْرًا ﴾.

گوتی: ئەوەی ستەم بکات (خراپەو لادان بکات)، ئێمە سزای دەدەین، دوایی دەگێڕدرێتەوە بۆ لای پەروەردگاری و، زۆر خراپ سزای دەدا.

یانی: سزای ئێمە، لەچاو سزای خوای دادگەر هەر هیچ نیە.

﴿ وَأَمَّا مَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَلَهُۥ جَزَآءً ٱلْحُسْنَىٰ ۖ وَسَنَقُولُ لَهُۥ مِنْ أَمْرِنَا يُسْرًا ﴾.

بەڵام کەسێك ئیمانی هەبێ و کردەوەی باش بکا، ئەوە پاداشتی هەرە چاکی لە لای خوا هەیەو، ئێمەش قسەیەکی باشی لەگەڵ دەکەین.

واتە: تەقدیری دەکەین و دەستخۆشیی لێدەکەین و پاداشتی دەدەینەوە.

٢- هەروەها پێغەمبەری خاتەمیش (صلى الله عليه وسلم) لە ژمارەیەك لە فەرمایشتەکانیدا، بەمەدح و ستاییشەوە، باسی هاوەڵە بەڕێزەکانی خۆی دەکا، بۆ وێنە:

أ- باسی ئەبووبەکر (رضي الله عنه) دەکات و دەفەرمویٚ:

(إنَّ أَمَنَّ الناسِ عَلَيَّ في مالِه وَصُحْبَتِه: أبوبكر، وَلَوْ كُنْتَ مُتَّخِذاً خَليلاً، لَاتَّخَذْتُ أبابكر خَليلاً) رواه البخاري: ٣٩٠٤، الترمذي: ٣٦٦٠.





واتە: خاوەن چاکەترین کەس بەسەر منەوە، لە سامانیداو لە ڕەفاقەتیدا: ئەبووبەکرە، ئەگەر کەسم گرتبایە بە دۆستی تایبەت، ئەبووبەکرم بەدۆست دەگرت، {یانی: بەس خوا ئەو زاتەیە، کە هەموو خۆشەویستیی خۆمم بۆ تەرخان کردوە}.

ب- هەروەها باسی عومەر (رضي الله عنه) دەکاو، دەفەرمویٚ:

(وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ مَا لَقِيَكَ الشَّيْطَانُ سَالِكًا فَجًّا قَطُّ، إِلَّا سَلَكَ فَجًّا غَيْرَ فَجِّكَ) رواه البخاري: ٦٠٨٥.

واتە: سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، هیچ کات تۆ بەڕێیەکدا نەڕۆیشتووی، مەگەر شەیتان بەڕێیەکی دیکەدا ڕۆیشتوە، {ناوێرێ بەڕێی تۆدا بێ}.

ج- هەروەها لە باسی عوثماندا (رضي الله عنه) فەرموویەتی:

(إئذَنْ له وبشِّره بالجنّة، على بَلْوى تكون) رواه البخاري: ٧٢٦٢، والترمذي: ٣٧١٠.

ئەبووهورەیرە، ڕۆژێك لە خزمەت پێغەمبەردا بووە (صلى الله عليه وسلم)، لەوكاتەدا پێغەمبەری خوا لەسەر (بیر)ێك دانیشتووە، هەردووك لاقی بە بیرەکەدا شۆڕ کردوونەتەوە، کەسێك لە دەرگای باخچەکەی داوە، فەرموویەتی: مۆڵەت بدە بێتە ژوورو، موژدەی بەهەشتیشی پێ بدە، یەکەمیان ئەبووبەکر بووە، دوایی عومەر بووە، سێیەمیان عوسمان بووە، بۆ وی فەرموویەتی: بەڵایەکیشی تووش دێت، عوسمانیش گوتوویەتی: (أَللهُ المُسْتَعَان) پەنا بەخوا دەگرم لەسەر ئەو بەڵایەی، کە تووشم دێ، ئەویش ئەوەبوو کە بەناهەق شەهید کرا.

د- هەروەها دەربارەی عەلی (رضي الله عنه) فەرموویەتی: (لَأُعْطِيَنَّ هَذِهِ الرَّايَةَ غَداً رَجُلاً يُحبُّ اللَّهُ وَرَسُولَهُ، يَفْتَحُ اللَّهُ عَلَى يَدَيْهِ) رواه مسلم: ٢٤٠٥.



واتە: بەیانی ئەم ئاڵایە دەدەمە دەست پیاوێك خواو پێغەمبەری خوای خۆش دەوێن و، خوا لەسەر دەستی وی ئەو قەڵایە دەکاتەوە.

دوایی ئاڵایەکە تەسلیمی عەلی دەکات و، بەسەرکردایەتیی عەلی سوپای ئیسلام دەروازەی قەڵای خەیبەر دەشکێنێ.

هـ- دەربارەی خالیدی کوڕی وەلید (رضي الله عنه) فەرموویەتی: (نِعْمَ عَبْدُاللَّهِ: خَالد بن الوليد، سَيْفٌ مِنْ سُيُوفِ اللَّهِ) رواه الترمذي: ٣٨٤٦.

واتە: خالیدی کوڕی وەلید بەندەیەکی باشە، شمشێرێکە لە شمێرەکانی خوا.

هەروەها لە زۆر فەرمایشتی دیکەدا مەدحی هاوەڵانی دیکەی (خوا لێیان ڕازی بێ) دەکات.

ئنجا ئایا بۆچی مەدحیان دەکات؟

دەڵێین:

**یەکەم:** وەك ستاییش و تەقدیرکردنی هەوڵ و خەبات و دڵسۆزییان.

**دووەم:** پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بە چاوی وەحیی، داهاتووی بینیوەو، زانیویەتی هەریەك لەوانە کێشەو گرفتی دێنە پێش، ئنجا ویستوویەتی: هەم بۆخۆیان هەم بۆ دۆست و نەیارانیشیان، بەرچاوڕوونیی بدات.

بە نسبەت سزادانیش: پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هەرکەسێکی بینیبێ، هەڵەو خراپەیەکی کردبێ، لەو کاتەدا سزای داوە، ئەگەر شایستەی سزا بووبێ، یاخود پێشانی داوە، کە هەڵەی کردوە، بۆ وێنە:





أ- خالیدی کوڕی وەلید (رضي الله عنه)، کە ئاوا مەدحی دەکا، لەو مەقامەدا، لە مەقامێکی دیکەدا، کە خەڵکێك بە ناهەق دەکوژێ، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەست بەرز دەکاتەوەو دەفەرموێ: (أللّهم إني أبرءُ إليك مِمَّا صَنَعَ خالد) رواه البخاري: ٤٣٣٩.

واتە: ئەی خوایە! من بەریئم لەوەی، کە خالید کردی و لەو تاوانەیدا بەشدار نیم، هەڵبەتە لەو مەسەلەیەدا (خالد) ئیجتیهادێکی هەڵە دەکاو بە ناحەق دەیانکوژێ، بەڵام ئەمە، ئەوەی نەگەیاندوە، کە خالید بە کەڵکی هیچ نایەت، لەبەر ئەوەی هەڵەیەکی کردوە، پێغەمبەری لێزان (صلی الله علیه وسلم) بەرائەت لە هەڵەکەی دەکا، بەڵام تەقدیریشی دەکات، چاکەکانی لەجێی خۆی، هەڵەکەشی لەجێی خۆی.

زۆر گرنگە، ئێمەش هەمیشە ئەو هاوسەنگییە ڕابگرین.

ب- هەروەها لەوبارەوە نموونەیەکی دیکەش دێنینەوە:

(عن يعيش بن طِخْفة الغفاري رضي الله عنه قال: قال أبي : بينما أنا مضطجع في المسجد على بطني، إذا رجل يُحَرِّكني برجله، فقال: [ إن هذه ضجعة يبغضها الله ] قال: فنظرت فإذا رسول الله صلى الله عليه و سلم). رواه أبو داود بإسناد صحيح:٥٠٤٠.

واتە: بابم گوتی: لەکاتێکدا لە مزگەوتێ لەسەر سکم ڕاکشابووم، پیاوێك بەلاقی جووڵاندمی گوتی: ئەم ڕاکشانە خوا ڕقی لێیەتی، کە سەرنجمدا: پێغەمبەری خوا بوو (صلى الله عليه وسلم).

جـ- ئەمەش نموونەیەکی دیکە هەر لەوبارەوە:

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (ما بال أقوام يرفعون أبصارهم إلى السماء في صلاتهم، فاشتدَّ قولُهُ في ذلك حتى قال: لَيَنْتهُنَّ أو لَتُخْطَفُنَّ أبصارُهم) رواه البخاري: ٧٥٠.

واتە: بۆچی کەسانێك لەنوێژەکەیاندا چاویان دەبڕنە ئاسمانێ! لەوبارەوە قسەی توندی فەرموو و تووڕەبوو، هەتا فەرمووی: یان وازدێنن، یان چاویان دەرفێنرێن.

بەڕێـــــــزان!

لەم تەوەرەیەشدا باسی شەش (٦) لەو ڕەوشت و خەسڵەتە سیاسییە جوان و پەسندانە دەکەین، کە پێویستە خەڵك و جەماوەر مامەڵەیان پێ لەگەڵ حوکمڕان و بەرپرساندا بکەن:

## ١) خۆ بە بەرپرسیارزانین بەرانبەر بە کۆمەڵگا:

بەڕێـــزان!

بەڕاستیی ئەمە ڕەوشتێکی گرنگە بۆ خەڵك بە گشتی، کە بەرامبەر بە کۆمەڵگا، خۆیان بە بەرپرسیار بزانن، بۆ وێنە: تەماشا بکەن! ئەم هەڵبژاردنانەی ئەم دواییە[1]، کە دەرفەتێکی باش کرایەوە بۆ تەزویری هەردوو حیزبی حوکمڕان، لەبەرچی بوو؟! لەبەر ئەوەبوو، کە خەڵك نەچوو بۆ دەنگدان، ئایا بۆچی ناچن بۆ دەنگدان؟! هەڵبەتە خۆیان بە بەرپرسیار نازانن، خۆیان بە بەرپرسیار نازانن، بەرامبەر بە خێرو شەڕی کۆمەڵگاکەیان، بەڵام خوا (سبحانه وتعالى) بە جۆرێکی دیکە دەفەرموێ:

١- خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ يَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَيُطِيعُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓۚ .. ﴿٧١﴾ ﴾ التوبة.

---

(١) هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان، کە لە: (٢٠١٨/٩/٣٠)دا ئەنجام درا.

واتە: پیاوانی ئیماندارو ئافرەتانی ئیماندار، هەندێکیان دۆست و پشتیوانی هەندێکیانن.

ئنجا ئایا بۆچی بڕواداران دۆست و پشتیوانی یەکدین؟

تاکو فەرمان بە چاکە بکەن و، ڕێ لە خراپە بگرن و، نوێژ بەرپابکەن و، زەکات بدەن و، فەرمانبەریی خواو پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بکەن.

دواییش دەفەرموێ: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ سَيَرۡحَمُهُمُ ٱللَّهُ﴾، هەر ئەوانەش خوا بەزەیی پێیاندا دێ و، هەرکەس وا نەبێ، وەبەر ڕەحمەتی خوا ناکەوێ.

٢- هەروەها پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: (كلّكم راع وكلكم مسؤول عن رعيّته، والأمير راع، والرجل راع على أهل بيته، والمرأة راعية على بيت زوجها وولده، فكلكم راعٍ وكلّكم مسئولٌ عن رعيته) رواه البخاري: ٨٩٣، ومسلم: ١٨٢٩.

واتە: هەر کامێك لەئێوە چاودێرەو بەرپرسیاریشە بەرامبەر بە کۆمەڵگایەکەی...

هەندێك لە مامۆستایان وشەی (راعي) بە (شوان) لێك دەدەنەوە، بەڵام وا نیە، چونکە ئەگەر هەموومان شوان بین، ئەدی مەڕەکە کێ یە؟!

کەواتە: (كلكم راعٍ) یانی: هەمووتان چاودێرن، نەك هەمووتان شوانن، چونکە هەندێك لە عەلمانییەکان ڕەخنە دەگرن، دەڵێن: تەماشا بکەن! ئیسلام خەڵك و میللەت بە مەڕ دادەنێ، چونکە

ئەوەتا دەڵێ: بەرپرسەکان شوانن، بەڵام نەخێر، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ: هەمووتان چاودێرن، یانی: مشوور خۆرن، ئەسڵەن شوان بۆیە پێی دەگوترێ: (راعي) چونکە چاودێریی مەڕەکانی دەکات، تۆش دەبێ چاودێریی کۆمەڵگاکەی خۆت بکەی و، چاودێریی بەرپرسەکەشت بکەی، بەڵکو چاودێریی ماڵ و خێزان و دەروجیرانیشت بکەی و، بیانگێڕیەوە سەر حەق، لە ناحەق لایانبدەی و، بۆ حەق هانیان بدەی.

## ٢) فەرمانبەریی بۆ بەرپرسان لە بازنەی شەریعەتدا:

بەرێـــزان!

٢٩٣

لەئیسلامدا تەنیا لە بازنەی شەریعەتدا، بەقسەی سەرەوەی خۆ دەکرێ و، فەرمانبەریی بۆ بەرپرسان دەکرێ.

با لەوبارەوە دوو نموونە لە قورئان و سوننەت بێنینەوە:

١- ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ ﴾ النساء: ٥٩.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! فەرمانبەریی خواو، فەرمانبەریی پێغەمبەرو، هی کاربەدەستانێك، کە لەخۆتانن، بکەن.

وەك دەبینین خوای زاناو کارزان:

پێشێ باسی فەرمانبەریی خواو پێغەمبەری خوا دەکا، یانی: پابەندیی بە قورئان و سوننەتەوە، ئنجا هی بەرپرسان، باس دەکات، یانی:

بەرپرسانێك کە پابەندن بە قورئان و سوننەتەوە، ڕەوایەتییان هەیە، کە فەرمانبەرییان بۆ بکرێ.

٢- هەروەها پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: (السّمع والطاعة على المرء المسلم فيما أحَبَّ أو كَرِه، ما لم يُؤْمَرْ بمعصية، فإذا أُمِرَ بمعصية، فلا سمع ولا طاعة)، رواه البخاري: ٧١٤٤، ومسلم: ١٨٣٩.

واتە: گوێ بۆ گرتن و فەرمانبەریی کردن لەسەر مرۆڤی مسوڵمانە[1] [مرۆڤی مسوڵمان لەسەری پێویستە: گوێ بگرێ و فەرمانبەریی بکا بۆ سەرەوەی خۆی] لە شتێکدا، کە حەزی لێدەکاو، لە شتێکیشدا، کە حەزی پێ ناکا، بەمەرجێك فەرمانی پێ نەکرێ بە سەرپێچیی، ئەگەر فەرمانی پێکرا بە سەرپێچیی، نە گوێ دەگرێ و نە فەرمانبەرییش دەکا.



ئنجا یانی چی: پێی خۆش بێ، یان پێی ناخۆش بێ؟! جاری وایە شتێکت پێ ناخۆشە، بەڵام مەرج نیە ناشەرعیی بێ، بەڵام لە قالبت ناخۆشە، بۆ وێنە: بەرپرسێك پێت دەڵێ: لەوێ دامەنیشە، شوێنی تۆ نیە، بچۆ ئەوێ، قسەکەشی حەقە، تۆش پێت ناخۆشە، بەڵام دەبێ بە قسەی بکەی.

یان بەرپرسێك دەڵێ: زەحمەت نەبێ بچۆ فڵان کارە بکە، تۆش لەبەر ئەوەی سەرمایەو زستانە، پێت ناخۆشە، بەڵام شەرت نیە، هەرچی پێت ناخۆش بێ، ناشەرعیی بێ، هەروەها مەرجیش نیە هەرچی پێت خۆش بێ، شەرعیی بێ.

---

(١) (مَرء) یانی: مرۆڤ، ئەگەر ویستیان بیکەنە (مؤنث)، دەڵێن: (إمرأة)، ئەگەرنا (مرء) یانی مرۆڤ، نێر بێ، یان مێ بێ.

## ٣) ڕێز لێگرتنی بەرپرسان و پشتگیریی کردنیان لەسەر هەق:

براو خوشکانم! لەم ڕۆژگارەدا لەسۆنگەی ئەوەوە، کە بەرپرسان و حوکمڕانان بە زۆریی بەڕێی ناحەقدا دەڕۆن و، زۆربەیان ڕەوشت و بەها بەرزەکانیان لە سیاسەت دارنیون و، قۆرخکاریی و گەندەڵیی دەکەن، زۆرجاران بەرپرسان، خەڵك لەناخی خۆیاندا ڕقیان لێیانە، کەچی لە ڕوویاندا زۆر تەمەللوقیان بۆ دەکەن!

زۆربەی خەڵك لەناخی خۆیاندا ڕقیان لەو بەرپرسانەیە، بەڵام، کە دەیانگەنێ خۆیان بۆ زەلیل و زەبوون دەکەن، کە ئەو دوو ڕەفتارە هەردووکیان غەڵەتن، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە فەرمایشتێکدا دەفەرموێ:

(خِيَارُ أَئِمَّتِكُمُ الَّذِينَ تُحِبُّونَهُمْ وَيُحِبُّونَكُمْ، وَتُصَلُّونَ عَلَيْهِمْ وَيُصَلُّونَ عَلَيْكُمْ، وَشِرَارُ أَئِمَّتِكُمُ الَّذِينَ تُبْغِضُونَهُمْ وَيُبْغِضُونَكُمْ، وَتَلْعَنُونَهُمْ وَيَلْعَنُونَكُمْ)، رواه مسلم: ١٨٥٥.

واتە: باشترینی بەرپرسەکانتان ئەوانەن خۆشتان دەوێن و، خۆشیان دەوێن و دوعای خێریان بۆ دەکەن و، دوعای خێرتان بۆ دەکەن، خراپترین بەرپرسانیشتان ئەوانەن، کە ڕقتان لێیانەو، ڕقیان لێتانەو، نەفرینیان لێدەکەن و، نەفرینتان لێدەکەن...

حاڵەتی تەندروست ئەوەیە بەرپرسەکە وابێ، هێندەت خۆش بوێ، دوعای خێری بۆ بکەی، ئەویش دوعای خێر بۆ تۆ بکات و، پێویست نەکات موجامەلەی درۆی بۆ بکەی، ڕێزی لێ بگرە،

بەڵام نابێ ئەو خەڵك ناچار بكا، موجامەلەی درۆی بۆ بكەن، بەدرۆ دەستی بۆ بەسینگەوە بنێن!

بۆچی خەڵك ناچاری درۆكردن و ماستاو چییەتیی بكرێ؟! بەداخەوەش ئەو نەریتە نا جوامێرانەیە، لەنێو ئەو وڵاتانەی ئێمەدا زیاتر هەیە، لەزۆر دەوڵەتانی ڕۆژئاواو ڕۆژهەڵاتی دنیادا وانیە، بەرپرسێك، كە لەسەر كورسییە، پێی وانیە بووە بە هەموو شتێكی ئەو خەڵكە، لەكاتێكدا كاروبارەكەی خۆی بەڕێوە دەبات، حەقی ئیشەكەی خۆی دەداو، كاتێك ماوەكەی تەواو دەبێ، دێتە خوارێ و هیچ هەرا ناكات! بێگومانیش ئەوەی ئەوان دەیكەن، بەڵگە شەرعییەكانیش بەڕوونیی ئەوە دەگەیەنن، كە بەرپرسان دەبێ خۆ بەكەمگرو خاكیی بن و، دڵسۆز بن بۆ خەڵك و، نابێ شەڕ لەسەر كورسیی بكەن، دەبێ ئەو حوكمڕانییە، ئەو بەرپرسیارێتییە بە ئەمانەت تێ بگەن، بە تەكلیفی تێ بگەن، نەك بە تەشریف.

لەڕاستییدا ئەو حاڵەی لەوێ هەیە، ئەوە لەگەڵ ڕووحی شەریعەتی ئیسلامدا دەگونجێ و، ئەوەی لە لای ئێمە هەیە، دواكەوتوویەتییە، هەم لە دین و هەم لە ژین.

با لەوبارەوە ئاماژە بەچەند دەقێكی شەریعەت بكەین:

١- خوا "عز وجل" فەرموویەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَرۡفَعُوٓاْ أَصۡوَٰتَكُمۡ فَوۡقَ صَوۡتِ ٱلنَّبِيِّ وَلَا تَجۡهَرُواْ لَهُۥ بِٱلۡقَوۡلِ كَجَهۡرِ بَعۡضِكُمۡ لِبَعۡضٍ أَن تَحۡبَطَ أَعۡمَٰلُكُمۡ وَأَنتُمۡ لَا تَشۡعُرُونَ ﴿٢﴾ ﴾ الحجرات.

واتە: ئەی بڕواداریینە! دەنگتان ڕسەر دەنگی پێغەمبەر مەخەن، وەك دەنگ هەڵێنانی هەندێکتان بە سەرهەندێکتاندا، دەنگی بەسەردا بەرز مەکەنەوە، نەوەك بێ ئەوەی هەست پێبکەن، کردەوەکانتان هەڵبوەشێنەوە.

بێگومانیش بەرپرسانێك، کە بەپێی ڕێبازی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دادەنرێن و بەڕێوەدەچن، بەجێگری پێغەمبەر دادەنرێن، پێویستە لەقەدەر خۆیان ڕێزیان لێ بگیرێ، چونکە هەرچی بۆ پێغەمبەر پێویست بووە لەسەر ئوممەت، بۆ جێگرەکانیشی پێویستە، مەگەر شتێك بەبەڵگەیەکی ڕوون تایبەتمەندیی وی بووبێ.

٢- هەروەها خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُنَادُونَكَ مِن وَرَآءِ ٱلْحُجُرَٰتِ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ۝٤ ﴾ الحجرات.

٢٩٧

واتە: بەدڵنیایی ئەوانەی لەپشت ژوورەکانەوە بانگیان دەکردی، زۆربەیان نافامن.

ئەوانەش وەك لە تەفسیرەکان و هۆیەکانی دابەزینی ئایەتەکان (أسباب نزول الـيـيات)دا هاتوە، کەسانێك بوون، کە بەجۆرێکی نارێك و ناشایستە بانگی پێغەمبەری خوایان کردوە: (يا محمد! اخرج إلينا) ئەی موحەممەد! وەرە دەرێ بۆلامان.(١)

٣- پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) لە فەرمایشتێکیدا دەربارەی ڕێز لێگرتنی بەرپرسان دەفەرموێ: (إن من إجلال الله "عزو وجل"

---

(١) الإستيعاب في بيان الأسباب، ج٣ ص٢٦٢، ٢٦٣، أخرجه أحمد في المسند: (٤٨٨/٣) والطبري في (جامع البيان) (٧٧/٢٦) وصححه الألباني في (صحيح الترمذي: ٢٦٠٥).

إكرام ذي الشيبة المسلم، وحامل القرآن غير الغالي فيه ولا الجافي عنه، وإكرام ذي السلطان المقسط) رواه أبو داود: ٤٨٤٣، وابن أبي شيبة: ٣٢٥٦١، وحسنه الألباني.

واتە: لە ڕێز لێگرتن و بەبەرز گرتنی خوای مەزنە، کە ڕێز بگیرێ لە مسوڵمانێك، کە مووی سپی بووە (ئنجا ئەگەر پیاوە، ئەگەر ئافرەتە، مادام مووی سپی بووەو کەوتۆتە تەمەنەوەو ڕێزی لێ بگرە)، هەروەها هەڵگری قورئان، کە نە زۆر تێیدا ڕۆچووەو لێی تێپەڕاندوە، نە زۆر دووریيشی لێ گرتوە، (واتە: بەشێوەیەکی هاوسەنگ بە قورئانەوە پابەندە)، هەروەها ڕێزلێگرتنی خاوەن دەستەڵاتی دادگەر (کەسێ کە بەرپرس و حوکمڕانێکی دادگەرە، دەبێ ڕێزی بگیرێ، ئەوەش هەر لە ڕێز لێگرتنی خوای پەروەردگارە).

ئەها! چۆن ئیسلام شتەکان دەگێڕێتەوە سەر ئەسڵ و بناغەی شەرعیی خۆیان: دەسەڵاتدارێك، کە دادگەرانە حوکم دەکا، ئەگەر ڕێزی لێ بگری، ڕێزت لەخوا گرتوە! بێگومان ئەوە شتێکی گەورەیە، نەك بە نەفەسی عەلمانییەت و، بەنەفەسی لیبڕالیی، کە هەر کەسێ بەرپرس بوو، وەك بوويێتە دوژمنی خەڵك و پێویست بێ: خەڵك دوژمنایەتیی بکا، بەڵام وەك گوتم: لە ئەنجامی ئەوەدا ئەو بۆچوونە پەیدا بووە، کە هەرکەس بۆتە بەرپرس، زۆربەیان سەریان لە گەندەڵیی و ستەمەوە دەرچووە، ئیدی خەڵك لە مێشکیاندا تەبع بووە، کە بەرپرسییەتیی، یانی: کاری خراپ! کە لە ڕاستییدا وانیەو، ئەوە هەمووی بە نەفەسی غەیرە ئیسلامیی و غەیرە شەرعیی وایە.

## ٤) بە نەرمیی و لێزانیی دواندنی بەرپرسان:

خوای پەروەردگار مووساو هارِوون (صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێ) دەنێرێ بۆ لای فیرعەون، پێیان دەفەرموێ:

﴿ ٱذْهَبَآ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴿٤٣﴾ فَقُولَا لَهُۥ قَوْلًا لَّيِّنًا لَّعَلَّهُۥ يَتَذَكَّرُ أَوْ يَخْشَىٰ ﴿٤٤﴾ ﴾ طه.

واتە: بچن بۆ لای فیرعەون، یاخیی بووە، قسەیەکی نەرمی لەگەڵدا بکەن، بەڵکو وەبیری بێتەوە، یاخود بترسێ، {یانی: ترسی خوای بچێتە دڵ و واز لەو سەرکێشییە بێنێ}.



جارێك زانایەك دەچێ بۆ لای (مەئموون) یەکێ لە حوکمرِانانی عەبباسییەکان و، قسەیەکی زۆر توندی لەگەڵ دەکا، ئەویش (مەئموون) دیارە ئەهلی عیلم بووە، دەڵێ: مامۆستا! تۆزێ لەسەرەخۆبە، چونکە: خوای پەروەردگار دوو نەفەری زۆر لە تۆ چاکتری ناردن، بۆ لای یەکێکی زۆر لەمن خراپتر، (مووساو هارِوون) لەتۆ چاکتر بوون، ناردنی بۆ لای فیرعەون، کە زۆر لەمن خراپتر بوو، بەڵام پێی فەرموون: ﴿ فَقُولَا لَهُۥ قَوْلًا لَّيِّنًا ﴾ قسەیەکی نەرم و نیانی لەگەڵدا بکەن.

یانی: ئامۆژگارییم بکە، بەڵام بە نەرمیی ئامۆژگارییم بکە، ئەگەر دەتەوێ لێت وەربگرم.

٥) ڕەخنە لێگرتن و قسەی حەق گوتن بە بەرپرسان و گێڕانەوەیان لە هەڵەو لادان، لەڕووی بەتەنگەوە بوون و دڵسۆزییەوە، نەک لە ڕووی بوغزو غەرەزەوە:

ئەمەش چەند دەقێكی سوننەت لەوبارەوە:

١- پێغەمبەری خاتەم (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ: (أَفْضَلُ الْجِهَاد: كَلِمَةُ عَدْلٍ عِنْدَ سُلْطَانٍ جَائِرٍ) رواه أبو داود: ٤٣٤٤، والترمذي: ٢١٧٤.

واتە: باشترین جیهاد، قسەیەكی دادگەرانەیە، لەلای حوكمڕانێكی ستەمكار.

ئنجا وەك چەند جارێكی دیكەش لە بۆنەی دیكەدا باسمان كردوە، ئەو قسەیە شتێكی پووچ و بێ بنەمایە لەڕووی نەقڵ و عەقڵەوە، كە هەندێك كەس بەناوی شوێنكەوتنی (سەلەفی صالح)ەوە دەڵێن: ئەگەر ئامۆژگاریی دەسەڵاتدارت كرد، دەبێ زۆر بە پەنهانیی بێ و، كەس پێی نەزانێ!! بەڵێ، دەبێ بە لێزانیی و بە نەرمیی بێ، بەڵام مەرج نیە بە پەنهانیی بێ، ئەوەتا لەم دەقەدا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ: باشترین جیهاد، وشەیەكی حەقە لەلای دەسەڵاتدارێكی ستەمكار.

٢- لە فەرمایشتێكی دیكەدا هاتوە: (عن طارق بن شهاب الجبلي، أن رجلاً سأل النبي وقد وضع رِجْلَه في الغَرِز: أَيُّ الجهاد أفضل؟ قال: كلمة حق عند سلطان جائر) رواه النسائي: ٤٢٢٠ بإسناد صحیح.

تاریقی کوڕی شیهابی جەبەلیی دەڵێ: پیاوێك لە پێغەمبەری خوای (صلی الله علیه وسلم) پرسی: چ تێکۆشانێك چاکترە؟ لە کاتێکدا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پێی لە ئاوزینگ نابوو [ئاوزینگ ئەوەیە کە پێی سواری وڵاغ دەبی] ئەویش فەرمووی: قسەیەکی حەق لەلای دەسەڵاتدارێکی ستەمکار، ئەوە گەورەترین جیهادە.

٣- هەروەها لە فەرمایشتی دیکەدا هاتوە: (سید الشهداء حمزة، ورجل قام إلى إمامٍ جائر فأمره ونهاه، فقتله) رواه الحاكم: ٤٨٨٤ - وصححه - وصححه الألباني.

لەم دەقەشدا: ئەو کەسەی قسەی حەق دەکات و لە پێناوی قسەی حەقدا دەکوژرێ، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەگەڵ سەروەری شەهیدان (سید الشهداء) حەمزەی مامیدا، دەیخاتە تەرازوویێکەوە.

٣٠١

٤- یەکەمین خەلیفەی پێغەمبەری خوا "صلی الله علیه وسلم" (أبوبكر الصديق) خوا لێی ڕازی بێ لە یەکەمین وتاریدا، پاش هەڵبژاردنی بەجێنشینی پێغەمبەری خوا، گوتی: (أما بعدُ، أَيُّها الناسُ! فَإِني قد وُلِّيتُ عليكم ولست بخيركم، فإِنْ أَحْسَنْتُ فَأَعِينُونِي، وإِنْ أَسَأْتُ فَقَوِّمُونِي)[١].

واتە: پاش ستایشی خوا: خەڵکینە! بەسەرتانەوە کراومە سەرپەرشتیار، بەڵام لە ئێوە باشتر نیم، ئنجا ئەگەر چاکم کرد، هاوکاریم بکەن و، ئەگەر خراپیشم کرد، ڕاستم بکەنەوە.

---

(١) السيرة النبوية لابن هشام، ج٤، ص٣٩٣، ط دار ابن الهيثم/٢٠٠٦م.

## ٦) خۆ دوورگرتن لە خیانەت و فێڵ و کاری ژێر بە ژێر:

نابێ خەڵك لەبواری مامەڵەی لەگەڵ بەرپرس و حوکمڕاناندا، کاری ژێر بەژێرو خیانەت، بکات، دەبێ ڕاست و ڕێك قسەی خۆیان پێ بڵێ و ئامۆژگارییان بکا، ئنجا پێشنیارە، ڕەخنەیە، هەرچی هەیە، ئەمما کاری ژێر بەژێرو لەپەناو پەسیوداو، خۆ تێك بەستن و، فسکە فسك، بێگومان ئەوە شتێکی ناشەرعییە.

لەوبارەوەش دەقی شەریعەت زۆرن:

١- خوای پەروەردگار زۆر بە ڕوونی دەفەرمووێ:

﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي كَيۡدَ ٱلۡخَآئِنِينَ﴾ يوسف: ٥٢.

واتە: بەدڵنیایی خوا فێڵ و پیلانی ناپاکان بەئاکام ناگەیەنێ و بەرهەمدار ناکات.

٢- ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُصۡلِحُ عَمَلَ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ٨١﴾ يونس.

واتە: بێگومان خوا کاری تێکدەران و خراپەکاران چاك ناکات.

٣- پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: (مَنْ غَشَّ فليس مِنّا) مسلم: ١٠٢.

وەك پێشتریش باسمان کرد، مسوڵمان دەبێ لەگەڵ هەموو کەسدا، لە غەش و خیانەت و ژێر بەژێریی دوور بێ، بەتایبەت لەگەڵ کەسانێکدا، کە بەرپرسانی وڵاتن، ئنجا ئەگەر ڕەخنەشی لێیان هەبوو، ڕەخنەش بەشێوەی ڕاست و دروستی خۆی دەگیرێ و، ئامانجیش لێی ڕاستکردنەوەو چاککردنە، نەك داخی دڵی خۆ پێڕشتن و ڕووخاندن.

## تەوەری شەشەم

# دارِنرانی ڕەوشت و بەها بەرزەكان لە سیاسەت، دەرهاویشتەی زۆر خراپ، بگرە كارەساتباری دەبن





بەرێـــزان!

با لەوبارەوە: پێشێ تەماشای ئەو ئایەتانە بکەین، لە سەرەتای سوورەتی (الفجر)دا:

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ وَٱلْفَجْرِ ﴿١﴾ وَلَيَالٍ عَشْرٍ ﴿٢﴾ وَٱلشَّفْعِ وَٱلْوَتْرِ ﴿٣﴾ وَٱلَّيْلِ إِذَا يَسْرِ ﴿٤﴾ هَلْ فِى
ذَٰلِكَ قَسَمٌ لِّذِى حِجْرٍ ﴿٥﴾ أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِعَادٍ ﴿٦﴾ إِرَمَ ذَاتِ ٱلْعِمَادِ ﴿٧﴾
ٱلَّتِى لَمْ يُخْلَقْ مِثْلُهَا فِى ٱلْبِلَٰدِ ﴿٨﴾ وَثَمُودَ ٱلَّذِينَ جَابُوا۟ ٱلصَّخْرَ بِٱلْوَادِ ﴿٩﴾
وَفِرْعَوْنَ ذِى ٱلْأَوْتَادِ ﴿١٠﴾ ٱلَّذِينَ طَغَوْا۟ فِى ٱلْبِلَٰدِ ﴿١١﴾ فَأَكْثَرُوا۟ فِيهَا ٱلْفَسَادَ ﴿١٢﴾
فَصَبَّ عَلَيْهِمْ رَبُّكَ سَوْطَ عَذَابٍ ﴿١٣﴾ إِنَّ رَبَّكَ لَبِٱلْمِرْصَادِ ﴿١٤﴾ ﴾ الفجر.



بەناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

بە بەرەبەیان (سوێند) و، بە (دە) شەوەکانی (ی سەرەتای مانگی (ذو الحجة)) و، بەجووت و بەتاك و، بەشەوگار، کە بەشێنەیی دەڕوات، ئایا لەوەدا سوێند هەیە بۆ خاوەن عەقڵ؟!

[هل] لێرەدا بۆ تەحقیقە، نەك بۆ پرسیار، یانی بە تەئكید لەو شتانەدا، سوێندێکی شایستەی سوێند پێخواردن، هەیە، بۆ کەسێ عەقڵی هەبێ.

دوایی دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِعَادٍ ﴿٦﴾ إِرَمَ ذَاتِ ٱلْعِمَادِ ﴿٧﴾ ٱلَّتِى لَمْ يُخْلَقْ مِثْلُهَا فِى ٱلْبِلَٰدِ ﴿٨﴾ ﴾.

واتە: ئایا بە چاوی عەقڵ و دڵ، نەتدی پەروەردگارت چی بە گەلی عاد کرد؟ ئیرەمی خاوەن پایەو کۆڵەکە بەرزەکان (یاخود: قەڵا

بەرزەکان)، کە وێنەی وەك ئەوان دروست نەکرابوو لە وڵاتدا. (ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ، کە گەلی عاد دەبێ زۆر بە هێزو بە کەلەش بووبن).

﴿ وَثَمُودَ ٱلَّذِينَ جَابُواْ ٱلصَّخْرَ بِٱلْوَادِ ۝٩ ﴾

هەروەها: ئایا نەتدی پەروەردگارت چی کرد بە ئەو گەلی ئەموودە، کە بەردیان داتاشی لە دۆڵ (وادي)دا [کە ناوچەیەکە لە (حجر) نزیك «حجاز»].

﴿ وَفِرْعَوْنَ ذِى ٱلْأَوْتَادِ ۝١٠ ٱلَّذِينَ طَغَوْاْ فِى ٱلْبِلَٰدِ ۝١١ ﴾.

هەروەها فیرعەونی خاوەن گوڵمیخ و سینگ، کە لە وڵاتاندا یاخی بوون و سەرکێشییان کرد، سەرەنجام:

﴿ فَأَكْثَرُواْ فِيهَا ٱلْفَسَادَ ۝١٢ ﴾، خراپەکاریی و تێکدانیان تێدا زۆر کرد.



کەواتە: تێکچوونی باری ڕەوشت و مەعنەوییان، سەری کێشا بۆ خراپەکاریی سیاسیی:

﴿ ٱلَّذِينَ طَغَوْاْ فِى ٱلْبِلَٰدِ ۝١١ فَأَكْثَرُواْ فِيهَا ٱلْفَسَادَ ۝١٢ ﴾.

وشەی (فساد): فەسادی سیاسیی، فیکریی، ئابووریی، کۆمەڵایەتیی، ئەخلاقیی، هەمووی دەگرێتەوە، واتە: لە ئەنجامی طوغیاندا، فەسادیان بەرهەم هێنا.

﴿ فَصَبَّ عَلَيْهِمْ رَبُّكَ سَوْطَ عَذَابٍ ۝١٣ ﴾.

پەروەردگاریشت، یەك قەمچی لە سزای خۆی بەسەردا ڕشتن.

﴿ إِنَّ رَبَّكَ لَبِٱلْمِرْصَادِ ۝١٤ ﴾.

بێگومان پەروەردگارت لە بۆسە دایە بۆ ستەمکاران، بۆ حوکمڕانانی لادەرو ستەمکار.

کەواتە: ئەگەر بهێنینە بەرچاوی خۆمان:

١- حوکمڕانانێك لە جیاتی ڕاستگۆیی، درۆ بکەن.

٢- لە جیاتی ڕاوێژ بە خەڵك بکەن، خۆیان بەسەردا بسەپێنن.

٣- لە جیاتی مشوورخۆریی، مشەخۆربن بەسەریانەوە.

٤- لە جیاتی بەزەیی، دڵڕەق بن.

٥- لەجیاتی دڵسۆزیی، خۆپەرستیی بکەنە پیشە.

٦- لە جیاتی ئەمینی، ناپاکیی بکەن.

٧- لە جیاتی وەفاداریی، پەیمان شکێنیی بکەنە پیشە.

٨- لە جیاتی خۆبەکەمگریی، فیزو کەشخەو خۆ بەزلگریی بکەنە پیشە.

٩- لە جیاتی پاراستنی سامانی گشتی، ڕابواردن و لەوەڕان لەسەر حسابی خەڵك و خۆو خزم کردنە ملیاردلێر، بکەنە پیشە.

١٠- لە جیاتی ئامانج بەرزیی، تەنیا خۆ دیتن.

١١- لە جیاتی نەرم و نیانیی، توندو تیژیی.

١٢- لە جیاتی تێکەڵ بوونی خەڵك، خۆشاردنەوە لە خەڵك.

١٣- لە جیاتی فێرکردن و پەروەردەکردنیان، ئیهمالکردنیان، یاخود خراپە فێرکردنیان بکەنە پیشە.

تەماشای کەناڵە ڕاگەیاندنەکانی ئەو حیزبە حوکمڕانانە بکەن! بە پارەی ئەو خەڵکە، بە پارەی نەوت و واریداتی ئەم وڵاتە، ئەو هەموو کەناڵانە بەکاردێنن، هەمووشی بۆچی؟!

نە عیلم و سەقافەتیان تێدایە، نە ئەدەب و هونەریان تێدایە، نە ئیمان و ئەخلاق، نە سیاسەت و هۆشیارکردنەوە، نە ئەدەبی کۆمەڵایەتیی، بەڵکو هەمووی: خافڵان (لهو) و کات کوشتنە، جووڵاندنی غەریزەو، پەلکێشکردنی گەنجەکانمانە بەرەو لەدەستدانی کەسایەتیی و ڕووخانی مەعنەویی.

١٤- هەروەها لە جیاتی تەقدیرکردنی خەڵکی دڵسۆزو شایستە، خەڵاتکردنی کەسانی ماستاوچیی.

بەتایبەتی، کە دەبینین لەنێو ڕاگەیاندنکاراندا، زۆر کەس هەیە ئەسڵەن هیچ مەبدەئێکی نیە، ئەمڕۆ قسەیەك دەكا، دەزانێ ئەو دەسەڵاتدارە وای پێ چاكە، سبەینێ عەكسی ئەوە دەكا، دەزانێ ئەوجارە ئەوەیانی پێ چاکە، مانای وایە خۆی هیچ نیە، وەك دەهۆڵێك وایە چۆن دەنگی لێ بێنن، وا دەنگ دەداتەوە.

١٥- هەروەها لەجیاتی سزادانی خراپەكارو تێكدەران، پاداشتدانەوەو خەڵاتكردنیان.

١٦- ئنجا لە جیاتی ڕوونیی و ڕاشكاویی، لێڵیی و تەم و مژاویی بوون، لە هەموو شتێكدا.

١٧- پاشان لە جیاتی دادگەریی، ستەمكاریی كردن بە پیشە.

ئایا لە حاڵێكدا حوكمڕانان ئاوا بن، وڵات چی لێدێ؟ بە تەئكید ئەو حاڵەتە: (دارنرانی ڕەوشت لە سیاسەت) خراپترین دەرهاویشتەی دەبن و، بگرە كارەساتی ماڵوێرانكەری لێ دەكەونەوە.

لێرەدا پرسیارێك دەورووژێنم: زۆر گرنگە ئێمە ئەو پرسیارە لەخۆمان بکەین: بۆچی حیزب و ڕژێمە دیکتاتۆرەکان، ئەوانەی، کە بەزۆر خۆیان دەسەپێنن بەسەر خەڵکدا، ئەوانەی سیاسەتێکی ناشەرعیی دەکەن، بۆچی کار لەسەر ڕووخاندنی ڕەوشت دەکەن و، کار لەسەر نەهێشتنی ئەدەب و ڕەوشت و بەها بەرزەکان دەکەن؟!

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە «هەرچەندە لەتەوەری دووەمدا زۆر قسەمان لەوبارەوە کردوە و ڕامانگەیاندوە، کە حیزب و ڕژێمە بەزەبرو زۆر خۆسەپێن و دیکتاتۆرەکان، چونکە ئامانجی خراپ و ناشەرعییان هەن، پەناش دەبەنە بەر هۆکارو ئامرازی ناشەرعییش، وەك گوتراوە: (دز بازاڕی ئاڵۆزی دەوێ)و (ڕاوچی خراپ لەئاوی لێڵدا ڕاوێ دەکات)» بەڵام بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی مەبەست، لێرەش دوو کەسم بە نموونە هێناونەوە:



**١- نموونەی یەکەم:** یەکیان (**نیقۆڵا میکاڤیلی**)، کە لە ساڵی (١٦٦٩)ی زایینیدا لە دایك بووەو لە (١٧٢٧)دا مردووە، کتێبێکی هەیە بەناوی (ئەمیر)، زۆربەتان ڕەنگە کتێبەکەتان بینیبێ و، تەرجەمەی زمانی کوردیش کراوە، من لە لاپەڕە (١٣٧ تاکو ١٨٣) چەند قسەیەکیم لێ دەرهێناوە، ئنجا ئێوە تەماشا بکەن، ئەو چی دەڵێ و، تەماشای واقیعی سیاسیی خۆشمان بکەن، دەزانن: ڕێك میکاڤیلی چی گوتوە، زۆربەی ئەو سیاسەتمەدارانەش، بەهەمان شێوە، ڕەفتاریان کردوە:

١- دەڵێ: پێویستە بابای حوکمڕان و بەرپرس، لە جیاتی خاوەن بەڵێنیی و وەفا بە پەیمان، پەیمان شکێن بێ، ئەگەرنا سیاسەتی بۆ ناکرێ.

٢- پێویسته بابای سیاسیی، له جیاتی ئەوەی هەوڵبدا خۆشبویستریَ، لەلایەن خەڵکەوە، هەوڵبدا سامی لیَ بکریَ و خەڵك لێی بترسیَ.

٣- دەبیَ له جیاتی ئەوەی پەره به ڕەوشته بەرزەکان بدات، خۆیشی و خەڵکیش لەسەر درۆو دەلەسەو فرت و فێڵ بار بێنیَ.

٤- لەجیاتی ڕاستیی و ڕوونیی، دەبیَ نیفاق و دووڕوویی لێڵیی هەبیَ و، ئەگەر بەرپرسێك نیفاق و دووڕوویی نەبیَ، سەرکەوتوو نابیَ له کارەکەیدا.

٥- له جیاتی ڕەحم و بەزەیی، دەبیَ زۆر دڵڕەق و توندو تیژ بیَ.

٦- هەروەها ئامۆژگاریی حوکمڕان و بەرپرسی خۆسەپێن دەکات دەڵیَ: خەڵك بەبۆنەو جەژن و شانۆگەریی و شتی پێکەنیناویی و کۆمیدییەوە، زۆر سەرگەرم بکەو بەو شتانەوە، بیانخافڵێنه!

٧- هەروەها دەڵیَ: دوژمنایەتیی جۆراو جۆر دروست بکە، دوژمنایەتیی ئەو حیزبه لەگەڵ ئەو حیزبەو...هتد، ئەگەر شتی وەهمییش بیَ، بۆ ئەوەی سەرنجی خەڵك بخەیه سەر ئەوە، کە تۆ نەیارو دوژمنت هەیەو، پێیانەوە گرفتاری!

تەماشا بکەن! ئەمریکا دوای ئەوەی (یەکێتی سۆڤیەت) هەڵوەشا، هەر بەرپرسەکانی ئەمریکا، ئەوانەی، کە سیاسەت دادڕێژی ئەمریکان له ڕووی فیکرییەوە، گوتیان: ئەوە دوژمنی سوور له بەین چوو، ئنجا دەبیَ سەرنجمان بچێته سەر دوژمنی سەوز [عالەمی ئیسلامیی]، کە بۆ خۆتان دەزانن عالەمی ئیسلامیی چەند بیَ سەرو صاحێبه، بۆچی؟ چونکه دەبیَ دوژمنێك هەر هەبیَ، تاکو

خەڵکی خۆیانی پێ بترسێنن، بیانخافڵێنن و ئاگایان لەو گرفت و کێشانە نەمێنێ، کە پێویستییان بە چارەسەر هەیەو، سەرنجیان لەسەر دەرەوەی خۆیان بێ!

**٢- نموونەی دووەم:** ئەویش هەر یەکێکە لەو زانایانەی ڕۆژئاوا، بەناوی: (**ئیبتین دی لابواسییە**)، کە هەر بە (لابواسییە) ناسراوەو لە ساڵی (١٥٣٠)ی زایینیدا لە دایك بووەو، لە ساڵی (**١٥٦٢**) دا مردووەو، تەمەنی (**٣٢**) ساڵ بووە، کتێبێکی هەیە بەناوی: (کۆیلایەتیی ئازادانە) (العبودية المختارة)، کە بە عەرەبی تەرجەمە کراوەو دەربارەی: کاریگەریی خراپ وماڵوێرانکەرانەی: (دانرنرانی ڕەوشت و بەها بەرزەکان لە حوکم و سیاسەت) شتی زۆر جوانی هێناوە.

وێنەیەك دێنێتەوە، دەڵێ: کیسرای گەورە، دامەزرێنەری ئیمپراتۆریەتی فارس، شەش سەدە پێش زایین، کاتێك ئیمپراتۆریەتی فارس دادەمەزرێنێ، دەچێ وڵاتێك، بەناوی (لیدیا) لە مەمالیکی ئاسیای گچکە، ئەو وڵاتە دەگرێ، کە پایتەختەکەی شاری: (سارد)و پادشاکەشیان ناوی (کریسۆس) بووەو، بەدیلیی دەیبا بۆ وڵاتی فارس، بەڵام دوای ئەوەی کیسرا دەڕواتەوە، خەڵکەکە ڕادەپەڕن و ئاژاوە دەکەن، ئەویش وا دیارە پیاوێکی زۆر سیاسەتمەدار بووە، بەپێی مەزهەبی (میکاڤیلی) ڕاوێژ دەکات چییان لێ بکا؟ دەڵێن: ئەگەر تۆ ئێستا لێرەوە سوپایەك ببەی و لەدژیان بجەنگی، ئەوە زۆری دەوێ و، لە شوێنی دیکەوەش کێشەی زۆرمان هەن، ئیدی ڕایان دێتە سەر ئەوە دەڵێن: شوێنی داوێن پیسییان بۆ بکەوە، شوێنی شەڕاب خۆرییان بۆ بکەوە، شوێنی کۆمیدیی و شانۆگەریی

و ...هتد، بۆ ئەوەی ئەو خەڵکە سەرگەرم بن، بەو شتانەوەو، کە سەر گەرم بوون و خافڵان و، لەژیانی جیدیی دوور دەکەوتنەوە، ئەو کاتە نایانپەرژێتە سەر ئەوەی بزانن پادشایان بەدیل گیراوەو، وڵاتیان بۆتە موستەعمەرە! سەرەنجام ئەو نەخشەیە پیادە دەکەن و، وشەی (لۆدیی)، کە لە کوردەواریی خۆماندا دەڵێن: (لۆتیی)، پێشتر وام دەزانی: (لۆتیی) هەر لە وشەی (لوطي)ەوە هاتوە! بەڵام لاتینییەکان وشەی (لۆدیی)یان، کە بەکار هێناوە، بۆ یاریی و سوعبەت و خافڵان و قسەو جەفەنگ و لەهو و ...هتد، ئەسڵی خۆی لە (لیدیی)ەوە هاتوەو، وڵاتی (لیدیا) ئەوەندە مەشهوور بووە بە: خافڵان (لهو) و شانۆگەریی و مەیخۆریی و...هتدەوە، لەوانەوەو لەناوی شارەکەیانەوە: (لۆدیی) یان (لیدیی) بۆتە زاراوەیەك بۆ هەر جۆرە خافڵانێك و سەرگەرمییەك، کە هیچ نێوەڕۆکێکی نەبێ.

هەروەها (لابواسییە) قسەیەکی دیکە دەکات، زۆر سەرنجی ڕاکێشام، دەڵێ:

ئەو خەڵکە، کە لەو حوکمڕانە خۆسەپێنانە کۆدەبنەوەو، بە دەوری ئەو طاغووت و دیکتاتۆرانەوە دەئاڵێن، بریسکەی زێڕو زیوەکانیان، بریسکەی تاج و نەجمەکانیان، سەرسامیان دەکات و، لێیان نزیك دەبنەوە، بەڵکو شتێکیان پێ ببڕێ، بەڵام، لەو حاڵەتەدا، وەك ئەو پەپوولەو مێش و مەگەزە دێنە بەرچاو، کە ئاگر لە دوورەوە دەبینێ و، بۆ ئاگرەکە دەچێ، بۆ ئەوەی ئیستیفادە لە ڕوناکییەکەی بکات، بەڵام دوایی بە گەرمی و تینەکەی دەسووتێ! هەموو ئەو خەڵك و میللەتانەش، کە لە دەوری ئەو طاغووتانە دەئاڵێن، بە ئاگری ئەوانەوە دەسووتێن[1].

---

(١) بڕوانە: (كيف تفقد الشعوبُ المناعة ضدَّ الإستبداد؟) نووسینی:

منیش دەڵێم: قسەکەی زۆر ڕاستەو هەروابووەو هەرواشە، بۆ نموونە: کاتی خۆی صەددامی دیکتاتۆری خۆسەپێن، چی بەو خەڵکە کرد، کە لەدەوری بوون! هیتلەر چی بە ئەڵمانیا کرد! ستالین چی لە (یەکیەتی سۆڤییەت) کرد! هەموو ئەو طاغووتانە تەماشا بکەن، بەدرێژایی مێژوو، هەموو ئەوانەی، کە دەبن بەسەرباز بۆ ئەوانەو لەدەوریان دەئاڵێن، هەم لە ڕووی دنیاییەوە بە ئاگری وانەوە دەسووتێن، هەم لە ڕووی قیامەتییشەوە، بە ئاگری وانەوە دەسووتێن، بۆیەش خوای میهرەبان پێمان دەفەرموێ:

﴿ وَلَا تَرۡكَنُوٓاْ إِلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ فَتَمَسَّكُمُ ٱلنَّارُ ...﴿١١٣﴾ ﴾ هود.

واتە: پشت بەستەمکارانەوە مەدەن، ئاگرتان تووش دەبێ!





---

أ- هشام علي حافظ

ب- جودت سعيد

ج- خالص جلبي

[العبودية المختارة] ص ٥٣-٨٩.

## نموونەیەکی زەقی لێك دابڕانی ڕەوشت و سیاسەت

بەپێویستی دەزانم کۆتایی ئەم تەوەرە: (دابڕانی ڕەوشت و بەها بەرزەکان لەسیاسەت، دەرهاویشتەی زۆر خراپ، بگرە کارەساتباری دەبن)، بەنموونەیەکی زەقی گەرم و تازەی ئەم ڕۆژگارە بێنین، کە بریتیە لە: کوژرانی ڕۆژنامەنووس (جمال خاشقجي) هاووڵاتیی وڵاتی شانشینی عەرەبستان (المملكة العربية) لە کونسوڵخانەی سعوودییەدا، لەشاری (ئەستەنبۆڵ) لەڕۆژی: ( ٢٠١٨/١٠/٢)ز دا.

هەڵبەتە ئەو ڕووداوە ستەمێکی قێزەونی بێ پاساو بوو، بەدانپێداهێنانی حوکمڕانانی سعوودیە خۆشیان، دەرهاویشتەی زۆرو جۆراو جۆری بەدوای خۆیدا هێنان و ئێستاش بەردەوامن، پێموایە شانشینی عەرەبستان وا بەئاسانیی لێی دەرباز نابێ و، باجی گەورەی داوە لەسومعەو ئیعتیباری و، پێموایە باجی گەورەتریشی بەدواوەیە: باجی مەعنەویی و سیاسیی و ئابووریی و ...هتد.

بەڵام ئەوەی جێی مەبەستم بوو لێرەداو، پەیوەست بوو بە بابەتەکەمانەوە، بریتیە لە هەڵوێستی ئەمریکای هاوپەیمانی عەرەبستان بەگشتیی و، هەڵوێستی (دۆناڵد ترامپ) سەرۆکی ئەمەریکا، بەتایبەت:

کە پوختەی هەڵوێستەکەی (ترامپ) تاکو ئەم تاو (لحظة)ە، کە ئەم دێڕانەی تێدا دەنووسم: (شەوی ٢٢/٢٣-١١-٢٠١٨ز) بەرانبەر: (١٥/ربيع الأول/١٤٤٠ك)، هەر ئەوەیە کە دوێنێ شەو: (٢١/٢٢-١١-٢٠١٨ز) لەکۆنگرەیەکی ڕۆژنامەوانییدا «کەناڵی (الجزيرة) و

کەناڵی دیکەش گواستیانەوە» ڕایگەیاند: لەسۆنگەی ئەوەوە، کە ساڵانە چەندان ملیار دۆلار لە عەرەبستان بەهرەمەند دەبن، ناتوانن لەسەر کێشەی بەناهەق کوژرانی ڕۆژنامەنووس (جمال خاشقجي) بەینی خۆیان لەگەڵ سعوودیە تێك بدەن!

ئنجا ئەگەر وەزعەکە ئاوا بڕوا، کە (ترامپ) بەتەمایە، وا دیارە ئەمەریکا لەنێوان مەبدەئەکانی و بەرژەوەندییەکانیدا، بەرژەوەندییەکانی هەڵدەبژێرێ هەرچەندە - وەك شیکەرەوە (محلِّل) ێکی سیاسیی گوتی: - بەرژەوەندیی و ملیار دۆلارەکان، خوێنی (خاشقجي)یشیان لێ بتکێ!!

ئنجا لێرەشدا ڕاستیی ئەو قسەیەمانمان لەلابەرجەستە دەبێ، کە گوتوومانە: (داڕنرانی ڕەوشت و بەها بەرزەکان لەسیاسەت، دەرهاویشتەی زۆر خراپ، بگرە کارەساتباری دەبن)، ڕاستیشیان گوتوە: (عند الإمتحان: يكرمُ المرءُ أو يهان) لەکاتی تاقیکردنەوەدا: مرۆڤ ڕێزدار، یان ڕیسوا دەبێ!!

براو خوشکەکانم!

دەپرسین: ئایا چۆن دەتوانین سیاسەتێکی ڕەوشتبەرزانە بکەین؟ کە پێم وایە ئێمەی (کۆمەڵی ئیسلامیی)، تا ڕاددەیەکی زۆر توانیومانە وا بکەین، بەڵام چۆن دەتوانین ئەوە زیاتر تۆخ بکەینەوە؟

پێموایە بناغەو هۆکاری ڕەوشت بەرزیی لە سیاسەتکردندا، لەچوار خاڵاندا خولاسە دەبێتەوە:

## ١) بوونناسییەکی ڕاست و دروست:

ئێستا لەنێو خەڵکدا زیاتر دەڵێن: (جیهانبینیی) و (دنیا بینیی)، بەڵام من ئەو وشەیەم پێ هەڵەیە، (جیهان)، یان (دنیا) تەنیا ئەوە دەگرێتەوە، کە ئێستا دەیبینی، بەڵام (بوونناسیی)، بوون (وجود) بینراو و نەبینراوی، دنیاو قیامەتی، بەدیهێنەر (خالق) و بەدیهێنراو (مخلوق)ی، هەمووی دەگرێتەوە، بۆیە پێم وایە: ئەو وشەیە دەبێ (بوونناسیی) بەکاربهێندرێ ڕاستترە، وەك واتای وشەی: (معرفة الوجود ontology ئۆنتۆلۆژیی)[1].

بەڵێ، (بوونناسیی ئیسلامیی)، کە تاکە بوونناسیی ڕاست و دروستە، سەرچاوەی هەڵقوڵینی هەموو شتەکانی مرۆڤی مسوڵمانە: ئیمان و عەقیدەی، عیبادەتی، ڕەوشت و ئاکار و...هتدی دەگەڕێنەوە

---

(١) لەکتێبی چوارەمی مەوسووعەی: (بیرکردنەوەی ئیسلامیی لەنێوان وەحیی و واقیعدا)دا، (پایەکانی بیرکردنەوەی ئیسلامیی) بەدرێژیی باسی ئەو بابەتەمان کردوە.

بۆ بوونناسییەکەی: ئایا چۆن خۆت دەبینی؟ ئەگەر وا خۆت دەبینی، کە جێنشینی خوای، ئەگەر وا خۆت دەبینی دروستکراوی خوای، ئەگەر وا خۆت دەبینی، خوا تۆی لەم سەر زەوییەدا داناوە، تاکو تاقیت بکاتەوە.

هەروەها ئەگەر وا ژیانی دنیا دەبینی، کە قۆناغێکە لە قۆناغەکان و، قۆناغی دیکەی بەدوادا دێ، ئەوکاتە دەزانی چۆن دەژی! بەڵێ، بەڕاستیی هەر جۆری بوونناسیی مرۆڤی مسوڵمانە، کە ئیمان و عەقیدەکەشی دیاریی دەکا، ئایا کێ بڕوا بەخوا دێنێ؟

بێگومان ئەو کەسەی، کە خوا دەناسێ، پێشێ مرۆڤ دەبێ خوا بناسێ و، بزانێ: خۆیی و دەوروبەری و گەردوون، چۆن دروست بوون؟ ئنجا لەسەر بناغەی دەرککردنی ئەو ڕاستییە کە: دروستکراوەکان هەموویان پێویستییان بە بەدیهێنەرێك و، بە خاوەنێك هەیە، ئنجا دوای ئەوە ئیمان بەخواو بە پایەکانی دیکەی ئیمان دێنێ.

## ٢) ئیمان و عەقیدەی ڕاست و ساغ:

واتە: ئیمان بە خوا، بە فریشتەکانی خوا، بە کتێبەکانی، بە پێغەمبەرانی (علیهم الصلاة والسلام)، بە ڕۆژی دوایی، بە قەدەرو، بە هەموو ئەو شتانەی دیکە کە پێویستە ئیمانیان پێ بهێندرێ.

بێگومان ئیمان سەرچاوەی تێکڕای خەسڵەت و ئاکارە پەسندەکان (فضائل)ە، تاکو مرۆڤی مسوڵمان ئیمان و عەقیدەی ڕاستترو ڕۆچووتربێ، ڕەوشتی بەرزتر دەبێ.

## ٣) خواپەرستیی و پارێزکاریی:

بێگومان وەك چۆن ئیمان و عەقیدەی ڕاست و ساغ، هەڵقوڵاوی بووناسییەکی ڕاست و دامەزراوە، بەهەمان شێوەش: بە ئەندازەی چەسپاویی ئیمان، مرۆڤی مسوڵمان و خەڵك و کۆمەڵگای مسوڵمانیش بەگشتیی و، کەسانی سیاسیی و مشوور خۆریش بەتایبەت، خوا پەرستیی و دینداریی و بۆ خوا سوڵحان و پارێزکارییان، باشتر دەبێ، چونکە گۆزە چی تێدابێ، هەر ئەوەشی لێ دەڕژێ.

ئنجا بەدڵنیاییش، خوا پەرستیی و پارێزکاریی (العبادة والتقوى) کە بەرهەمی ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیین، دەبنە هەوێن و هەناو و کاکڵ و جەوهەری، سەرجەم بیروڕاو هەڵس و کەوتەکانی تاك و کۆمەڵ، وەك ئایەتەکانی کۆتایی سووڕەتی (الفرقان) بە دروەشاوەیی ئەوەی گوتمان پێشانی دەدەن، چونکە خوای زاناو شارەزا، بەندە هەڵبژاردەکانی خۆی بەناو و نیشانی: (عبادالرحمن) دەناسێنێ و، دواتر پاش ئەوەی بە شازدە (١٦) خەسڵەتی بەرزو پەسند پێناسەیان دەکات، لەکۆتا خەسڵەتیاندا «کە شازدەیەمینە» ئەو پاڕانەوەیە یان لێ دەگێڕێتەوە کە دەڵێن: (... واجعلنا للمتقين إماماً) بمانگێڕە بە پێشەوای پارێزکاران، کەواتە: تەنیا کەسانێك شایستەیی پێگەی پێشەوایەتیی مسوڵمانانی پارێزکاریان هەیە، کە خاوەنی کۆی ئەو خەسڵەت و ئاکارە بەرزو پەسندانەبن، ئەوەش دەقی ئەو چواردە (١٤) ئایەتە موبارەکەی (الفرقان):

﴿ وَعِبَادُ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى ٱلْأَرْضِ هَوْنًا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلْجَٰهِلُونَ قَالُوا۟ سَلَٰمًا ﴿٦٣﴾ وَٱلَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمْ سُجَّدًا

وَقِيَـٰمًا ﴿٦٤﴾ وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱصْرِفْ عَنَّا عَذَابَ جَهَنَّمَ ۖ إِنَّ
عَذَابَهَا كَانَ غَرَامًا ﴿٦٥﴾ إِنَّهَا سَآءَتْ مُسْتَقَرًّا وَمُقَامًا ﴿٦٦﴾ وَٱلَّذِينَ
إِذَآ أَنفَقُوا۟ لَمْ يُسْرِفُوا۟ وَلَمْ يَقْتُرُوا۟ وَكَانَ بَيْنَ ذَٰلِكَ قَوَامًا ﴿٦٧﴾
وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَـٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ
ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ يَلْقَ أَثَامًا ﴿٦٨﴾ يُضَـٰعَفْ
لَهُ ٱلْعَذَابُ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِۦ مُهَانًا ﴿٦٩﴾ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ
وَعَمِلَ عَمَلًا صَـٰلِحًا فَأُو۟لَـٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ حَسَنَـٰتٍ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ
غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٧٠﴾ وَمَن تَابَ وَعَمِلَ صَـٰلِحًا فَإِنَّهُۥ يَتُوبُ إِلَى ٱللَّهِ مَتَابًا
﴿٧١﴾ وَٱلَّذِينَ لَا يَشْهَدُونَ ٱلزُّورَ وَإِذَا مَرُّوا۟ بِٱللَّغْوِ مَرُّوا۟ كِرَامًا ﴿٧٢﴾
وَٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُوا۟ بِـَٔايَـٰتِ رَبِّهِمْ لَمْ يَخِرُّوا۟ عَلَيْهَا صُمًّا وَعُمْيَانًا ﴿٧٣﴾
وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَٰجِنَا وَذُرِّيَّـٰتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ
وَٱجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا ﴿٧٤﴾ أُو۟لَـٰٓئِكَ يُجْزَوْنَ ٱلْغُرْفَةَ بِمَا
صَبَرُوا۟ وَيُلَقَّوْنَ فِيهَا تَحِيَّةً وَسَلَـٰمًا ﴿٧٥﴾ خَـٰلِدِينَ فِيهَا ۚ حَسُنَتْ
مُسْتَقَرًّا وَمُقَامًا ﴿٧٦﴾ الفرقان.



## ٤) دڵسۆزیی و خۆشەویستی بۆ خەڵک:

هیچ گومانی تێدانیە، کە ئەم پایەی چوارەمە، بەرهەمی پایەکانی پێش خۆیەتی، بەڵێ بەڕێزان! دوای هەبوونی:

١) بووناسییەکی ڕاست و دروست و،

٢) ئیمان و عەقیدەیەکی ساغ و،

٣) خواپەرستیی و پارێزکارییەکی باش و،

٤) دڵسۆزیی و خۆشەویستییەکی چاك بۆ خەڵك،

ئەوجار دەتوانین لە سیاسەتکردندا ڕەوشتێکی بەرزمان هەبێ، ئەگەرنا، تۆ دنیا بە تاکە دەرفەتێك بزانی، کە زیاتر تێیدا ڕابوێری و، لەززەت وەربگری، یان تێیدا دەوڵەمەند بی، خۆت و خزم و حیزبت، ئەو کاتە ئەو بیرکردنەوەیەت وات لێدەکا، کە بەو شێوەیە ڕەفتار بکەی، کە گوێ نەدەی بە ئەخلاق و ڕەوشت و ئاکاری بەرزو پەسند!

## پوختەی مەبەست و دەرەنجام

ئنجا با بێینە سەر دەرەنجام و کۆتایی هەموو بابەتەکە:

براو خوشکانی بەڕێز! ئێمە وەك (تەوژمی ئیسلامیی) ستایشی خوای پەروەردگار دەکەین، کە ئێمەی خستۆتە سەر ڕاستە شەقامی خۆی و ئومێدم وایە هیدایەتی دابین، کە سیاسەتکردنەکەشمان بەشێوەیەکی شەرعییانەو ڕێك و پێك بووبێ، تاکە ڕاددەیەکی باش، بەڵام ئەوە مانای وانیە، کە پێویستییمان بەچاوبەخۆدا گێڕانەوەو، ڕەخنە لەخۆگرتن و خۆپشکنین نیە، بێگومان بەردەوام، دەبێ خۆمان بپشکنین و، ئاگامان لەخۆمان بێ.



ئنجا کۆتایی هەموو بابەتەکە، بەم حەوت خاڵە دێنم، وەك دەرەنجامی کۆتایی:

١) ڕەوشت بەرزیی، لە هەموو ڕوویەکەوەو بەهەموو جۆرەکانیەوە، مایەی سەربەرزیی و بەختەوەریی دنیاو دوارۆژە، تەماشا بکەن! خوا (سبحانه وتعالى) کە مەدحی پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم)، دەکات، کە پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) لە هەموو ڕوویەکەوە لە لووتکەدا بووە، بەڵام پێی دەفەرموێ:

﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴿٤﴾ ﴾ القلم.

واتە: بەدڵنیایی تۆ ڕەوشتێکی مەزنت هەیە.

بۆیەش پیتی [لەسەر] (عَلَى)ی بۆ بەکارهێنراوە، یانی: تۆ ڕەوشت و ئاکاری مەزنت خستۆتە ژێر ڕکێفی خۆتەوەو، ڕەوشتی پەسندو جوان بۆتۆ، وەك وڵاخێکی دەستەمۆو ڕامکراوە.

زۆر کەس دەتوانێ سیاسیی بێ، سیاسیی بەو مانایەی، کە ئێستا باوە، زۆر کەس دەتوانێ ئەهلی علیم بێ، دەتوانێ چی بێ و چی بێ، بەڵام مەگەر کەسێ دڵەکەی بەخواوە پەیوەست بێ، ئەگەرنا ناتوانێ لە هەموو حاڵێکدا، ڕەوشتێکی بەرزو مەزنی هەبێ، بۆیە خوای بەرزو مەزن، پێغەمبەری خۆی بە شتێك مەدح دەکا، کە مەگەر هەر ئەو پێغەمبەرە مەزنە (صلى الله عليه وسلم) و کەسێك، کە بەرێی ئەودا دەڕوا، ئەوەی بۆ مەیسەربێ.

325 ٢) ڕەوشت بەرزیی و ئاکار پەسەندیی لە بواری سیاسەتدا، وەك هەموو بوارەکانی دیکە، فەرزەو، بەشێکە لە دینداریی و مسوڵمانەتیی، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ وَمَنْ أَحْسَنُ دِينًا مِّمَّنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ ﴾ النساء: ١٢٥.

واتە: دینداریی کێ لە هی کەسێك چاکترە، کە ڕووی خۆی تەسلیمی خوا کردوە (بۆ خوا ساغ بۆتەوە)و چاکەکاریشە! {یانی: بۆ خوا دڵسۆزەو، لەگەڵ خەڵکدا چاکەکارە}.

هەروەها خوای پاك و تاك فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْ وَّٱلَّذِينَ هُم مُّحْسِنُونَ ﴿١٢٨﴾ ﴾ النحل.

واتە: بێگومان خوا لەگەڵ ئەوانەدایە، کە پارێزکارن و، ئەوانەی کە چاکەکارن.

٣) ڕەوشت بەرزیی سیاسیی، مرۆڤ لە عەیبداریی لای خەڵك و، گوناهباریی لای خوا دەپارێزێ، ئینسان کە درۆی نەکردو، وەعدە خیلاف نەبوو و، شتی ژێر بەژێری نەبوو و، موخەننەت نەبوو و، بۆ هەموو لایەك دڵسۆز بوو، ڕاست و ڕوون بوو، ڕاشکاو بوو، ئەوکاتە: هیچ کەسێك ناتوانێ ڕەخنەیەکی شەرعیی بێنێتەوە سەرێ، واتە: کە لە شەرع لایدابێ.

بەڵێ بەڕێزان! بەخوا هەر کەسێك لە شەرع لانەدات، نە گوناهباری لای خوا دەبێ و، نە عەیبداری لای خەڵکیش.

٤) بەهۆی ڕەوشت بەرزییەوە، خەڵك و وڵات لەو بەڵاو نەهامەتییانە دەپارێزرێ، کە دەرهاویشتەی ڕەوشت نزمیی و خراپەکارییین، بەتایبەت هی حوکمڕانان و سیاسەتمەداران، چونکە کەسێك، کە لە ماڵی خۆیدا خراپەیەك دەکاو ڕەوشتێکی خراپی هەیە، زیاتر زەرەر لە خۆیی و ماڵ و منداڵەکەی دەدا، بەڵام کاتێك سیاسییەك حوکمڕانێك غەڵەتێکی سیاسیی دەکا، ڕەوشتێکی خراپی سیاسیی دەبێ، زەرەر لە خۆی و خەڵکی وڵاتەکەی دەدا، بەگشتیی.

٥) مرۆڤی ئاکار پەسەند و ڕەوشت و بەرز، هەمیشە دڵئاسوودەیەو بێ باکە، ئەوەی پەرێزی پاکە، بێ باکەو دڵی مورتاحە، چونکە: درۆی لەگەڵ کەسدا نەکردوە، فێڵی لە کەس نەکردوە، خیانەتی بەکەس نەکردوە، بوغزی بەرامبەر بە کەس نیە، بەڵێ، ڕقی لە زوڵمە، ڕقی لە لادانە، ڕقی لە خراپەیە، بەڵام دڵسۆزە بۆ مرۆڤەکان.

زۆر کەس ڕەنگە ئەو دووانەی بۆ لێك جیا نەکرێنەوە:

ئێمە دەگونجێ ڕقمان لە زوڵم و فەسادو خراپەو،ماڵی گشتی بەهەددەردان و، قۆرخکاریی بێ، بەڵام بەزەییمان بە مرۆڤەکان دا بێ و بۆیان دڵسۆز بین، چونکە خوای پەروەردگار مرۆڤەکانی بۆیە دروستکردوون، کە بەختەوەربن، بەڵام کە بەهۆی خراپەوە خۆیان بەدبەخت دەکەن، دەبێ ڕقت لە خراپەکەیان بێ، بەڵام وەك مرۆڤ پەرۆشیانت بێ و، بەزەییت پێیاندا بێ و، بۆیان دڵسۆز بی.

٦) تەنیا بەهۆی سیاسەتکردنی ڕەوشت بەرزانەوە، ئامانج و مەبەستە پەسندو بەرزەکان، بە باشترین شێوەیە دەستەبەر دەبن.

٧) ڕەوشتبەرزیی سیاسیی، مایەی ڕەزامەندیی خواو، پاداشتی نەبڕاوەی خوایە.



ئەم ئایەتە موبارەکەش دەکەمە میسکی خیتامی هەموو بابەتەکە:

﴿ تِلْكَ ٱلدَّارُ ٱلْـَٔاخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فَسَادًا ۚ وَٱلْعَـٰقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴿٨٣﴾ ﴾ القصص.

واتە: ئەم مەنزڵگای دوا ڕۆژە، تایبەتی دەکەین بە کەسانێکەوە، کە نایانەوێ بەرزیی و خۆهەڵکێشان لە زەویدا، بکەنە پیشەیان و، ناشیانەوێ خراپەکاریی بکەن، (بەڵکو دەیانەوێ: خوای پەروەردگار لە خۆیان ڕازی بکەن)، سەرەنجامیش بۆ پارێزکارانە.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی، ئێمە لە پارێزکاران بگێڕێ و، لەو کەسانەمان بگێڕێ، کە لە سیاسەتکردندا خۆیان بە ڕەوشتە بەرزەکان دەڕازێننەوە، تاکو ئەو حەوت بەرهەمەی خستماننەڕوو دەستەبەریان بکەین.

## نێوەڕۆک

# چوار بابەتی سیاسی گرنگ و هەستیار لە بەر تیشکی وەحی و عەقل دا

ئـەم کتێبـەی بەردەسـتتان، چـوار بابەتـی سیاسـیی گرنـگ و هەسـتیاری تێـدا توێژراونـەوە، کـە هـەر کامێکیـان دەکەینـە بەشـێکی سـەربەخۆ، بـەم ناوونیشانانە:

1- هاوپەیمانێتیی.

2- بەشداریکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا.

3- بەشداریکردن لە حکوومەتدا.

4- گرنگیی ڕەوشت لە سیاسەتدا.

ئاشـکراشـە کـە هـەرکام لـەو چـوار بابەتـە سیاسـییە – هەرکامیان بەرێژەیەکـی تایبـەت- ڕاجیایـی و مشـت و مڕیـان لەسـەر هەیـە، بەتایبـەت دووەم و سـێیەمیان کـە دوو بابەتـی هاوچەرخـن و، پێشـتر بـەو شـێوە و فۆڕمەی ئێستامان بوونیان نەبووە.

پێشـموایە لەبـارەی هەرچـوار مەسـەلەکەوە، دوای هەڵسـەنگاندنێکی ورد و قـووڵ، هەڵوێسـتی بەڵگـەدارو ڕاسـتو پـڕ بەپێسـتمان خسـتۆتەڕوو، کـە بایـی قەناعـەت پێهێنـان و بەرچـاو ڕوونکردنـەوەی کەسـانێك دەکـەن، کەلەوبـارەوە لێـڕەو لـەوێ شـەڕە قسـە (جـدال) دەکـەن، مەگـەر کەسـێك قەناعـەت هێنانـی پێـش بیرکردنـەوەو، دەمارگیریـی (تعصب) دەسـتو پێی بەستن و ڕێی لێگرتبن!



www.alibapir.net

/alibapir1

/alibapir





**نوسینگەی تەفسیر**

بۆ بڵاوکردنەوە

هەولێر - شەقامی ٣٠مەتری تەنیشت منارەی چۆلی

/TafseerOffice

+964 750 818 08 66

www.al-tafseer.com

tafseeroffice@yahoo.com